گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە،
کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات

# مێژوو ٧





ژماره 28
ساڵی حەوتەم
پایزی 2013

# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات




ژمارە ( ٢٨ ) | ساڵی حەوتەم | پایزی ٢٠١٢









- گۆڤار : مـێژوو
- ژمارە : (٢٨)
- تیراژ : (٥٠٠) دانە
- چاپخانە : رۆژهەڵات

كوردستان / هەولێر - كۆڵانى پشت سەرۆكایەتى زانكۆى سەلاحەددین



g.mezhu@yahoo.com
g.mezhu@hotmail.com

# پێرست

## ◂ سەروتار



## ◂ توێژینەوە



## ◂ القسم العربي

## کەشکۆڵی گۆڤار

# شێخ عبدالسلام بارزانی یەکەم چاکسازی خوازی کورد لە سەدەی بیستەم

## سەروتار

یەکێك لەو سەرکردە کوردانەی لە سەرەتای سەدەی بیستەم، مێژووی کوردی هاوچەرج بەدیارکەوت شێخ عبدالسلام بارزانی دووەم بوو. دەتوانین بڵێین یەکەم چاکسازی کورد بوو لە سەدەی بیستەم، لە سەرەتادا دەستی بە چاکسازی کرد لە ناوچەی بارزان لە عەدالەتی کۆمەلایەتی و رێزگرتن لە مافی ئافرەت کە لە سەرچاوەکان باسی لێوەکراوە ئێمە لەم وتارە کورتەدا بە پێویستی نازانین هەموو خاڵەکان بنووسینەوە چونکە لە زۆربەی سەرچاوەکانی مێژووی کورد هەن. لەم ڕووەوەش سەرکەوتوو بوو کەسێکی بەهێزو خۆشەویست بوو لە ناوچەکەیدا.

بەلام لەبەر ئەوەی کوردستان بەشی گەورەی لەو کات لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانی دابوو ناوچەی بارزانیش لەو ناوچانە بوو بۆیە شێخ عبدالسلام داوای چاکسازی لە دەوڵەتی عوسمانیش کرد بەتایبەتی لە ڕووی ڕێگادان بە بەکارهێنانی زمانی کوردی و بابەتی کۆکردنەوەی باج و چەند خاڵێکی تر بەلام دەوڵەتی عوسمانی ئەم داواکاریانەی زۆر بە مەترسیدار زانی و بە توندی ڕووبەڕووی بوونەوەو چەندین هەڵمەتی سەربازیان کردە سەر شێخ عبدالسلام. شایانی باسە دەوڵەتی عوسمانی ماوەیەکی پێشتر هەستی بە لاوازی و گەندەڵ بوونی خۆی کردبوو بۆیە سیاسەتی ڕێکخستنی چاکسازی ڕاگەیاندبوو، بەلام بە

شێوەیەکی گشتی ئەم سیاسەتەی دەوڵەتی عوسمانی سەرکەوتوو نەبوو تەنانەت بە گوێرەی هەندێك بیروڕا بووە هۆی کورت کردنەوەی تەمەنی دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە جێگای سەرنجە کە دەوڵەتێك بە قەبارەو قورسایی دەوڵەتی عوسمانی لە سیاسەتی چاکسازی سەرکەوتوو نەبێت، بەڵام لە کوردستان کەسایەتیەکی وەکو شێخ عبدالسلام هەوڵەکانی لەم ڕووەوە لە ناوچەیەکی کوردستان سەرکەوتووبن، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە دەوڵەتی عوسمانی هەبوو لە ئەنجامدا شێخ عبدالسلام بارزانیان دەستگیرکردو لە سێدارەیانداو بەمەش دەتوانین شێخ عبدالسلام بارزانی بە یەکەم چاکسازو چاکسازی خوازو شەهیدی چاکسازی لە مێژووی کوردی هاوچەرخ بناسێنین، بەڕاستی جێگای سەرنجە کەسێك لە سەرەتای سەدەی بیست پرسی نەتەوەیی و پرسی چاکسازی بە یەکترەوە بەستبووەوە.

بۆیە پێویستە ئەم لایەنە ئەرێنییە لە مێژووی کورد زەق بکرێتەوە کە لاپەڕەیەکی پرشنگداری مێژووی نەتەوەکەمانە وردبوونەوەو نووسین و توێژینەوەی چڕوپڕ دەربارەی ئەم بابەتە بنووسرێت.

# جولانەوەکانی سەردەمی أبوجعفری منصور

ئامادەکردنی: بژار عثمان أحمد

## دەروازە

جولانەوەکانی سەردەمی أبوجعفری منصور کۆمەڵێك جولانەوەی جیاجیا لە کات و شوێنی جیاوازبون، بەلام بەشێکی زۆریان یەك ئامانج و مەبەستیان هەبوو، ئەویش لاوازکردن و لادانی خەلیفە و خەلافەتی عەباسی لەسەر حوکم و گەڕاندنەوەی دەسەلات و شکۆی فارسی و ئاینی زەردەشتی.

ئەگەرچی فارسەکان هەر لە سەرەتاوە ئەو نیازەیان هەبوو، بەلام کەم تا زۆر ئەو دەرفەتەیان وەکو پێویست بۆ رێك نەکەوتوە لە سەردەمانی پێشوودا (سەردەمی ڕاشدی و ئومەوی) بەلام لە سەردەمی عەباسیەکان و لە سەرەتای هاتنە سەر حوکمیان وە بەتایبەتی لە دوای کوژرانی ئەبو موسلیمی خۆراسانی بە فەرمانی أبوجعفری منصور، ئەوا کاردانەوەی لێکەوتەوەو سەرئەنجام بو بە دەرفەتێکی باش بۆ نەیارانی خەلافەتی عەباسی تاکو لە ژێر دروشم و ناوی تۆلەکردنەوەی خوێنی أبومسلیم دەربچن، بەلام لە ڕاستیدا ئەوە ئامانجی یەکەمیان نەبوو، بەلکو دژایەتیکردنی خەلافەت و گەڕانەوەی دەسەلاتێکی فارسی ئامانجی یەکەمیان بوو.

سەرەڕای ئەمانەش لە ناو عەرەبەکانیش دا بەتایبەتی عەلەوییەکان، هەر لە دوای ئەوەی کە زانیان خەلافەت بۆ ئەوان نابێت و تا کۆتایی بۆ عەباسیەکان دەبێت، ئەوا هەر لە سەرەتاوە کەوتنە دژایەتیکردنی خەلافەت و چەندین جولانەوە لە دژی خەلافەتی عەباسی ڕوویدا و تەنانەت لە هەندێك کات دا خەلافەتیشیان ڕاگەیاندووە.

ئەم بابەتـەی ئێمـەش ڕاپۆرتێـك بـوو لـە قۆنـاغی سـێیەمی خوێنـدنم بـوو لـە کۆلیژی ئەدەبیات کە ئەم بابەتـەم وەکـو ڕاپۆرتێـك بـۆ وانـەی مێـژووی عەباسـی ئامادەکردو هیوادارم سوودی هەبێت بۆ خوێنەران.

## تەوەرەی یەکەم

**باسی یەکەم/ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی فارسیەکان لە سەردەمی یەکەمی عەباسی:**

سەرهەڵدانی ئەم بزووتنەوانە دەگەڕێتەوە بۆ زیندوومانەوەی فکرەی فارسـی کۆن هەروەکو مەقریزی دەڵێت: (بێگومان هۆکاری دەرچـوونی زۆربـەی گەلـەکان لـە دیانــەتی ئیــسلامدا فارســەکان بــوون کــە خــاوەنی دەســەڵاتێکی بــەرزو سەرکردایەتی زۆربـەی گەلـەکان بـوون لـە کاتێـك دا تاقیکرانـەوە بـە نـەمانی بـە دەستی عەرەبەکان، کە فارسەکان عـەرەبیان بـە گـەلێکی کـەم و سـوك دەهاتـە بەرچاو کە کێشەکە گەورە بوو کێشەکەیان چـەند بـارەبووەوە لـەوەوە دژایـەتی ئیسلامیان کرد، بەدیاردەکەوێ لەم نووسینەوەی سەرەوە هـەوەس و ئـارەزووی دوژمنایەتی فارسەکان بەرامبەر عەرەبـەکان سـەرەتاکەی دەگەڕایـەوە بـۆ پـێش ئیسلام. لەبەر ئەوەبوو بەشـێك لـە فارسـەکان سـەیری بزوتنـەوەی ئـازادیخوازی عەرەبی ئیسلامی نەدەکرد بـەوەی کـەوا بزوتنەوەیـەکی خـاوەن بنـەمای نـوێ و هەڵگری پەیامی خودایەو خاوەن بەرنامەی ئیسلامە[١].

زۆربەی ئەم بزوتنەوانە کە سەریان هەڵدا لەبەر ئەوەبوو کـە دوای ئـەوەی ابـو مسلم کوژرا داوای خوێنی ئەویان دەکرد ئەمەش لە ئەنجامی ئەم گوێڕایەڵیە بـوو کە بۆ ابومسلم هەیان بوو ئەمەش هۆکارێك بوو بۆ دروست بوونی ئەم بزوتنەوانـە کــە زۆربــەیان بــە هیــوای زیندوکردنــەوەی شارســتانیەتی فارســی کــۆن و زیندوکردنەوەی ئاینی زەردەشـتی بـوو کـە ئەمـەش هۆکارێـك بـوو بـۆ دژایـەتی کردنی موسڵمانان[٢].

## باسی دووەم/ جوڵانەوەی محمد نفس زکیە:

کاتێك منصور خەلافەتی گرتەدەست، محمدو ئیبراهیم ئامادەنەبون بەیعەتی پێ بدەن وە چونکە ئەوان لە شوێنێکی نهێنی نیشتەجێ بوبون، ئەمەش خەلیفەی بێزارو تورەکرد بۆیە بە وردی کەوتە گەڕان بەدوایاندا تاکو شوێنەکەی ئاشکرا کردن، لە سەرەتادا خەلیفە مەنصور پەنای بردەبەر ڕێگاچارەی سیاسی تاکو کێشەکانیان چارەسەربکەن ئەویش بە گفتوگۆکردن کە بۆ ئەم مەبەستەش کۆمەڵێك نامەی هاوردەو هەناردە لە نێوان خەلیفەو محمد نفس زکیە ئاڵوگۆڕکرا[3].

محمد نفس زکیە باوەڕی وابوو کە لە منصور بەهێزترە، بەڵام شکستی هێنا بەرامبەر خەلیفە، ئەمەش لە دەست نیشانکردنی ڕۆژی دەرچوونی هەڵەکردبو، کە لەگەڵ برایەکەیدا وا ڕێك کەوتبون لە یەك ڕۆژدا دەربچن، بەڵام ئیبراهیمی برای نەیتوانی لەم ڕۆژەدا دەربچێت لەبەر ئەوەی نەخۆشکەوت هەروەها کاتێك عیسی بن موسی گەمارۆی شاری مەدینەی دا بۆ گرتنی محمد ئەوا زۆربەی خەڵکی مەدینە ئامادەنەبون یارمەتی محمد بدەن تاوەکو لە کۆتایی دا لە بەرەبەیانی دوازدەی ڕەمەزان دا جەنگەکە ڕوویدا لە نێوانیان و بە سەرکەوتنی سوپای عەباسیەکان کۆتایی هات[4]، هەروەها محمد نفس زکیە لە چواردەی ڕەمەزان کوژرا و عیسی بن موسی پەنای خەڵکی مەدینەداو دەستی گرت بەسەر شمەکی حەسەنی کوڕی عەلی[5].

## باسی سێیەم/ لەناوبردنی حەرەکەی ئیبراهیمی کوڕی عبداللە:

ئیبراهیمی کوڕی عبداللە کاتێ هاتە بەسرە توانی بە ئاسانی دەست بەسەر بەسرەدا بگرێت و دەست بەسەر هەرێمی ئەهوازو فارس و مەدائینیش ملیان بۆ

کەچ کرد[٦]، بزوتنەوەکەی ئیبراهیم گەشەی کردو وەفدەکان دەهاتنە لای و بەیعەتیان پێدەداو ئیبراهیم وای هەست دەکرد کە دەرفەتی شەڕکردن لەگەڵ خەلیفەدا لە بارەو کاتێ هەواڵی کوژرانی محمدی برای بیست ئەوا خەمی زۆر خواردو بانگەوازی خیلافەتی بۆ خۆی کردو نازناوی ئەمیری باوەڕدارانی لە خۆینا و شوێن کەوتوانیشی بەیعەتیان پێدا[٧]، خەلیفە هەوڵیدا ڕێکەوتنی لەگەڵی ببەستێ بەڵام لە کۆتایی دا لە گوندی باغمرا، لە مانگی ژالقعدەی ساڵی ١٤٥ك لە نزیك کوفە جەنگی چەکدارانی لە نێوان هەردوولادا ڕوویداو خەریك بوو سوپای عەباسی کە عیسی کوڕی موسی سەرکردایەتی دەکرد شکست بخوات بەڵام لە ناکاو ئاراستەی جەنگ گۆڕاو تیرێك بە قوڕگی ئیبراهیم کەوت و کوژرا بەمەش نیزامی سوپاکەی شلەژاو پێکیداداو سوپای عەباسی هێرشێکی هەڵگەراوەی بەرپاکردو توانی سەربکەوێت بەسەر حەرەکەی ئیبراهیمی کوڕی عبدالله[٨].

## تەوەرەی دووەم

### باسی یەکەم/ بزووتنەوەی سنباذ:

بزوتنەوەی سنباذ لەسەر دەستی کەسایەتیەکی فارسی بە ناوی سنباذ لە هەرێمی خوراسان سەریهەڵدا کە بانگەشەی سەندنەوەی خوێنی ابومسلیمی خوراسانی دەکرد، زۆربەی پەیڕەوانی ئەم بزوتنەوەیە خەڵکی هەرێمی خوراسان بووە بەتایبەتی کە بزوتنەوەی سنباذ بە یەکێك لە بزوتنەوە هەر دیارەکانی ئەو سەردەم دادەنرێت[٩]، بیروباوەڕی ئەم بزوتنەوەیە لە ڕووی سەرچاوەکانەوە بە شێوەیەکی جیاواز ئاماژەی بۆ کراوە هەروەك تەبەری دەڵێت: ((بیروباوەڕی ئەم بزوتنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئاگرپەرستی))، بەڵام هەندێکیتر پێیان وایە بیروباوەڕی ئەم بزووتنەوەیە زیاتر نزیکە لە بیروباوەڕی مەزدەکیەت، هەندێکی

تر پێیان وایە ئەم بزوتنەوەیە زیندوکردنەوەی ئاینی زەردەشتییە[10]، سنباذ توانی سنوری جوڵانەوەکەی زیاد بکات و فراوانی بکات و چەندین ناوچەی رۆژهەلاتی دەوڵەتی ئیسلامی بگرێتەوە لەوانەش (قومس، مەرو، خوراسان)، ئەوەی شایەنی باسە سنباذ هەمیشە هەوڵی گرتنی شاری (ڕەی)داوە سەرئەنجام توانیویەتی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت و شارەکەش بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی[11]، سنباذ توانی مەترسی بخاتە سەر دڵی خەلیفە بەتایبەتی دوای ئەوەی هەڕەشەی لە خەلافەت کردو دەیگوت: ((کەعبە دەڕوخێنم و شوێنی بازنەی خۆر دەکەمە شوێنی پەرستن))، ئەمەش وای لە خەلیفە کرد هەر زوو دژایەتی بکات و هەوڵی لەناوبردنی بدات و سوپایەکی بۆ ڕەوانەکردو لە شەڕێکدا لە نێوان شاری رەی و هەمەدان و توانی بەسەر سنباذ سەرکەوێت و بە هەزاران کوژراو دیلیشی لێ دەست بەسەرکردن[12].

## باسی دووەم/ بزوتنەوەی اسحاق الترك:

ئەم بزوتنەوەیەش بە یەکێك لە پەیڕەوان و شوێنکەوتوانی (أبوملسم) دادەنرێت، کە هەر لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (ابوملسم)دا نامە بۆ ئەم کەسایەتیە دەنێرێت کە ببێتە دەسەلاتداری ناوچەکانی تورك، وە تەنانەت بانگهێشتیشی دەکات بۆ لای خۆی بەلام دوای مردنی (ابومسلم) لە ساڵی (١٣٧ك) بزوتنەوەکەی ڕادەگەیەنێت کە تا ساڵی (١٤٠ك) بەردەوام دەبێت، کە ئەم بزوتنەوەیە بیروباوەڕی گەڕانەوەی بۆ سەر ئاینی زەردەشتی کۆن هەبوە، وە هەروەها فێرکاری بزوتنەوەکە وای بە لایەنگرەکانی کردووە کە زیاتر نەتەوەکانی فارس و تورك لەخۆ بگرێت[13].

سەبارەت بە کۆتایی هێنان بەم بزوتنەوەیەش چەندین بیرورای جیاواز هەیە لە دیارترینیان ئەو پەیوەندییەیە کە لە نێوان اسحاق تورك و خالید بن ابراهیم الشیبانی کە دوای ئەوەی پەیوەندیەکانیان تێك دەچێت وە اسحاق تورك چەندین بیرورای دژ بە ئیسلام ڕادەگەیەنێت، ئەمە وا دەکات ئەم والیە سوپایەك ئامادەبکات و هێرش بکاتە سەر بزوتنەوەکە کە دەتوانێ لە ساڵی (١٤٠ك) کۆتایی بە بزوتنەوەکە بهێنێت و تەنانەت اسحاق ترکیش دەکوژێت بەمەش کۆتایی بە بزوتنەوەکە دێت[١٤].

## تەوەرەی سێیەم

### باسی یەکەم/ بزووتنەوەی الراوندیە:

ئەم بزوتنەوەیە بە یەکێك لەو بزوتنەوانەی کە لە سەردەمی یەکەمی عباسیدا سەریان هەڵدا دادەنرێت، کە لە ساڵی ١٤١ك بە تەواوەتی لە لایەن خەڵکی خۆراسان بە گشتی ڕادەگەیەنرێت کە ناوەکەشی لە دێی(راوند)ەوە دێت کە دەکەوێتە نزیك ئەسفەهان، کە ئەمانیش بە هەمان شێوە پەیڕەوانی (ابومسلم الخراسانی) بوون کە دەسەڵاتیان بە شێوەیەکی بەرچاو زیادیکرد تەنانەت توانیان چەندین ناوچە بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان[١٥].

ئەم بزوتنەوەیەش لەسەر دەستی (عبدالله الراوندی) سەریهەڵدا کە پێی وابوو (ابومسلم) پێغەمبەریەتی بۆیە هێرشی کردە سەر خەلافەتی عەباسی لە هاشمیەی کوفەوە هەوڵی کوشتنی خەلیفە (أبوجعفری مەنصور)ی دا بەڵام سەرکەوتو نەبو، ئەمەش کاریگەری گەورەی کردە سەر خەلافەتی عەباسی، بە شێوەیەك ئەم بزوتنەوەیە تاڕادەیەك توانی ئامانجەکەی خۆی بپێکێت، بەڵام هەر چۆنێك بێت لە کۆتایدا بزوتنەوەکە لەناودەچێت[١٦]، بەڵام چەندین بەشیان لێ

دەبێتەوە وەکو (أبومسلمیە) کە داوای خوێنی أبومسلمیان دەکرد بەشێکیتریان (الرازیمیە) بوون کە ناویان لە سەرکردەکەیانەوە دەهات بە ناوی(رازیم) بەم شێوەیە ئەم بزوتنەوە لەسەر دەستی عەباسیەکان لەناوچوو[17].

## باسی دووەم/ سەرهەڵدانی بزوتنەوەی أستاذیس:

بزوتنەوەی أستاذیس لە سەردەمی یەکەمی عباسیدا لەسەر دەستی (عبدالجبار الأزدني) دادەمەزرێت لە ناوچەی سجستان لە لایەن خەڵکی خوراسان و حەران پشتگیری لێدەکرێت بەتایبەتی کاتێك کە بزوتنەوەکە توانی چەند شارێك بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی لەوانە شاری (مەرو) بەمەش مەترسی زۆری خستە ناو دڵی خەلافەتی عەباسی بە گشتی و والی خراسان بەتایبەتی ئەمەش لە ڕێگای بەرزکردنەوەی شیعاری عەلەویەکانەوە ئەم کارەیان دەکرد وە توانیان هەستی عەلەویەکان بۆ لای خۆیان ڕاکێشن لە ساڵی (١٥٠ك) توانیان بزوتنەوەکەیان ڕابگەیەنن[18]. أستاذیس شەڕو ئاژاوەی زۆریان کرد کە ئەوە منصوری زۆر نارەحەت کردو ژمارەیان گەیشتە نزیکەی (٣٠٠)هەزار جەنگاوەر و سوارو پیادە بوون، خەلیفە (ئەحبشم مروزی) ناردە سەریان بۆ لەناوبردنیان بەڵام (ئەحبەشەم) کوژراو سوپاکەیان بڵاوەپێکرد ئەنجا(محازم کوڕی حزیمە) لە سوپای (عرمرەم) کە بەری ئاسمانی گرتبو هەردوو سوپاکە بەیەك گەیشتن ئەو شەڕەی کە ڕوویدا وتراوە (٧٠)هەزار کەس کوژراو پاشان أستاذیس شکاو ڕایکرد بۆ شاخ[19].

## باسی سێیەم/ کۆتایی هێنان بە بزوتنەوەی استاذیس:

دوای ئەوەی دەسەڵاتی بزوتنەوەی استاذیس بە شێوەیەکی بەرچاو و بەرفراوانی ڕۆیی بۆیە خەلیفەی عباسی(محمد مهدی) بڕیاری یەکلایی کەرەوەی خۆی دا ئەویش بە بڕیاردان بەهێرشکردنە سەر بزوتنەوەکەو کۆتایی پێهێنانی بۆ ئەم مەبەستە خەلیفەی عەباسی سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد، بۆ هێرشکردنە سەر بزوتنەوەی استاذیس بە سەرکردایەتی (حازم بن خزیمە التمیمی) کە ژمارەیان نزیکەی هەشتا هەزار سەرباز دەبون، لە شوێنێك بەیەك گەیشتن لە نزیك شاری (میرا) لە هەرێمی فارس کە سوپاکەی خەلافەتی عەباسی توانی سەرکەوتنێکی گەورە بەسەر بزوتنەوەی استاذیس بەدەست بهێنێت[20]، سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە نزیکەی حەفتا هەزار کەس لەم شەڕەدا کوژراوە وە نزیکەی چواردە هەزار کەسیش لە لایەن سوپای خەلافەتی عەباسییەوە بەدیل گیران بەڵام استاذیس خۆی ڕایکرد لەم کاتەدا سەرکردەی سوپای خەلافەت نامە دەنێرێ بۆ خەلیفە مهدی و هەر دوای ئەمە استاذیس دەکوژرێ لە ساڵی (١٥١ك) کۆتایی بە بزوتنەوەکە دێت[21].

## ئەنجام

دوابەدوای نوسینی ئەم بابەتەمان گەیشتین بەم دەرئەنجامانەی خوارەوە:

١- زۆربەی جوڵانەوەکانی سەردەمی ابوجعفری منصور جوڵانەوەی فارسی بوون لە دژی خەلافەت، بەتایبەتی لە دوای کوژرانی ئەبوموسلیمی خوراسانی بەدەرکەوتن و داوای تۆڵەکردنەوەی خوێنی ئەبو موسلیمی خوراسانیان دەکرد، بەڵام لە ڕاستیدا ئامانجیان زیندوکردنەوەی ئاینی زەردەشتییە.

٢- زۆربەی ئەو بزوتنەوانە هەر لە سەردەمی ئەبوجعفری منصور سەریان هەڵداو هەر لەو سەردەمیش کۆتاییان پێهێنرا.

٣- زۆربەی جوڵانەوەکان لە ناوچەکانی فارسی بوون و ئامانجیان زیندوکردنەوەی شارستانیەتی پێشووی فارسی و گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی پێشووی فارسیە.

٤- ئەم جوڵانەوانە بە ڕاگەیاندنی ئەوەی کە داوای تۆڵەکردنەوەی خوێنی ئەبوموسلیم دەکەن توانیان پاڵپشتێکی زۆر و لایەنگرێکی زۆر بۆ خۆیان پەیدابکەن بەتایبەتی لە هەرێمی خوراسان.

٥- هەڵگەڕانەوەکان لە دژی أبوجعفری منصورە بە تەنها لە ناو فارسەکان و لە ناوچە فارسیەکان و لە لایەن فارسەکانەوە نەبوو، بەڵکو هەڵگەڕانەوە لە لایەن عەرەبەکانیشەوە ئەنجام دراوەو تەنانەت لە دژی خەلیفەی عەباسی و لە کاتی هەبوونی خەلیفەدا لە یەکێك لە سەرکردەی جوڵانەوەکانی دژی خەلافەتی عەباسی بانگەشەی خەلافەتی بۆ خۆی کردوەو بەیعەتی پێدراوە.

**پەراوێزەکان**

١- خليل ابراهيم السامرائي والآخرون: تأريخ الدولة العربية الاسلامية في العصر العباسي، موصل، ١٩٨٨، ص٣٢-٣٣.

٢- فاروق عمر: الخلافة العباسية، د.س، بغداد، ص١١٠.

٣- مسعودي: مروج الذهب، دار الأندلس، بيروت، ج٣، ص٢٥٣.

٤- يعقوبي: تأريخ يعقوبي، بيروت، ج٢، ص٣١٥.

٥- طبري: تأريخ الرسل والملوك، ج٧، دار المعارف، مصر، ٢٠٠٥، ص٥٩٦.

٦- إبن كثير: البداية والنهاية، دار المنار، ط١، ج١٠، ص٨٩.

٧- إبن كثير: م.نفسة، ج١٠، ص٩٠.

٨- الطبري: م.س، ج٧، ص٦٤٦-٦٤٧.

٩- إبن الأثير: الكامل في التأريخ، بيروت، ٢٠٠٧، ج٢، ص٦٣٠.

١٠- محمد قباني: الدولة العباسية من الميلاد إلى سقوط، ط١، بيروت، ٢٠٠٦، ص٢٥.

١١- حسن كريم جاف: الوجيز في التأريخ ايران (دراسة في التأريخ السياسي)، ط٢، ج١، آراس، ٢٠٠٨، ص١٧٢.

١٢- م.ن، ص١٧٢.

١٣- فاروق عمر: م.س، ص١١٨-١١٩.

١٤- خليل ابراهيم السامرائي والأخرون: م.س، ص٣٥.

١٥- محمد قباني: م.س، ص٢٥.

١٦- خليل ابراهيم السامرائي والأخرون: م.س، ص٣٥-٣٦.

١٧- فاروق عمر: م.س، ص١١٤.

١٨- إبن الأثير: كامل في التأريخ: م.س، ص٦٣٠.

١٩- ئیمام جلال الدين سيوطي: مێژووی خەلیفەکانی ئیسلام، و: نصرالدين عبدالرحمن قادر، چاپی یەکەم، ٢٠٠٧، ل١٢٥.

٢٠- إبن الأثير: م.س، ص٥٧.

٢١- فاروق عمر: م.س، ص١٢١.

## سەرچاوەکان

* المصادر:

١- إبن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٢، بيروت، ٢٠٠٧.

٢- إبن كثير: البداية والنهاية، دار المنار، ط١، ج١.

٣- يعقوبي: تاريخ يعقوبي، بيروت، ج٢، مؤسسة العلمي للمطبوعات.

٤- الطبري: تاريخ الرسل والملوك، دار المعارف، مصر، ج٧، ٢٠٠٥.

* المراجع:

٥- محمد القباني: الدولة العباسية من الميلاد إلى سقوط، بيروت، ط١، ٢٠٠٧.

٦- فارق عمر، الخلافة العباسية، د.ت، بغداد.

٧- خليل ابراهيم السامرائي والأخرون، تأريخ الدولة العربية الاسلامية في عصر العباسي، موصل، ١٩٨٨.

٨- حسن كريم جاف: الوجيز في التأريخ ايران (دراسة في التأريخ السياسي)، ط٢، ج١، آراس، ٢٠٠٨.

* سەرچاوە بە کوردی:

٩- ئیمام جلال الدين سيوطي: مێژووی خەلیفەکانی ئیسلام، و: نصرالدين عبدالرحمن قادر، چ١، ٢٠٠٧.

# رۆڵی کوردە عێراقییەکان لە کۆماری کوردستان ١٩٤٦ز

قارەمان حەیدەر رەحمان

## دەروازە

ئەو بارودۆخەی کەوا لە ئەنجامی جەنگی دووەمی جیهانی (١٩٣٩– ١٩٤٥ز) لە ئێران و کوردستانی رۆژهەڵات هاتە پێشەوە ، بواری رەخساند بۆ جووڵانەوەی نەتەوایەتی گەلی کورد لە رۆژهەلاتی کوردستان کە وەرچەرخانێکی گەورە بەخۆیەوە ببینێت، بەو جۆرەش ئەم بزاوتە پێینایە قۆناغێکی گرنگی مێژوویی [١].

شیاوی باسە دوای گەرانەوەی قازی مەحەمەد لە سەفەری باکۆ لە یەکەمین هەنگاوی دا ، کۆبوونەوەیەکی لە ئەندامە بەناوبانگەکانی کۆمەڵەی (ژ.ك)پێکهێنا ، لەو کۆبوونەوەیەدا مەسەلەی دوایی هێنان بە تێکۆشانی کۆمەڵەی ژ.ك هێنایە گۆرێو پێشنیاریکرد لە جێگای ئەو رێکخراوە، لەسەر ئەساسی رێزلینان لە ئازادییە دیموکراتیە کان و دابینکردنی مافی چارەنووس بۆ گەلی کورد بناغەی حیزبێك بەناوی "حیزبی دیموکراتی کوردستان"دابرێژن،لە رۆژی یەکەمی مانگی خەزەڵوەری ١٣٢٤ هـ "حیزبی دیموکراتی کوردستان" بە دەرکردنی بەیاننامەیەکی ٨ مادەیی دامەزراندنی خۆی راگەیاند [٢].لە رۆژی ٢ خەزەڵوەری ١٣٢٤هـ یەکەم کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کەردستان بە بەشداری سەرۆك عەشایری ماکۆ و ئارارات ، سۆما، برادۆست،دەشت، مەرگەوەڕ، شنۆ، سندوس، لاجان، پیرانشار،

مەنگوڕ،نوێنەرانی مەهاباد، بۆکان، میانداواو بەسترا، لەو کۆنگرەیەدا "قازی محەمەد"بە سەرۆك و پێشەوای حیزب و چەند کەسێك بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران، بەم جۆرەش حیزبی دیموکراتی کوردستان لەمەودوا بوو بە میراتگری کۆمەڵەی (ژ.ك)و درێژەدەری ناسیۆنالیزمی کورد[٣].

پاش ماوەیەکی کەم لە دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران ناو و ناوبانگێکی بەرفراوانی دەرکرد لە نێوڕیزەکانی دانیشتوانی کورد لە ئێران دا، کۆمەڵانێکی زۆر لە جوتیاران و کرێکاران و سەرمایەدارە بچوکەکان و خاوەن موڵك و ئەندامەکانی خێڵەکانیش هاتنە ناو ڕیزەکانی ئەم پارتە،هەروەها نوێنەرانی بازرگانەکانی مەهاباد و سەرمایەدارە بچوکەکان و دەرەبەگەکانیش هاتنە ناو لیژنەی ناوەندی ئەم پارتەوە،ڕۆژنامەی"کوردستان"یش بوو بە زمانحاڵی حزب، قازی محەمەدیش بوو بە پێشەواو سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران[٤].

دەکرێ بڵێین نیشتمان پەروەرانی کورد دوا بە دوای دامەزراندنی کۆماری ئازەربێجان لە ١٢ی کانوونی دووەمی هەمان ساڵدا بە شێوەیەك لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لەدەرەوە و لەسەر ئاستی ناوخۆیی ئێراندا، دەرفەتێکی باشیان بۆ ڕەخسا و هاتە پێش کە بتوانن دەسەلاتی سیاسی لە ناوەخۆی کوردستان بگرنە دەست و کۆمارێکی دیموکراتی میللی کوردستانی رابگەیەنن.

ئەوەبوو لە ٢٢ کانوونی دووەمی ١٩٤٦[٥] لە رۆژێکی گەرم دا لە ناوەراستی زستان لە بەرزایی ٤٥٠٠م پێ لەسەر ئاستی رووی دەریا، لەسەر هێڵی پانی ٣٧ ی باکوور[٦]،لەگۆرەپانی چوارچرا لە شاری مەهاباد لە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا کەنوێنەرانی زۆر لە ناوچەکانی کوردستان تیایدا بەشداربوون لەمانەش سەرۆك هۆزەکانی ناوچەی مەهاباد و مامەش و مەنگور و کەوورك و ووزەرزە لە

ناوچەکانی دراوسیێ سنووری عێراق ،هەروەها بەشێك لە هۆزەکانی هەرکی و بەگزادە و بارزانیەکان ، کە بە جلوبەرگی خۆیان هاتبوون ، لەگەلێ یرماکۆڤ کە بە نوێنەرایەتی یەکێتی سۆڤێت کە لە تەبرێزەوە هاتبوو لەناو ئۆتۆمبێلێکی جێب دانیشتبوو لە دوورەوە چاودێری رووداوەکەی دەکرد، دامەزراندنی کۆماری کوردستان راگەیەنرا و قازی محەمەد کە رابەری حیزبی دیموکراتی کوردستان* بوو ،وەك سەرۆك کۆماری کوردستان لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادەبوو، ووتارێکی پێشکەشکرد و تیایدا کارو تێکۆشانی کۆماری کوردستانی لە داهاتوو خستەروو[٧] .

مەلا مستەفای بارزانی* سەرۆکی "لیژنەی ئازادیی کوردستان"* بەشێوەیەکی فەرمی بانگهێشتی ئەم ئاهەنگە کرابوون[٨].شیاوی باسە دوای راگەیاندنی کۆمارەکە ، بە بریارێکی فەرمی شاری مەهاباد وەکو پایتەختی کۆماری کوردستان ناسێندرا[٩].دواتر بریاردرا بە داگرتنی ئالای ئێران لەسەر هەموو دام و دەزگاکان و بەرزکردنەوەو هەلْکردنی ئالآی کوردستان لە شوێنی دا[١٠].

لە ئاهەنگی هەلْکردنی ئالای کوردستان وتارێك بە ناوی مەلا مستەفای بارزانی لەلایەن محەمەد قودسی خوێنرایەوە ، لەبەشێکی وتارەکەدا هاتووە " پیشەوای معظم گەورە بەریزەکانم ، بەناوی کوردی وریا بووەوە لە ژێر ماوەی پەیرەوی کونی زەبربەدەستی،بەناوی سەرکردەی شۆرشی گەل لە بارزان،شۆرشی بەرهەلستی سەرگەردانی ، شۆرشی نەهیشتنی ظلم واستبداد، رۆژباش پێشکەشی دانیشتوانی ئەم کۆبوونەوەیە دەکەم ،کە الای پیروزیان لە سیەیەکی نیشتمانی گەورەدا بلێند کردەوە بەناوی خوینی پاکی گەلی کوششکەرانەوە کە لە مەیدانی ازادیدا پیشکەشیان کردوە، هاوارتان دەکەینێ کە ئەم بەرە پیرۆزە بە ئازادیو و سەربەخۆیی پی بگەیینن بەناوی فرمیسکی چاوی بیوەژنان و اه و

نالینی هەتیوانەوە هاوارتان دەکەینی کە پەیمانی حقوقی گەل بدەن،اقتصادیان بپاریزریت،پشتی فەرهەنگ بگرن بە پەروەردە کردنیکی گیانی دیموکراتیەوە ،پاریزگاری لە دیموکراتی بفرمون کە کەرییکەی پیش خستنی گەل و سەربەخویی نیشتمان و رویشتنە بەری وەیە لە گەل کاروانی گەلانی ازادی بەرەو تەواوەتی ومروانی. بێگومان لە بیرناکرێت کە حکومەتی کوردستانی ئازاد هێشتا لەیەکەم فۆناغیایەتی وە کۆششی ئێوەی پێ دەوێت بۆ سەرکەوتنی مەزن و رزگاربوونی ... بژی نیشتمانی مەزنمان بە سەربەخۆی و ئازادی"[11].

دوای تەنها بیست رۆژلە دامەزراندنی کۆماری کوردستان، یەکەم حکومەتی کوردستان بە سەرۆکایەتی حاجی بابە شێخ و ئەندامیەتی ١٣ وەزیر لە رۆژنامەی کوردستانی ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران راگەیەنرا[12]. وەزارەتەکانیش بریتی بوون لە جەنگ و تەندروستی و کشتوکاڵ و رێگاوبان و بازرگانی و راگەیاندن و دەرەوە و ناوەخۆ و ئابووری و پۆستەو تەلەگراف و رۆشنبیری و کار و داد ، جگە لەمانەش پێنج کەس لە سەرۆکە کوردەکان لەلایەن قازی محەمەد پلەی ژەنەرالیان پێدرا کە بریتی بوون لە محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی،مەلا مستەفای بارزانی ، عومەر خان شەریفی ، زێرۆبەگی هەرکی، مەحەمەد رەشید خانی قادر خانی بانی[13].

شیاوی باسە پەرلەمان و ئەنجومەنی یاسادانان نەبوو بۆیە یاساکان بە فەرمانی کۆماری دەردەچوون، هەرچی کاروباری دادوەریش بوو لەلایەن دادگای باڵا و وەزارەتی داد بەرێوەدەبردران، وەدامەزراندنی ئیدارەی نێوخۆیی بریاری لێ نەدرابوو، کە ئایا ئەم حکومەتە حکومەتێکی هەرێمی خاوەن دەسەلاتێکی نێوخۆیی سەربەخۆیە ؟یان کۆمارێکی سەربەخۆیە ؟[14].

ئارچی روزفلت کە توێژەرێکی ئەمەریکیە، سەرەرای ئەو هۆکارانەی کەبوون بە هۆی هاندانی گەلی کورد لە ئێران بۆ راگەیاندنی کۆمارەکە ، رۆلی مەلا مستەفای بارزانی و جەنگاوەرانی بەرزدەنرخێنێت و بە هۆکارێکی سەرەکی هاندانی کوردەکانی ئێران دادەنێت و دەلێت : ئامادەبوونی بارزانی و جەنگاوەرەکانی لەشاری مەهاباد،رۆلێکی بنەرەتی هەبوو لە هاندانی کوردەکانی ئێران بۆ راگەیاندنی کۆماری مەهاباد[١٥] .

## باسی یەکەم :

## ڕۆڵ و هەڵوێستی سیاسی کوردەکانی عێراق

لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیی چەندین رێکخراووپارتی سیاسی لە باشووری کوردستاندا دروست بوون[١٦] . کەسانێکی زۆری لیبراڵ و پێشکەوتن خواز لە دەوروبەریاندا کۆبوونەوە ، کە دواتر رۆلیان بینی لە ووشیارکردنەوەی تاکی کوردو بزواندنی بیری ناسۆنالیزمی[١٧]،کاریگەری ئەو بزاوتە گەیشتە رۆژهەلاتی کوردستان بەر لە دامەزراندنی (کۆمەلەی ژیانەوەی کوردستان)* کاتێک چەند کەسایەتیەکی نیشتمان پەروەر بۆ یارمەتیدانی جولانەوەی نیشتمانی لە رۆژهەلات و بلاوکردنەوەی بیری نەتەوەیی چوونە ئێران لە وانەش (هەمزە عەبدوللا،میر حاج ئەحمەد، خەیروللا عەبدول کەریم،عوسمان دانش) هەر لەگەڵ گەیشتنی ئەم کەسایەتیانە دەستیان کرد بە جموجۆلی سیاسی لە رۆژهەلاتی کوردستان، ئەم شاندە بە رێنوینی هاشم بەزاز بەرەو تاران رۆیشتن دوای ئەوەی هۆتێلێکیان بەکرێ گرت،دوای چەند رۆژێک میر حاج خۆی ئامادەکرد و چووە سۆفێت بۆ ئەنجامدانی چەند کارێکی سیاسی لەگەڵ سۆفێت لە دوای گەرانەوەی (ژ.ك)دامەزرا[١٨] .

دوای سەرنەکەوتنی گفتوگۆی سەرکردایەتی شۆرشی بارزان و حکومەتی عێراق، حکومەتی عێراق بریاری لەشکرکێشی دا بۆ سەر بارزان ، یەکەمین تێکهەڵچون لە ٢٥ی ئابی ١٩٤٥ دا دەستی پێکرد، لەشکری عێراق زۆرایەتی هێزەکانی خۆی بۆ ئەم هێرشە سازدابو،هێزی ئاسمانی بەریتانیاش پشتیوانی هێزی زەمینی عێراقی دەکرد[١٩]. مەلا مستەفای بارزانیش دوای کۆتایی هاتنی شۆرشی بارزان(١٩٤٣-١٩٤٥) ، فەرمانی دەرکرد بۆ خەباتگێرە کوردەکان لەسنووری عێراق بپەرنەوە بۆ سنووری ئێران ،دوای دروستکردنی فشارێکی زۆر لەلایەن هێزەکانی سوپای عێراقی و فرۆکەکانی بەریتانیا لەسەریان، ئەوەبوو لە ١١تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ لە رێگای کێلە شین – مەرگەوەڕ و چیای دالآنپەڕدا پەرینەوە دیوی ئێران و لەلایەن حوسێن فروهەر سەرۆکی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان و خەڵکی ناوچەکانەوە بەگەرمی پێشوازیکران، چونکە بەر لە کۆچەکە مەلا مستەفای بارزانی پەیوەندی کردبوو بە سەرکردەکانی بزوتنەوەی کوردی لە کوردستانی ئێران* لە پێناو یەکخستنی هەوڵەکان و بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکان،لەدوای هاتنە پێشەوەی دەرفەتێکی گونجاو لەبەرامبەر گەلەکەی لە کوردستانی ئێران[٢٠].لە ٧مایسی ساڵی ١٩٤٥ز مامەند مەسیحی و میرحاج و مستەفا خۆشناوی بە نوێنەرایەتی خۆی رەوانەی رۆژهەلاتی کوردستانی کرد بۆ ئەوەی لەگەڵ نوێنەری حکومەتی سۆڤێت گفتوگۆ بکەن بۆ زانینی هەڵوێستیان سەبارەت بە پەرینەوەی بارزانیەکان بۆ ئێران ، پشتگیری کردنیان لەئەگەری دروست بوونی هەر دوژمنکاریەك لە دژیاندا[٢١]. ئەو بارزانیانەی کە لە سنوور پەرینەوە بۆ ئێران ژمارەیان ١٠٠٠٠هەزار کەس بوو لە پیاو و منالّ و ئافرەت ، لە ناوچەی باکوری رۆژئاوا لە خانە تاکو شنۆ نیشتە جێ بوون ، لە سەرەتای مانگی ئازاردا مەلا مستەفای بارزانی باشترین جەنگاوەرەکانی خۆی هەڵبژارد

لەگەڵ خانەوادەکانیان چوونە مەهاباد ، کە بە جۆرێك ژمارەیان گەیشتە ۳۰۰۰ هەزار کەس ، مەلا مستەفا میوانخانەی جیهان نمای کردە بارەگای سەرەکی خۆی[۲۲].لەگەڵ گەیشتنی خۆی و جەنگاوەرەکانی بۆ رۆژهەڵاتی کوردستان لەو کاتەدا چاوی بە جەنەراڵ لیوبوف کەوت ، فەرماندەی هێزەکانی سۆڤێت لە ئێران، بەئامادەبوونی هەریەك لە میر حاج ئەحمەد و هەمزە عەبدوللا پێشنیاری کرد حکومەتی سۆڤێت رێگا بە بارزانیەکان بدات لە ئێران بمێننەوە،لە دوای دە رۆژ حکومەتی سۆڤێت رەزامەندی دەربڕی لەسەر مانەوەی بارزانیەکان لە ئێران [۲۳]. مەلا مستەفای بارزانی و چەند جەنگاوەرێکیش لەگەڵیدا چوونە گوندی میراوێ لە نێوان جادەی پیرانشار و سەردەشتدا جێگیربوو، بارزانیەکان لە شنۆ ، نەغەدە ، تەرگەوەڕ، مەرگەوەڕ و گوندەکانی ناوچەکە نیشتە جێکران[۲٤].لە هەمان کاتدا مەلا مستەفای بارزانی هەموو هەوڵەکانی چڕ کردبۆوە بۆئەوەی متمانەی بەرپرسەکانی یەکێتی سۆڤێت بەدەست بهێنێت[۲٥].

دوای بەشداریکردنی مستەفا بارزانی لە ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستاندا، قازی مەحەمەد داوای لە شێخ ئەحمەد و مستەفا بارزانیی، لەبەرامبەر ئەو یارمەتیانەدا کە ڕوسەکان بە کۆماری ئازەربایجانی دەدەن و بەرنگاربوونەوە لەگەڵ ئەو ڕووداوانەدا کە لە بەدوای دەرچوونی هێزەکانی سۆڤێت ڕەنگە لە کوردستاندا سەرهەڵدەن، ئەوانیش بێن و پاڵپشتیی کۆماری کوردستان بکەن، هەربۆیە مەلا مستەفای بارزانی رۆژی ۱۹٤٦/۲/۲۸ز بەشێوەیەکی رەسمیی گەڕایەوە بۆ مەهاباد و لەلایەن ڕێبەرانی حیزبیی و حکومەتی کۆماری کوردستانەوە پێشوازیی کرا،رۆژنامەی کوردستان دەربارەی هاتنی بارزانی بۆ مەهاباد نوسی:"اخبار نیو خۆمان مەلا مصطفی بارزانی "" "جنابی أغای مەلا مصطفی قائدی کوردی بارزان رۆژی ۹-۱۲-۱۳۲٤ ساتی ٥ پاش نیوەرو واردی مهاباد

بوو، وەختی گەیشتە نیو باغان ئەندامەکانی کمیتەی مرکزی پیشوازیان لی کرد وەختی جنابی مەلا مصطفی لە چومی پەریوە بە احترامی ئەندامەکانی کمیتەی مرکزی دابەزی ، لەم کاتەدا کمیتەی مرکزی هەنگاویان توندتر کرد و لە قەراغ چومی پیك گەیشتن............" [٢٦].

هەرلەدوای دامەزراندنی کۆماری کوردستان ، کوردەکانی باشووری کوردستان بە شێکی زۆریان بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵیانداوە بەشداری لە کۆمارەکە بکەن، ئەمەش بە ڕونی دەرئەکەوێت لە دەقی ووتارەکەی مەحەمەد مەحمود قودسی دا کە باسی لە ڕۆڵی کوردەکانی باشوور کردوە،بەجۆرێك دانیشتوانی باشووری کوردستان بە چاوی پڕ لە ئومێدەوە دەیانڕوانیە ئەم کۆمارە[٢٧].

ڕۆژنامەی کوردستان لە ژمارە ١١، ١٢ی رەشەمەی ١٣٢٤ھ لەسەر کەسایەتی مەلا مستەفا نوسیبوی" مستەفا بارزانی پیاوێکی سیاسی و زەعیمی کوردی بارزانە لە رێی سەربەستی کوردستاندا زۆری مەینەت کێشاوە ، دوژمنانی کوردستان ئەوو تەواوی ئێل و عەشیرەتی ئەویان بە تاوانی ئازادیخوازی دەربەدەرو لە نیشتمانی خۆشەویستیان وەدەرناوە، زاتی نێوبراو بێجگە لەوەی قائیدێکی بەرزە ، پیاوێکی زاناو تێگەیشتوو و مەزن و نیشتمان پەرستە و تەمەنی لە حدودی ٤٥ ساڵدایە"[٢٨].

شیاوی باسە جگە لە بارزانیەکان ، ژمارەیەك کەسایەتی سیاسی و کۆمەلآیەتی لە ناوچەکانی باشووری کوردستان پەیوەندییان بە کۆمارەکەوە کرد، لەو چوارچێوەیەدا خەڵکی ناوچەی پشدەر سوود لە شوێنی جوگرافیان وەردەگرن بە هۆی ئەوەی کەوتوونەتە سەر سنووری ئێران گرجوگۆڵتر لە ناوچەکانی تر بەرەو رووی کۆمارەکە دەچن، هەربۆیە عەباسی مەحمود ئاغا پەیوەندی بە قازی محەمەدەوە دەکات بە مەبەستی پێشکەشکردنی هاوکاری و

کۆمەکی، هاوکات چەندین کەسایەتی تر هەر لە ناوچەی پشدەر دەستی هاوکاری و یارمەتیان بۆ کۆمارەکە درێژکرد لەوانەش مەحمود ئاغای هێرۆ و بابەکری حەمە و رەشید ئاغا و عەبدوڵلا ئاغای پشدەری، بە پێچەوانەشەوە هەندێکی تر هەبوون هەر لە ناوچەی پشدەر بە ئامۆژگاری و رێنومایی ئینگلیزەکان رێگریان دەکرد لە کوردەکانی عێراق تاکوو نەگەنە هاریکاری کوردەکانی مەهاباد ، بابەکر ئاغای پشدەری یەکێك بووە لەوانەی کەوا رۆڵێکی زۆر خراپیان گێراوە، بەجۆرێك رێگری کردووە لە هێزەکانی پشدەر کاتێك هەوڵیان داوە هێرش بکەنە سەر هێزە ئێرانیەکانی نزیك سنووری خۆیان[٢٩].

هەروەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێکردبوو کە پارت و رێکخراوە سیاسیەکانی باشووری کوردستان رۆڵی بەرچاویا گێراوە لە کۆماری مەهاباد ، لەوانەش (حزبی رزگاری کورد)* کە هەڵگری خەباتی نەتەوایەتی لە خۆگرتبوو لەسەردەمی کۆماری کوردستاندا لە هەوڵی پشتگیری کردنی کۆمارەکە بووە،رۆلێکی دیاری نواندووە لە پەیوەندی کردنی هەندێ لە سەرۆك هۆزە کوردیەکان و سەرکردەکانی کۆمار لە مەهاباد،دیارترینیان(عەلی ئاغای ناوچەی رایات، مەحەمەد عەلی ئاغا لە ناوچەی جوندیان،شێخ عوبیدوللای زینوی،شێخ عەلائەدین خەلانی)، چالاکی و پەیوەندییەکانی بۆتە جێگای گومان لێکردن لەلایەن دەزگا ئەمنیەکانی حکومەتی پادشایەتی، کە بەگوێرەی بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی ناوخۆی عێراقی ئەوە دەردەخات کە ژمارەیەك لە نیشتمان پەروەرانی کورد کە هەندێکیان سەر بە رێکخستنەکانی حزبی رزگاری کوردن لە پلەی سەرکردایەتی دان هەوڵی کۆکردنەوەی کۆمەك و یارمەتیان داوە بۆ پشتگیری کردنی کۆماری کوردستان کە ژمارەیەك قوتابیانی شارۆچکەی مەخمورکۆیەو رەواندوزوهەندێ لە سەرۆك هۆزەکان یارمەتیان پێشکەش کردووە[٣٠].

دەکرێ بلێین بەشێك لەو سەردان و گەڕانانەی کەوا مەلا مستەفای بارزانی ئەنجامی داون بۆ دام و دەزگا رۆشنبیری و پەروەردەییەکان لە مەهاباد ئەمانیش دەچنە چوارچێوەی چالاکیە سیاسیەکان، رۆژنامەی کوردستان بە دواداچوونی کردووە لەسەر سەردانەکانی مەلا مستەفای بارزانی لەو کاتانەی کەوا لە مەهاباد بووە، لە ١ ئاداری ١٩٤٦ز مستەفا بارزانی چاوی کەوتووە بە بەشێك لە پیاوماقولانی شارەکە بە ئامانجی یەکترناسین، هەروەها بارزانی لە ٢ ئاداری ١٩٤٦زبەیاوەری ئەحمەد ئالهی ئەندامی لێژنەی مەرکەزی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و وەزیری ئابووری سەردانی فەرماندەیی هێزەکانی سوپای کوردستانی کردووە، لە سەردانەکەدا رێنمایی و ئامۆژگاری ئەفسەرو پلەدارانی سوپای کردووە بۆ بەرزکردنەوەی ورەیان، داوای مەشق و راهێنانی زیاتری لێکردوون، لەگەڵ پابەندبوون بە پرەنسیپەکانی عەسکەری پێویستیشە هەمیشە گیانی بەرگریکردن و قوربانیان تێدابێت بۆ کوردستان،هاوکات بارزانی دام و دەزگا رۆشنبیریی و پەروەردەییەکانی بەسەرکردۆتەوە، سەردانی هەندێك قوتابخانەی کردووە لە مەهاباد لەوانەش ناوەندی مەهاباد و قوتابخانەی گەلاوێژ و قوتابخانەی کوردستان،ئاشنایەتی دروستکردووە لەگەڵ دەستەی پەروەردەیی و چەندان رێنمایی و ئامۆژگاری پێشکەشکردوون لەلایەنی پەروەردەیی و نیشتمانی،دەزگاکانی رۆشنبیریش بەشێك بوینە لەو کەناڵانەی بارزانی سەردانی کردوون،لە ٣ ئاداری ١٩٤٦ز بارزانی سەردانی چاپخانەی کوردستانی کردووە، هەر لە نێو بەرنامەی سەردانەکانیدا بارزانی دووجاران سەردانی حاجی بابە شێخی سەرۆك وەزیرانی کۆماری مەهابادی کردووەلە ٣ئاداری ١٩٤٦ز ،هەروەها لە ٤ ئاداری ١٩٤٦ز سەردانی قازی مەحەمەدی سەرۆك کۆماری کردووە لە بارەگای خۆی و پرسی بارودۆخی کۆمارەکەی لەگەڵدا باسکردووە[٣١].

دەستکەوتەکانی حکومەتی کۆماری کوردستان کاریگەری هەبووە لەسەر گەشەکردنی هەستی نەتەوەیی و سەربەخۆیی لەلایەن هەموو رۆڵەکانی گەلی کورد و لە تەواوی ناوچەکانی کوردستان، لەبەرئەوەی وایان دەبینی کەوا کۆمارەکە نمونەیەکی سەرکەوتووە بۆ قەوارەیەکی کوردی سەربەخۆ و ئەگەری گەشەکردن و پێشکەوتن و فراوانبوونی زیاتری هەیە کە پارچەکانی تری کوردستان بگرێتەوە، بۆیە لەو کاتەدا کۆماری کوردستان ببوە قیبلەی کوردە نەتەوەییەکان، زۆرێك لە نوێنەری رێکخراوە کوردیەکان و کەسایەتیە دیارەکانی کورد لە ناوچە جیا جیاکانی کوردستانی تورکیا و عێراق و سوریا سەردانی شاری مەهابادیان کردووە[٣٢].

هاوکات لەگەڵ هەڵوێستی ئەو کوردە عێراقیانەی کە لە کوردستانی ئێران بوون ، گەلی کورد لە کوردستانی عێراقدا کە لەژێر زەبرو زەنگی حوکمڕانی پاشایەتی دەژیا، بەچاوی پڕ لە ئومێدەوە دەیڕوانییە ئەم کۆمارە، کە هەڵکردنی ئالآی کوردستان لەسەر تەواوی خاکی کوردستان هەڵبکرێت، بەم بۆنەیەشەوە پیرۆزباییان ئاراستەی حزبی دیموکراتی کوردستان کرد کە لە بەشێکیدا هاتووە: "بە هەڵکردنی (الا) ی پیرۆزی کوردستان هیوای هەموو کوردی دونیاتان گەشاندەوە،هەموو چاوەڕێی ئەو رۆژەین کە ئەو الا سەوزو سورو سپی یە بەسەر هەموو خاکی کوردستانی گەورەدا بشەکێتەوە، بە هەمو ژیانمان ئەگۆریەوە بینینی ئەو دیمەنە، دیمەنی ئەو ساتەی الای ازادی کوردستانی تیا هەڵکرا پیرۆزتان بێت...ئێمەش کوردی عراق نە أ کوردی هەمو کوردستانی گەورە یا راستتر هەژارو دیل و رەنجەرانی هەمو دنیا یەککگرن و سەرکەون و سەرفراز بن دنیا بکەن بەو بەهەشتەی خوا بەلێنی داوە بە باوەر پی کەرانی یتر بژی پارتی دیموکراتی کوردستان..."[٣٣].

## باسی دووەم:
## رۆڵی رۆشنبیرانی کوردی عێراق لە دامەزراوە پەروەردەیی و رۆشنبیریەکانی کۆماری کوردستان دا

هەرچەندە کۆماری کوردستان ماوەی تەنها یانزدە مانگ بەردەوام بوو ، ئەو ماوەیەش بە پێوەری کات و مێژوو کورتە ،چونکە بەس نەبوو بۆ جێ بەجێ کردنی بەرنامەی هەردەسەلاتێکی سیاسی ،تەنها بەشێکیش لەو بەرنامەیە ناتوانێ جێبەجێ بکات،بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کۆماری کوردستان زۆرکاری کرد و هەندێك لە ئامانجەکانی کە بریتی بوون لە ئاوات و ئامانجی گەلی کورد بەدیهێنا[٣٤].لایەنی پەروەردە و فێرکردن و رۆشنبیری وەك هەر لایەنێکی گرنگی دەوڵەت، لە بەرنامە گرنگ و پێشینەکانی کۆمار بوون، بەهۆی ئەوەی تا ئەو کات بایەخ بە خوێندن و رۆشنبیری کوردی نەدرابوو، وەمندالانی کوردستان لە خوێندن بە زمانی دایك بێ بەش کرابوون،لە لایەن سەرکردەکانی کۆمارەوە بەرنامە رێژی بۆ بایەخدان و بەرەوپێش بردنی ئەم لایەنە دانرا،رەنگە دانانی وەزارەتێك بەناوی پەروەردە لە کۆی وەزارەتەکان بەلگەیەکی دیاربێت لەم بارەیەوە[٣٥].

شیاوی باسە رۆشنبیرانی کوردی عێراق رۆڵێکی بەرچاویان بینیوە لە دامەزراوە رۆشنبیریەکانی کۆماردا،بەشێك لەو رۆشنبیرانە هەروەك مامۆستا چوونە مەهاباد و لە قوتابخانەکانی وانە یان بە مندالانی کورد دەوتەوە[٣٦].وەزارەتی پەروەردە لە کۆماری کوردستان گرنگی زۆری داوە بەو مامۆستایانەی کەوا لە کوردستانی عێراق هاتبوون لە رێگای پاداشت کردنیان و پێشکەشکردنی سوپاس و پێزانین لە بەرامبەر رۆڵیان لە خزمەتکردنی پەروەردە لە کۆمار کوردستان،ئیدارەی فەرهەنگی کوردستان بۆ پیزانینی ئەم خزمەتە لە

زمانی:(( صدقی – لە لایەن رەئیسی فەرهەنگی مەهاباد)) لە رۆژنامەی کوردستاندا سوپاسی بۆ نوسیون[٢٧]، کەریم زەند ئاماژە بەرۆڵی پیرۆزی مامۆستایانی کورد دەکات کەوا لە کوردستانی عێراق دا هاتبون وەك خۆی وەسفی دەکات کەوا ئەو مامۆستایانە رۆڵی پیرۆزیان لەوانە گوتنەوەی زمانی کوردی لە قوتابخانەکانی کۆماری مەهاباد دەردەکەویّ، وەك پەرۆشیەك لەلای ئەوان بۆ دۆزی گەلەکەیان، وەکو کەریم زەند دەلیّ ئەمانە وەکو مەحەمەد تۆفیق وردی و عوسمان دانیش و جمیل بەهائەدین ئامیدی و جەعفەر شێخ حسن بەرزنجی و ئەحمەد هەولێری و چەندانی تر وانەی زمانی کوردیان دەگوتنەوە و چەندان خولی بەهێزکردنیان بۆ کادیرانی پەروەردەیی لە کۆمار کردۆتەوە، هەتا مەناف کەریمی وەزیری پەروەردەش بەشداری ئەو خولانەی دەکرد[٢٨]. فێرگەی گەلاوێژ یەکەم فێرگەبوو کە دامەزرا و مامۆستایانی کورد وانەی کوردیان تێدا دەگوتەوە[٢٩]. ئەم قوتابخانەیە لەلایەن کەسایەتیەکی شاری مەهاباد دامەزرا، مامۆستایانی باشوور وانەیان تێدا دەگوتەوە وەك وەهابی حەمەد، عەلی ئاغا سلمان بەگی دەرگەلە ،مەغدید نانەکەلی کە لە هەندێك سەرچاوە ناوەکەی بە مەغدید سۆران و لە هەندێکی تریش بە مەغدید مامە هاتووە، لەگەلّ میرحاج ئەحمەد و خەیرولاّ عەبدول کەریم ، هەمزە عەبدوللاّ، لە دیارترین ئەو مامۆستایانەبوون کە منداڵانی کوردیان فێری خوێندن و نوسینی کوردی دەکرد لە مەهاباد[٤٠].

شیاوی باسە هەر لەو میانەیەدا ژمارەیەك مامۆستای تری کورد پەروەر هاتنە شاری مەهاباد، جگە لەوانەی کە لە پێشتر ئامارژەمان پێکرد مەحەمەد تۆفیق وردی کە خەڵکی شاری کۆیە بوو، عوسمان دانیش کە لە سلێمانیەوە هاتبوو هەستان بە کردنەوەی قوتابخانەیەکی شەوانە کە بۆ یەکەم جار خوێنەری

کوردیان بە زمانی کوردی ئاشناکرد ، ئەمەش سەرەتایەکی باش بوو بۆ چەسپاندنی زمان و کەلتوری کوردی و گەشەکردنی[٤١].

حکومەتی کوردستان لێژنەیەکی پەروەردەیی و رۆشنبیری درەستکردبوو بەناوی "هەیئەتی فەرهەنگی کوردستان"بە ئامانجی دانانی بەرنامەی چاکسازی لە بواری پەروەردەیی لە قوتابخانەکان، بە جۆرێك بگونجێت لەگەڵ بارودۆخی نوێی هەرێمی کوردستانی ، لێژنەکە چەندان بریاری گرنگی سەبارەت بەو بابەتە دەرکرد ، لە نێوانیشیاندا دامەزراندنی ژمارەیەك کەسایەتی خاوەن توانا و پسپۆر بۆ سەرپەرشتی کردنی قوتابخانە و پرۆگرامی خوێندن، هەروەها لێژنەیەکی هاوبەشی دروستکرد لە فەرمانبەرانی فەرمانگەکانی شارەوانی و پەروەردە بۆ سەرپەرشتی کردنی هەتیوان و هەژاران و بواری بۆ رەخساندن بۆ ئەوەی بچنە بەر خوێندن،خوێندنی ئێوارانی رەخساندبوو بۆ ئەوانەی دەرفەتی خوێندنیان لە کیس چوو بوو لە رابردوو، هەروەها چەندان قوتابخانەی تازەیان کردەوە بۆ کوران وکچان، ئەو قوتابخانانەش تەنها لە مەهاباد نەبوو بەڵکو شارەکانی تریشی گرتبوە[٤٢].کەریم زەند کە یەکێك بووە لە کادیرانی پەروەردەیی لە ژمارەیەك لە قوتابخانەکانی کۆماری کوردستان لەو کاتەدا دەلێت:بەهۆی نەبوونی کتێب و پرۆگرامی خوێندنی پێویست لە قوتابخانەکانی کوردستانی ئێران، هەوڵماندا سوود لەو کتێب و پرۆگرامەی خوێندن وەربگرین کە لە قوتابخانەکانی کوردستانی عێراق دا هەبوون[٤٣].شایانی باسە مامۆستاکان لە سەرەتادا کتێبی فارسیان وەردەگێرا بۆ سەر زمانی کوردی بۆ ئەوەی لە قوتابخانەکاندا وانەی لەسەر بخوێنرێت ، تاوەکو کۆمەلێك کتێب لە باشووری کوردستانەوە هێنرا بۆ ئەوەی لە قوتابخانەکاندا وانەی لەسەر بخوێنرێت[٤٤].

کۆمەڵـەی ژیانـەوەی کوردسـتان و دواتـریش حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتان دەمێك بوو بەدوای کرینی چاپخانەیەك بوون لە یـەکێتی سـۆڤێت ، ئـەو هـەوڵیان دواتر سەرکەوتوو بوو پاش ئەوەی یەکێتی سۆڤێت دوو دەزگای چاپی بە حیزبی دیموکراتی کوردستان فرۆشت ، یەکەم دەزگا بـەناوی چاپخانەی کوردستان لـە مەهاباد دانرا کە چەند کارمەندێکی لە کوردەکـانی باشووری کوردستان بـوون ، دواتریش دەزگایەکی چاپیان لە بۆکان خستە کار ، هاتنی ئەو دەزگای چاپانە بۆ کوردستان بەرادەیەکی زۆر گەشەیان بە بواری فەرهـەنگی و رۆشـنبیری ناوچـەی موکریـان دا، دوای دانـانی چـاپخانە لـە مـەهاباد، حیزبـی دیمـوکرات گۆڤـاری کوردسـتان * و رۆژنامـەی کوردسـتان لـە مـەهاباد و گۆڤـاری هەلالـە و گڕوگـاڵی مندالان و هاواری کوردی لە چاپخانەی بۆکان چاپ دەکرد [٤٥].

هەروەك لە پێشتر ئاماژەمان پێکرد لـە مـانگی تـەمووز ئـەو چـاپخانەی کـەوا سـۆڤێتیەکان بـە کۆمـاری کوردسـتانیان بەخـشی بـوو خـەریکی دەرکـردن و بڵاوکردنەوەی رۆژنامەی کوردستان و چەندان گۆڤاری هەفتانە و مانگانەی وەکـو نیشتمان * و هاوار * و ئاگر و ئاوات * و هەلاڵە بـوو وە بەشـێوەیەکی بـەرفراوان لـە کوردستانی عێراق و ئێـران بڵاوبوونـەوە [٤٦].هەنـدێك لـە نوسـەرو رۆژنامـەنوس و شـاعیری باشـووری کوردسـتان کـە لـە پێـشتریش ناویـان هـاتووە دوای هـەواڵی بیستنی دامەزرانـدنی کۆمارەکـە بـەرەو رۆژهـەلاتی کوردسـتان بەرێکـەوتن ، بـۆ ئەوەی رۆڵـی نیـشتمانی خۆیـان بگێـرن ئەمانـەش بەسـەر دوو دەسـتەدا دابـەش دەبن:

دەستەی یەکەم ، ئەوانەی چوونە رۆژهەلاتی کوردستان و رۆڵیان بینی وەکـو سەعید ناکام و قانیع و عوسمان دانیش و عەبدوللاّ سۆفی کەریم سەراج و کەریم زەند و یەحیا جورستانی و ئەنوەر دڵسۆز و مەغدید سۆران [٤٧]،مەحەمـەد تۆفیـق

وردی* کە ئەمیش وەکو هەڤاڵەکانی یەکێك بووە لە نووسەرە دیارەکانی کۆماری کوردستان و چەندین ووتارو هۆنراوە و چیرۆکی لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاوکردۆتەوە، لەهەمان کات سروودێکی شۆرشگێری بەناوی (ئەی رەقیب) لەلایەن یونس رەئوف"دڵدار " لە شاری مەهاباد دانرا و بووە مارشی نەتەوەیی کۆمارەکە(٤٨).

دەستەی دووەم، ئەو هۆزانڤان و نوسەرانە بوون کە بەرهەمی خۆیان بۆ کۆمار رەوانە کردووە ، هاوسۆزی و پشتگیری خۆیان دەربریوە ، لە وانەش فانی مەمەند ئاغای کوڕی رەسول ئاغا(١٩١٠-١٩٧٣) هۆنراوەیەکی درێژی بۆ کۆمار رەوانە کردووە هۆنراوەکەش بە ناونیشانی (دەلێم بڵێم و ناوێرم)بوو، کە باس لە یەکگرتنی کورد و دوورکەوتنەوە لە زوڵم و زۆرداری و تەفرەقەیی دەکات بۆ بەگژداچونەوەی داگیرکەران(٤٩).

شیاوی باسە نوسەرانی کوردی باشووری کوردستان ، ئەو بەرهەمانەی کەوا بڵاویان دەکردەوە لە رۆژنامەی کوردستان و هەفتەنامەوگۆڤارەکاندا زیاتر هەوڵیان ئەدا کەوا هەستی نیشتمان پەروەری لەناو هەست و نەستی تاکی کوردی دروست بکەن و کارەسات و نەهامەتیەکانی کورد بخەنەروو کە بەدرێژایی مێژووی کورد رووبەرووی خاکی کوردستان بۆتەوە ، لەوانەش مەحەمەد مەحمود(شەهید مەحەمەد قودسی)،مەحەمەد توفیق وردی،عەبدولقادر ئەحمەد،یحیا چروستانی،ئەنوەر دلسۆز،شوان، میرزا مەحەمەد ئەمین مەنگوری، قانع(٥٠).لە نێوان ئەو نوسەرانەش مەغدید سۆران* کە خەڵکی شاری هەولێرە و یەکێك بووە لە کارمەندانی چاپخانەی کوردستان، لە ژمارە (٦،٧)رۆژنامەی کوردستان کە لەساڵی ١٩٤٦زدەرچووە لە لاپەرەی ٩تاکو١١لە ووتارێکدا بە ناونیشانی(جوتیاری کورد چۆن ئەژێ و چی ئەوێ؟)نوسیویەتی(( حکومەت دا

ئەمەزریٚ بۆ رِهەبەری و رِزگارکردنی میللەت نەك بۆ تێرکردنـی چـەند کەسـانێك و لەناوبردنی ئەو تەبەقەی کە گیانی میللەتی لیٚ پەیا ئەبیٚ، راستە حکومەتێکی کـە ئالـەت بـیٚ بەدەسـت چـەند کەسـانێکەوە یـا بجولێنــەوە بـە پەنجـەی بـەکریٚ گیراوەکان ئەوە حکومەتی میللەت نیـە بـەڵکو رِۆژ بـە رِۆژ میللـەت بـەرەو نـەمان ئەبا بەلاَم حکومەتی میللی کوردستان حکومەتێکە لەبۆ گەل بەکاردیٚ))[٥١].

دەرکردنی کتێبی سیاسـی و کۆمەلاَیەتی بە زمانی کوردی یەکێکی تربـوو لـە نەخشە و پلانە کەللتوری و سیاسیە گرنگەکانی حکومەتی کوردستان ، دواتر کرا بە چاپکردنی کتێبی قوتابخانە بۆ مندالان، هەروەها ناوەندی ئـەدەبی بـە زمـانی کرمانجی گواسترایەوە بۆ مەهاباد[٥٢].

جگە لەمانەش ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیرانی کورد لـە کوردسـتانی عێـراق دا کـە دەرچـووی کۆلێـژو پـەیمانگاکان بـوون و پـسپۆریان لـە بـوارە جیاجیاکـادا بەدەسـت هێنـابوو لـە ئامادەباشـی ئـەوەدابوون کـە پەیوەنـدی بـە مـەهابادەوە بکـەن، بـەلاَم دەرفـەتیان بـۆ نەرەخسا ، بـەهۆی کـەمی مـاوەی فـەرمانرەوایی کۆمارە[٥٣].

## باسی سێیەم:

## رۆڵی کوردە عێراقیەکان لە وەزارەتی هێزی دیموکراتی کوردستان

دوای دامەزراندنی حکومەتی کوردستان ، قازی مەحەمەد خێـرا دەسـتی کـرد بە پێکهێنانی هێزێکی سەربازی بـۆ بـەرگریکردن لـە حکومەت،بـەم بۆنەیەشـەوە (وەزارەتی کاروبـاری پێـشمەرگایەتی)کـە هەنـدێك جـار بـە (وەزارەتـی جـەنگ)و هەنجیٚ جار بە (وەزارەتی هێزی دیموکراتی کوردستان)ناونراوە.مەحەمەد حسێن خانی سەیفی قازی بە پلەی جەنەراڵ بو بە وەزیری جەنگ،پلەی ئەفسەرەکان و

جلوبەرگیشیان هی لەشکری روسی بو،بێجگە لەوە لەشکری کوردستان لە چەند هێزێکی سەرەکی پێك هاتبوو جگە لە هێزەکانی مەهاباد کە ژمارەیان دەگەیشتە هەزاران چەکدار،هێزی شکاك بە سەرۆکایەتی عمرخان شکاك و هێزی بانە بە سەرکردایەتی حەمە رەشید خان و هێزی بارزان بە سەرکردایەتی مەلا مستەفای بارزانی،بێجگە لەوانەی ناوی خۆیان بۆ مەشق ناونوس کردبوو[٥٤].دوای پێکهێنانی ئەو هێزە لە مەهاباد و ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان، سەرکردایەتی ئەرکانی هێزی ناوەندی حیزبی دیموکرات لە نامەیەکدا بە ژمارە ٣٧لە ١٣٢٤/١١/١٥هـ ناوە سەربازیەکانی سوپای ئێرانی لە کۆماردا گۆری و ناوی کوردی بۆ هەریەك لە بەشەکان و پلەدارەکان دانا، رۆژنامەی کوردستان بریاری گۆرینی ئەو ناوانەی بلأوکردەوە لە ژمارە ٣٠یلە بەرواری ١٣٢٤/١١/١٥هـ، بە شێوەیەك ناوی سەربازی گۆری بۆ پێشمەرگە، سپاهی ئێرانی گۆریی بۆ هێز ، لەگەڵ چەندان ناوی تری سەربازی کە وەرگێردانە سەر زمانی کوردی[٥٥].

سوپای مەهاباد لە سەرەتای دامەزراندنیدا لە نزیکەی حەفتا ئەفسەر پێکهاتبوو، چەند یاریدەرێکیان هەبوو بە پلەی یاریدەدەری ئەفسەر ،نزیکەی هەزارو دووسەد سەربازیان لەژێردەست دابوو، لەگەڵ هێزەکانی مەهاباد بارزانیەکانیش ١٢ ئەفسەری لاوی سوپای عێراقی هەبوو کە یاوەری مەلا مستەفای بارزانی بوون یاخود لەدوای دامەزراندنی کۆماری کوردستان پەیوەندیان پێوەکرد ، هەریەك لە عەقید مستەفا خۆشناو و نەقیب مەحەمەد مەحمود قودسی [٥٦]، سید عزیزی شەمزینی،عزەت عەبدولعەزیز،بەکر عەبدولکەریم حەوێزی،خەیروللا عەبدولکەریم،نوری ئەحمەد تەها، جەلال ئەمین بەگ،مەحەمەد سالح.ئەمانە لە دەرچوانی زانستگای جەنگی عێراق بون،قازی مەحەمەد داوای لە مەلا مستەفا کرد بارزانیەکان وەکو هێزێکی رێکو پێك لە

ریزی هێزی دیموکرات رێك بخات و کاروباریان پێ بسپێرێ، لە سەرەتای نیساندا لەسەر داوای بارزانی زیاتر لە هەزار بارزانی بۆ پێشمەرگایەتی بانگ کران، لە چوار لقدا رێکخران،چەکی نوێیان پێدرا، پاش مەشق پێکردنێکی کورت نێردرانە بەرەی سەقز بۆ پاراستنی سنوری حکومەتی کوردستان لە هێرشی چاوەروانکراوی ئەرتەشی ئێران[٥٧].

شیاوی باسە هەچەندە پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە پەیرەو بەتایبەتی لە بەندی شەشەمی پرۆگرامیدا هیچ مەرامێکی دوژمنکارانەی نەبوو،وەهەلۆیستی ئۆپۆزسیۆنی لەبەرامبەر حکومەتی ئێران وەرنەگرێ، بەلأم بوونی مەلا مستەفای بارزانی و یەکگرتنی لەسەر خاکی کوردستانی ئێران بووە بیانووەك بۆ دەسەلأتدارانی ئێرانی بۆ گومانکردن بە بوونی مەرامی جیابوونەوە لەلای کوردەکانی ئێران[٥٨].

لە سەرەتای مانگی نیساندا کوردە عێراقیەکان وەکو هێزێکی نیزامی لە ریزی هێزەکانی کۆماردا رێکخران،زیاتر لە هەزار جەنگاوەر بانگەشەکران کە تەمەنیان لە سنووری نێوان(١٥ تاکو١٦)سالێدا بوون،ئەم هێزەش بۆ چوار بەش دابەشکران و ئەفسەرە کوردە عێراقیەکان کە دەرچووی زانستگای جەنگی عێراقی بوون دانران بە سەرکردەی هەریەکێك لەم چوار بەشە[٥٩].دواتر چەکدار کران و ١٥٠٠ پارچە چەکیان پێدرا لە هەموو جۆرەکانی چەك و دابەشکران بۆ سەر سێ فەوج و بەرنامەی هاوچەرخی مەشق و راهێنانیان بۆ دانرا، ١٥٠ پێشمەرگەیان کرانە "حەرەس شەرەف" بۆ سەرۆکی کۆمار[٦٠].

وەزارەتی هێز(جەنگ) دەستی کرد بەرێکخستنی نوێ و هاوچەرخی هێزەکانی تر و دانانی رێوشوێنی راهێنان و مەشق پێکردن،هێشتا بریاری سەربازگیری نەدا بو ،بەلکو پێشمەرگایەتی کارێکی ئارەزوومەندانە بوو[٦١]. هەریەك لە عەقید

مستەفا خۆشناو و نەقیب مەحەمەد مەحمود قودسی توانایەکی باشیان نیشاندا لە راهێنانی سەربازەکان لەسەر شێوازی هاوچەرخی عەسکەری[٦٢]. کوردە عێراقیە بەشداربووەکان لە ریزی لەشکری کوردستان لە بەرەی سەقز بەم جۆرە بوو، هێزەکانی بارزانی بە سەرکردایەتی مەلا مستەفای بارزانی هەزارو دوو سەد پێشمەرگەی پیادە بوون، هێزەکانی بارزانی بەسەرکردایەتی شێخ ئەحمەدی بارزانی لە بەرەی نەبوون نۆ سەد پێشمەرگەی پیادە بوون[٦٣].

ئەفسەرە کوردە عێراقیەکان ئەگەر چی کەسیان بارزانی نەبوون، بەلاّم بە سەرکردەی لقەکانی هێزی بارزانیان دانران ، میرحاج ئەحمەد، بەکر عەبدولکەریم حەوێزی ، مستەفا خۆشناو، نوری ئەحمەد تەها کە چوار ئەفسەری دەرچوی زانستگا جەنگیەکانی عێراقی بون ، هەریەکەیان بوو بە سەرکردەی یەکێ لەم لقانە، ئەفسەرەکانی تر هەندێکیان لەگەڵ مەلا مستەفا خۆی وەکو ( هەیئەتی ئەرکانی هێزی بارزانیان)مانەوە، هەندێکیشیان بۆ کاروباری مەشق کەڵکیان لێ وەرگرتن، لەگەڵ ئەمانیش چەند کەسێ لە تێکۆشەرە ئازاکانی بارزانیەکان پلەی پێشمەرگایەتیان درایەوکران بە فەرماندەی چلەکانی ئەم چوار لقە وەکو مەحەمەد ئەمین میرخان ، مامەند مەسیح، فارس کانی بوگی ، سعید وەلی بەگ ، خۆشەوی خەلیل،مستەفا جانگیر، صالح کانیالنجی، حیدربەگ عارف، وەهاب مەحەمەد عەلی ئاغای رواندوزی، تاکو ئەوکاتەی حکومەتی کوردستان بریاری چۆلکردنی رێگای پێشکەوتنی ئەرتەشی شاهنشاهی ئێرانی دا ، ئەم هێزە بربرەی پشتی هێزی پارێزگاری سنووری کوردستان بوو لە هێرشی هێزە چەکدارەکانی ئێران[٦٤].

فەرماندەو پێشمەرگەکانی ئەو هێزە توانیبویان بە ئەزموون و لە خۆبوردویی خۆیان سنوری کوردستانی رزگارکراو لە بەرامبەر هێرشی نیزامی ئێراندا نەك هەر

بپارێزن،بەڵکوتواناى ئەوەشیان هەبوو شارى سەقزو ناوچەکانى تریش لە ئەرتەشى شاهنشاهى ئێران پاك بکەنەوە و رێگا بۆ رزگارکردنى مەڵبەندى سنە خۆش بکەن، بارزانیش دواى رێکخستنى هێزى پێشمەرگەو لە ئەستۆ گرتنى سەرکردایەتى"ئەرکانى هێزى بارزانیەکان" بەو بۆنەیەوە لە ووتارەکەیدا بە توندى هێرشى بردە سەر سیاسەتى تورکیاو عێراق کە لەو کاتیدا نوێنەرانى وەزارەتى دەرەوەیان لە ئەنقەرە پیلانى تێکدانى کۆمارى کوردستانیان پێکەوە دادەرشت و دەڵێت"ئەوە شەرەفێکى زۆر گەورەیە کە وەك پێشمەرگەیەك لە شۆرشى ئازادیدا بەشداربم و شەرەفێکى زۆرگەورەترم وەرگرت کە هێزى ئازادى سەرکردەیى خۆى دامێ بۆ پارێزگارى کوردستان،ئەى جەوانانى کورد پەیمانتان دەدەمێ کە هەتا دوا تنۆکى خوێنم بۆ ئازادیتان ببەخشم، بۆ ئازادى گەلى کوردمان،وەکو پێشمەرگەیەك ئامادەم بۆ هەموو داوایەکى پێشەواى کوردستان و هێنانەدى ئامانجى مەزنى دیموکراتى با هەموو پێکەوە بە یەك دەنگ بلێن بژى حکومەتى کوردستان و پێشەواى موعەزەم،بژى شۆرشى بەربەرەکانى ئیستعماروکۆنەپەرستى[٦٥].

لە مانگى ئادار نەقیب سەلاحەدین کازمۆف لە سوپاى سۆڤێتى گەیشتە مەهاباد بۆ یارمەتیدان و هاوکاریکردنى حکومەتى کوردستان بۆ رێکخستنى سوپاى نیشتمانى کوردى، دواى پەیوەست بوونى هێزى پێشمەرگەى بارزانیەکان، حکومەتى کوردستان گۆرانکارى زۆرى بەسەر رێکخراوى پێشمەرگە لە مەهاباد و راکێشانى پێشمەرگەى خێلەکانى لایەنگرى کۆمارى کوردستان و حیزبى دیموکرات هێناو چوار ژەنەراڵى بۆ کۆمارى کوردستان دانا[٦٦].لە دوا رۆژى ئادار رۆژنامەى کوردستان دامەزراندنى چوار ژەنەراڵى کوردى بلاوکردەوە کە بریتى بوون لە مەحەمەد حسین سەیفى قازى،عومەر خانى شکاك،حەمە

رەشید خانی بانە،مەلا مستەفای بارزانی، هەندێکیش لە ئەفسەرە عێراقیەکان لەو سوپایە پلەی عەقید یان وەرگرت [٦٧].

سوپای بارزانیەکان لە ناو کۆماری کوردستان لە کاتی مەشق کردندا شێوازێکی مەشقی عێراقیانەیان دەنواند، بەڵام هەوڵ دەدرا لە کاتی مەشق کردندا جیاکاریەك بکرێت و شێوازێکی مەشقی کوردانەیان پێ ببەخشرێت، بە جۆرێك چەکەکانیان لەسەر شانی ڕاست دابنێن، بەکر عەبدولکەریم حەوێزی و جەلال ئەمین و خەیروللا عەبدولکەریم مەشق پێکەری ئەو سوپایەبوون، لە میانەی ئەو چەند رۆژەی مەشقدا زیاتر لە سەدو پەنجا پێشمەرگەی بارزانی بەباشی لەسەر شێوازی نیزامی راهێنران، لەکاتی هاتنی قازی مەحەمەد بە یاوەری مەلا مستەفای بارزانی بۆ گۆرەپانی چوارچرا لە یەکەم رۆژی دامەزراندنی کۆماردا ئەو سوپا مەشق پێکراوەی بارزانیەکان سڵاوی کۆماریان پێشکەش بە قازی کرد [٦٨].قازی مەحەمەدیش بە شانازی و سەربەرزی کوردی زانیون کاتێك دەڵێت(( سەرمان بڵندە پێتان، جێی شانازیمانن،.......،سەد سوپاس بۆ ئێوەو سەرۆکتان مەلا مستەفای بەرێز )) [٦٩]. قازی مەحەمەد پێشنیاری کرد کە حەوت سەد تفەنگ بۆ بارزانیەکان ئامادەبکرێت و پێیان بدرێت، قازی مەبەستی بوو یەکەمین هێزی نیزامی لە کوردەکانی بارزانی پێکبهێنرێت، ئامانجەکەشی خۆرزگارکردن بوو لە هێزی چەکداری خێڵەکان،بەم جۆرەش هێزی بارزانیەکان بوونە هەوێنی سوپای کوردستان لە مەهاباد [٧٠].

شیاوی باسە دوای راگەیاندنی کۆماری مەهاباد، حکومەتی کوردستان روبەروی مەترسی هێزەکانی ئێران دەبێتەوە ، کە ئامانجیان گەراندنەوەی دەسەلاتیمەرکەزیە بۆ مەهابادو تەواوی ناوچەکانی تری ئێران،بۆیە هێزێکی زۆر کۆکرایەوە بۆ پەلاماردانی کۆماری کوردستان [٧١].لەدەرەنجامی ئەو هەولانەی

سوپای ئێرانی، لەشکری کوردستانیش لە پێشەنگیشیاندا پێشمەرگە بارزانیەکانی کەوا لە چەند یەکەیەکی نیزامی رێکخرابوون بۆ رووبەرووبونەوەو پارستنی کۆمار لەبەرەی سەقزدا سەنگەریان گرت ، لەیەکەمین رووبەرووبونەوەی نێوان دەوڵەتی ئێران و هێزەکانی کۆمار جەنگێکی خوێناوی لە ٢٩ نیسانی ١٩٤٦ز روویدا ، ئەو جەنگە ناسراوە بە جەنگی قاراوا، لەم شەڕەدا سوپای کوردستان سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا(٧٢).دوای کۆتایی هاتنی شەڕەکە لە بەرژەوەندی کۆماری کوردستان قازی مەحەمەد و مستەفا بارزانی و مەحەمەد سەیف قازی سەردانی بەرەی شەڕیانکرد، قازی مەحەمەد سوپاسگوزاری و دەستخۆشی لە پێشمەرگەکان کرد، دواتریش ئاماژەی بەو سەرکەوتنە گەورەی هێزە بارزانیەکان کردووە کاتێك سەردانی تەبرێز دەکات لە ٥ مایسی ١٩٤٦ز کە چاوی دەکەوێت بە سەرۆك عەشیرەتەکانی مەنگورومامش و زرزاو گەورکو دیبوکری و قەرەپاپاخ و دەڵێت"مستەفای بارزانی کە خەبات دەکات لە پێناو سەربەخۆیی کوردستانی گەورە، ئێستا مایەی سەربڵندی و شانازی هەموو رۆڵەکانی گەلی کوردە،وەبارزانیەکانیش شارەزاییەکی زۆر باشیان لە شەرکردن هەیە لە پرۆسە جەنگیەکاندا، بۆیە کاتێك هێزەکانی ئێرانی کە ژمارەیان ٧٠٠سەرباز بوو هەوڵیاندا بەرەو گوندی(سەر) بێن لە بەرەی سەقز بەمەبەستی داگیرکردنی ، هێزە جەنگاوەرە بارزانیەکان رێگایان لێ گرتن کە ژمارەیان تەنها ١٧٠ پێشمەرگەبوون، لەو شەرەدا توانیان ١١٠سەربازی ئێرانی بکوژن و ٤٠ ی تریان بەدیل بگرن، بەبێ ئەوەی هێزە بارزانیەکان هیچ زەرەروزیانێکیان هەبێت(٧٣).

شیاوی باسە لە بەردەوامی هێرش و پەلامارەکانی هێزە ئێرانیەکان بۆ سەرناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان ، لە ١٥ حوزەیرانی ١٩٤٦ هێرشێکی

گەورەیان کردە سەر کەرتی فەوجی دووەمی بارزانییەکان لە "مامە شا" ، ئەم شەڕە بە دووەم شەڕی بارزانییەکان دادەنرێت بۆ پارێزگاریکردن لە کۆماری کوردستان،بەلام ئێرانیەکان لەو شەڕەشدا سەرکەوتوو نەبوون،لە نوێژی هەینی ڕۆژی ٢٠/٦/١٩٤٦ پێشەوا وتارێکی پێشکەش دەکات و دەقی ووتارەکە لە ژمارەی ٦٢ ڕۆژنامەی کوردستاندا بلاوکراوەتەوە کاتێك ئاماژە بۆ شەڕی ١٥/٦/١٩٤٦ دەکات و دەلێت"ئێران نزیکەی سێ هەزار سەربازی پیادەی ناردبووە سەر مامەشە و بە هەشت تۆپ و دوو فرۆکە و دوو تانکەوە پشتیوانی دەکردن، فەرماندەی ئێمە لە مامەشە مستەفا خۆشناو لە هێرشی سوپای ئێران .......لە سەربازەکان پێنج سەد کوژراو و دوسەد کەسیان بریندار و دووتانك و دوو فرۆکەیان سوتا و شکاوە"[٧٤]، دواتر بەهۆی ئەو شکستە گەورانەوە ئێرانیەکان بە ناچاری پەنایان برد بۆ دانوستاندن لەگەڵ سەرکردەکانی کورد بۆ گەیشتن بەرێکەوتنێك لە پێناو راوەستاندنی شەڕ[٧٥].بۆیە ژەنەراڵێکی ئێرانی بەناوی "عەلی رزم ئارا" گەیشتە گوندی سەرا لە ١٦ حوزەیران ، لەدوای کۆتای هاتنی شەڕ بە ماوەی تەنها یەك ڕۆژ و لەگەڵ قازی مەحەمەد و مستەفا بارزانی و حەمە رەشید خانی بانە و عومەر خانی شکاك هەردوولایەن ڕێکەوتن لەسەر راگرتنی هەموو پرۆسە سەربازیەکانی نێوانیان، هەروەها وەك ڕێزلێنانێك بۆ ڕۆڵی قارەمانانەی پێشمەرگەکانی بارزانی کە عەقید مستەفا خۆشناو سەرکردایەتی دەکردن لە شەڕی مامە شا ، قازی مەحەمەد مەدالیایی ئازایەتی بەخشی بە یازدە پێشمەرگە لە هێزی بارزانیەکان، ژەنەراڵ عەلی رزم ئاراش لە چەندان گوتنی بۆ ڕۆژنامەکانی ئێرانی ئاماژەی کرد بە ڕۆڵ وتوانای سەربازی مەلا مستەفای بارزانی و جەنگاوەرەکانی کردووە کاتێك دەلێت"ئەوانەی کەوا چیا دەخۆنەوە لە پشت مێزەکانیان ، هەست بەتوانا و لێهاتویی بارزانی ناکەن لە

شەردا،سوپای ئێرانی لە رۆژی دامەزراندنیەوە تاکو ئەمڕۆ رووبەرووی هیچ جەنگاوەرێکی قارەمانی لەو شێوە نەبۆتەوە"(٧٦).

شیاوی باسە بە تێپەربوونی کات فشارەکان لەسەر کۆماری کوردستان زیاتر دەبوون ، ئەمجارە جگە لە فشاری حکومەتی ئێرانی،دامەزراوە کوردیەکەی مەهاباد فشاری ئەورووپیشی کەوتە سەری، بەجۆرێك کاربەدەستە ئینگلیزەکان بە ئاشکرا بلاویان کردەوە کە جولانەوەی دیموکراتی کوردستانی ئێران هەڕەشە لە ئاسایشی عێراق و هەموو وولاتانی رۆژهەلاتی ناوەراست دەکات، رۆژنامەی "دێلی تەلەگراف"لەم بارەیەوە نوسیویەتی"کوردەکانی عێراق زۆر بە وردی گرنگی بە رووداوەکانی ئێران دەدەن، گومانی تێدا نی یە کە هەڵایسانی جولانەوەیەکی کوردی لە عێراق دا زادەی سەرکەوتنی جولانەوەی شۆرشگێرانەی کوردستانی ئێران دەبێ،ئەگەر شۆرش لە کوردستانی عێراقدا هەڵبگیرسێ، ئەو شۆرشە هەرەشە لە کارگە و چاڵە نەوتیەکانی کەرکوك و بۆریی نەوتی حەیفا و تەرابلس دەکات "(٧٧).

شیاوی باسە لە سەرەنجامی هەموو ئەو دوژمنانەی کەوا لە دژی جولانەوەی دیموکراتی لە ئێران یەکیان گرت بۆ لەناوبردنی هەوڵی ئازادیخوازی کورد لە ئێران، ئەوەبوو لە ئەنجام رۆژە دژوارە چاوەروانکراوەکان هاتن، قەوام سەلتەنەت رۆژی ٢١/١١/ ١٩٤٦ ڕایگەیاند کە بۆ دابینکردنی ئارامیی و ئاسایش لە کاتی پرۆسەی هەڵبژاردنەکانی ئێرانی کە لە ١٩٤٦/١٢/٧ دا ئەنجام ئەدرێت، جووله بە هێزەکانی دەکات بۆ پاراستنی ئاسایش ، بەبێ جیاوازی لە هەموو ئێراندا(٧٨).

لە دیسێمبەری ١٩٤٦ سوپای ئێران بە سەرکردایەتی پسپۆرو ئەفسەرانی ئەمەریکی هێرشی کردە سەر کوردستان،حکومەتی کوردستانیش ئاگاداری

سەرجەم هێزی پێشمەرگەی کوردستانی کردەوە کە نابێ ڕووبەڕووی هێزەکانی ئێران ببنەوە و شەڕیان لەگەڵدا بکەن، هێرشی سوپای ئێرانی بۆ سەر کوردستان دەستی پێکردو پێشەوا قازی مەحەمەدو سەیفی قازی مەحەمەد حسێن خانی وەزیری بەرگری کوردستان خۆیان تەسلیم بە هێزەکانی ئێرانی کرد بەبێ شەڕ[٧٩]. پێشمەرگەکانی کوردستانی عێراق بە فەرمانی مەلا مستەفای بارزانی خۆیان بەدەستەوە نەدا و دژی چەتە دەرەبەگەکانی کوردو ئازەرو سوپای ئێران شەڕیان کرد، ئەوان بە قسەی قازی مەحەمەدیان نەکرد و چەکیان دانەنا، دواتر ناچاربوون ڕووبەڕووی سوپاکانی عێراق و تورکیاش ببنەوە کە بۆ هاریکاری سوپای ئێرانی هاتبوونە سەر سنوور، پێشمەرگەکانی کوردستانی عێراق شەڕی مان و نەمانیان کرد ، بەشێك لە هێزی پێشمەرگەی کوردستانی عێراق کەوا لەلایەن مەلا مستەفای بارزانییەوە سەرکردایەتی دەکران ڕوویانکردە یەکێتی سۆڤێت و دوای تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆر بۆ ئەو دیوی سنوور پەڕینەوە لە بەهاری ١٩٤٧ز، یەکێتی سۆڤێتیش پێشمەرگەکانی بە پەنابەری سیاسی وەرگرت، هاوزەمان لەگەڵ هێرشی ئێرانیەکان بۆسەر دیموکراتیخوازانی کوردستان لە مەهاباد،هێزە کۆنەپەرستە عێراقیەکانیش هێرشێکی درندانەیان کردە سەر گەلی کورد و بەشداربوانی جولانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان، تێکۆشەرە کوردەکان توشی ئازاردان و ڕاونان بوون، بەشێکی زۆریان زیندانی کران یاخود بۆ ناوچەکانی خوارووی عێراق دوورخرانەوە، عیزەت عەبدولعەزیز، مستەفا خۆشناو، خێروللا عەبدولکەریم، مەحەمەد مەحمود قودسی، لە لایەن کاربەدەستانی عێراق گیران، لە ١٩ حوزەیرانی ١٩٤٧ز هەرچواریان لە سێدارە دران[٨٠].

لە ١٥ کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ز هێزەکانی ئێرانی بێ هیچ بەرگرییەك گەیشتنە شاری مەهاباد، بەم جۆرەش کۆماری کوردستانی دیموکراتی رووخا، دواتر حکومەتی ئێرانی پایەکانی کۆمارەکەی بەند کردن،دوای دادگایکردنێکی ناعادیلانە قازی مەحەمەد حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا سەپێنرا، هەروەها سزای لە سێدارەدان بەسەر سەیف قازی وەزیری بەرگریی سەپێنرا، سزای لە سێدارەدانەکە لە بەرەبەیانی رۆژی ٣١ مارتی ١٩٤٧ز لە گۆرەپانی چوارچرا لە ناوجەرگەی مەهاباد بەسەر قازی مەحەمەدو هاوەڵەکانی جێبەجێ کرا[٨١].

## دەرەنجام

دوای وردبوونەوە لە بەشێکی زۆری رووداوەکان و تێرامان لە رۆڵی کوردە عێراقیەکان لە ماوەی حوکومرانی حکومەتی دیموکراتی کوردستان لە مەهاباد،لە کۆتایی گەیشتمە چەند ئەنجامێك کە بەچەند خالێك کورتیان دەکەمەوە :

١- حکومەتی کوردستان لە مەهاباد وێرای ئەوەی کە هیچ پشتیوانیەکی دەرەکی لەگەڵدا نەبووە ، هاوکات هەموو هێزە کوردەکانیش پشتگیریان لەو کۆمارە نەکردووە بە تایبەتیش لەناو خودی کوردەکانی ئێران،بۆیە رۆڵی کوردە عێراقیەکان لە دامەزراندن و پێکهێنانی دامەزراوە کارگێری و سیاسی و عەسکەری و رۆشنبیری و پەروەردەییەکان زۆر گرنگ بوون بۆ بەردەوامی دان بە پرۆسەی حوکمرانی کردنی کوردستان .

٢- یەکریزی و تەبایی و نیشتمان پەروەری و دڵسۆزی کوردەکانی عێراق بۆ دۆزەکەیان گەیشتبووە ئاستێك کەوا رووبەرووی دوو دەوڵەتی بەهێزی ناوچەکە ببنەوە لە یەك کاتدا،کە عێراق و ئێران بوون ، ئەو کوردانەی لە مەهاباد بوون خەباتی ئاشکرایان دەکرد بۆ سەرکەوتنی حکومەتی کوردستان، ئەوانەشی کەوا

لە عێراق بوون بە نهێنی پشتگیری و پشتیوانیان لە حکومەتی کوردستان دەکرد بە چەندان شێوازی جیاواز جیاوازلە یەکتری.

٣-بەشێك لەو میراتەی کە لە حکومەتی دیموکراتی کوردستان لە مەهابادەوە بۆ گەلی کورد لە هەرچوار پارچەی کوردستان بە جێ ماوە ، لە داهێنانی کوردانی عێراق بووە لەوانەش سروودی "ئەی رەقیب"ی شاعێری گەورەی کورد"دلدار" بوو ، کە لە کاتی دامەزراندنی کۆماری کوردستان لەدایك بوو ، ئێستاکەش هەموو کورد بە دروشمی نەتەوەیی خۆی دەزانێت.

٤- ئالای کوردستان کە پیرۆزترین و بایەخدارترین ئەمانەتی مەهاباد بوو درایە مەلا مستەفای بارزانی و ئەرکی پاراستن و پارێزگاریکرنی خرایە ئەستۆی خۆی و کوردانی عێراق ،ئەمەش لە ئەنجامی متمانەی بەهێزی قازی مەحەمەد بوو لەسەر قارەمانیەتی و ئازایەتی و ئاستی دڵسۆزی و نیشتمانپەروەری و نەتەوەپەرستی کوردانی عێراق چەکەرەی کردبوو.

٥- وولاتێکی زلهێزی وەکو بەریتانیا و ژەنەراڵە سەربازیەکانی ئێرانی شاهێد عەیانی ئازایەتی و قارەمانیەتی پێشمەرگەکانی کوردی عێراق بوون لە شەڕەکانیاندا لە پێناو پارێزگاریکردن لە کۆماری کوردستان.

٦-دامەزراوە رۆشنبیری و پەروەردەییەکان لەسەر دەستی کوردەکانی عێراق دروست بوون لە حکومەتی کوردستان و دواتریش گەشەیان کرد هەرچەندە تەمەنی حکومەتەکەش زۆر کورت بوو.

## لیستی سەرچاوەکان

### سەرچاوە کوردیەکان:


١)– بەکر عەبدولکەریم حەویزی، گەشتێك بە کۆماری مەهاباد، چاپخانەی سەردەم،ب.چ،٢٠٠٠.

٢)– جەمال فەتحوللا تەیب ، کۆیە (١٩١٨ – ١٩٥٨)، چاپی دووەم ،چاپخانەی شەهاب، هەولێر ،٢٠٠٨.

٣)– جەلال تاڵەبانی، کوردستان و بزوتنەوەی کورد ،کتێبخانەی جەمالی عەلی باپیر،ب.ش ،٢٠١١.

٤)– حامید گەوهەری، کۆماری کوردستان ٢٢/١/١٩٤٦–١٧/١٢/١٩٤٦،چاپخانەی شەهاب،هەولێر،٢٠١١.

٥)– حەسەن دانیشفەر(هێور)،بارزانی لە ویژدانی رۆژهەلاتی کوردستاندا،چ وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠١٠.

٦)– حسێن مەدەنی ،کوردستان و ستراتیژیەتی دەوڵەتان،ب دووەم،چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر ،ب.س.

٧)– رەحیم سابیر،حکومەتی میللی کوردستان،چ١، خانەی چاپ و بلاوکردنەوەی چوارچرا، سلێمانی،٢٠١١.

٨)– عوسمان عەلی،چەند لێکۆلینەوەیەك دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد، و: کامەران جەمال بابان زادە، ٢٠١٠.

٩)– عولە(ع . م . ا ) ، سالێك بۆ کورد بە ئازادی ئەژیا ، چ دووەم ،چاپخانەی کالی،هەولێر،٢٠٠٠.

١٠)– عومەر بالەکی ، مەهاباد کورتە مێژوییەك ، چ وەزارەتی رۆشنبیری ، سلێمانی ، ٢٠٠٤.

١١) – عەبدوڵلا ئەحمەد رەسول پشدەری،یاداشتەکانم، بەشی یەکەم،ب.چ،بەغدا،١٩٩٢.

١٢) – عەزیز شەمزینی ،جولانەوەی رزگاریی نیشتمانی کوردستان،و: فەرید ئەسەسەرد،سلێمانی، ٢٠٠٦ز.

١٣)– کەمال میراودەلی،دیوانی فانی، بەرگی یەکەم،چاپخانەی راپەرین، سلێمانی،١٩٧٥.

١٤)– کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی ١٩–٢٠،و: حەمە کەریم عارف، چاپخانەی شڤان، سلێمانی ، ٢٠٠٣.

١٥)– لازاریف ، مێژووی کوردستان، و:وشیار عەبدوڵلا سەنگاوی،چاپخانەی رۆژهەلات،چ٢،هەولێر ،٢٠١٠ز .

١٦)– مەهدی محەمەد قادر ، پێشهاتە سیاسیەکانی کوردستانی عێراق(١٩٤٥– ١٩٥٨)،چاپخانەی سەنتەری لێکۆلینەوەی ستراتیژی کوردستان، سلێمانی ،٢٠٠٥.

١٧)- نەوشیروان مستەفا ئەمین، حکومەتی کوردستان(کورد لە گەمەی سۆڤێتی دا)چ٢،چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان،هەولێر،١٩٩٣.

١٨)- هیمداد حسێن ، رۆژنامەوانی کوردی سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان(١٩٤٣-١٩٤٧)چاپخانەی ئاراس،هەولێر،٢٠٠٨.

١٩)- یاسین سەردەشتی ، کوردستانی ئێران لێکۆلینەوەیەکی مێژوویی لە جولانەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد(١٩٣٩-١٩٧٩)،چاپی دووەم،چ سیما، سلێمانی،٢٠١١ز.

## سەرچاوە عەرەبیەکان :

١)- جيرارد جالياند،شعب بدون وطن(الكردوكردستان)،ت:عبدالسلام النقشبندي،ط الاولى،مطبعة أراس، اربيل،٢٠١٢.

٢)- زنار سلوبي ، في سبيل كردستان(مذكرات)، ترجمة:د.علي، مطبعة كاوا للثقافة الكردية، بيروت،لبنان،١٩٨٧.

٣)- لازاريف و أخرون،تأريخ كوردستان،ت:عبدي حاجي،طالاولى،مطبعة حاجي هاشم،أربيل،٢٠٠٦ز.

٤)- مسعود بارزاني ، البارزاني و الحركة التحررية الكردية" بارزان ١٩٤٥-١٩٥٨"،كردستان،١٩٨٧.

٥)- هوزان سليمان الدوسكي، جمهورية كوردستان،(٢٢كانون الثاني١٩٤٦-١٧كانون الاول ١٩٤٦)،دار سثيريَز للطباعة والنشر،ط الاولى، مطبعة وزارة التربية،اربيل،٢٠٠٥.

٦)- وليم ايغلتن الابن، جمهورية مهاباد(جمهورية ١٩٤٦)الكردية ، ت :جرجيس فتح الله، دار أراس للطباعة و النشر، منشورات الجمل،ط الاولى ، أربيل،٢٠١٢.

---

١ – مەهدی مەحەمەد قادر ، پێشهاتە سیاسیەکانی کوردستانی عێراق(١٩٤٥–١٩٥٨)،چاپخانەی سەنتەری لێکۆلینەوەی ستراتیژی کوردستان ، سلێمانی ،٢٠٠٥، ل٢٤٣"یاسین سەردەشتی ، کوردستانی ئێران لێکۆلینەوەیەکی مێژویی لە جولانەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد(١٩٣٩–١٩٧٩)،چ دووەم،چاپخانەی سیما، سلێمانی،٢٠١١ز،ل٢٢١.

٢ – حسین مەدەنی ،کوردستان و ستراتیژیەتی دەولەتان،ب دووەم،چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر ،ب.س،ل ٢٤٥.

٣ – هـ .س ، ل ٢٤٦.

٤ – لازاریف ، مێژووی کوردستان، و:وشیار عەبدوللا سەنگاوی،چاپخانەی رۆژهەلات،چ٢،هەولێر ،٢٠١٠ز ، ل ٤٢٣.

٥ – مسعود البارزاني ، البارزاني والحركة التحررية الكردية،جزء الاول،ط ٢،مطبعة كاوا للثقافة الكردية،لبنان،بيروت،١٩٩٧،ص٢٠٤.

٦ – وليم ايغلتن الابن، جمهورية مهاباد(جمهورية ١٩٤٦)الكردية°، ت :جرجيس فتح الله، دار أراس للطباعة و النشر، منشورات الجمل،ط الاولى ، أربيل،٢٠١٢،ص١١٣.

* – حیزبی دیموکراتی کوردستان (ح.د.ك) : حیزبێکی نەتەویی،دیموکراتی ، پێشکەوتن خوازە ، لەم قۆناغەدا بە سەرەکیترین رێکخراوی سیاسی کوردستانی ئێران دەژمێردرا ، خاوەنی کۆماری میللی کوردستانە و لەلایەن پێشەوا قازی مەحەمەدەوە دامەزراوە ،بروانە یاسین سەردەشتی ، س ، پ ، ل٥٩٤.

٧ – عومەر بالەکی ، مەهاباد کورتە مێژوییەك چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری ، سلێمانی ، ٢٠٠٤، ل٩٢.

* – مەلا مستەفای بارزانی : لە سالی ١٩٠١ لە بنەمالەیەکی شۆرشگێرهاتۆتە دونیاوە ، خوێندنی ئاینی لەلایەن مەلا و زاناکانی دەوروبەری ناوچەی بارزان خوێندووە ، لەسەرەتای تەمەنیدا بوو کە دەولەتی عوسمانی برا گەورەکەی شێخ عەبدولسەلامی لە شاری موسل ئیعدام کرد...... بۆ زیاتر زانیاری بروانە : فاتح رەسول، بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ نە کوردستان دا ، چ١،ستۆکهۆلم،٢٠٠١،ل١٨٢.

* – لیژنەی ئازادی :پارتێکی سیاسی بوو لە باشووری کوردستان لە ١٩٤٥/١/١٥ز لەسەر دەستی مەلا مستەفای بارزانی و حەوت لە ئەفسەرەکان دامەزراوە، کە ئەندامەکانی بریتی بوون لە عیزەت عەبدولعەزیز ، مستەفا خۆشناو ، عەبدواحەمید باقر ، مەحەمەد مەحمود قودسی ، ئەحمەد ئیسماعیل، شەوکەت نوعمان ، حەفیزولا ئیسماعیل،ئامانجی ئەم رێکخراوە داکۆکی کردن بوو لە نەتەوەی کورد بۆ سەربەخۆبونی کوردستان.... بۆ زانیاری زیاتر بروانە: حامید گەوهەری،کۆماری کوردستان ١٩٤٦/١/٢٢– ١٩٤٦/١٢/١٧،چاپخانەی شەهاب،هەولێر،٢٠١١،ل ٢٦٩" لازاریف ، س.پ،ل٣٩١.

٨ – هوزان سليمان الدوسكي، جمهورية كوردستان،(٢٢كانون الثاني١٩٤٦–١٧كانون الاول ١٩٤٦)،دار سثيريَز للطباعة والنشر،ط الاولى، مطبعة وزارة التربية،اربيل،٢٠٠٥،ص١٠٤.

٩ – عولە(ع . م . ا) ، سالێك بوو كورد بە ئازادی ئەژیا ، چ دووەم ،چاپخانەی كاڵی،هەولێر،٢٠٠٠، ل١١.

١٠ – ئاڵای كوردستان لە سێ ڕەنگ پێك هاتبوو سوورو سپی و سەوز ......بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ :حسێن مەدەنی، كوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان، ب دووەم، ب چ، ٢٠٠١،ل٢٥٢.

١١ – حامید گەوهەری، كۆماری كوردستان ١٩٤٦/١/٢٢–١٩٤٦/١٢/١٧،چاپخانەی شەهاب،هەولێر،٢٠١١،ل ٢٧٢ "مەهدی مەحەمەد قادر ، س.پ، ل٣٤٥.

١٢ – زنار سلوبي ، في سبيل كردستان(مذكرات)، ترجمة:د.علي، مطبعة كاوا للثقافة الكردية، بيروت،لبنان،١٩٨٧،ص٤١٤.

١٣ – عوسمان عەلی ، چەند لێكۆڵینەوەیەك دەربارەی بزافی هاوچەرخی كورد، و: كامەران جەمال بابان زادە، چ ڕێوی، ب چ ، ٢٠١٠،ل ٤١٤" ولیم ایغلتن الابن،م . س ، ص١٢١.

١٤ – جيرارد جاليالند،شعب بدون وطن(الكردوكردستان)،ت:عبدالسلام النقشبندي،ط الاولى،مطبعة أراس، اربيل،٢٠١٢،ل١٦٤.

١٥ – مەهدی مەحەمەد قادر ، س.پ ، ل٣٤٤.

١٦ – لازاریف ، مێژووی كوردستان، و:وشیار عەبدوڵلا سەنگاوی،چاپخانەی ڕۆژهەلات،چ٢،هەولێر ،٢٠١٠ز،ل٣٨٩.

١٧ – حسێن مەدەنی، س.پ،ل٢٠٦.

* – كۆمەڵەی ژیانەوەی كوردستان(ژ.ك): لە ١٦ ئۆگوستی ١٩٤٢ز لە شاری مەهاباد بە نهێنی دامەزراوە ، دامەزرێنەرانی بریتی بوون لە حسێن فروهەر، عەبدولرەحمان زەبیحی، مەحەمەد نانەوازادە ، عەبدولرەحمان ئیمامی، قاسم قادری قازی، مەلا عەبدوڵلا داودی......... بۆ زانیاری زیاتر لەسەر(ژ.ك): بڕوانە: حامید گەوهەری ،س . پ،ل ٤٨.–٥١.

١٨ – فۆاد ئەحمەد، كەسایەتیەكی خەبات گێڕو و تێكۆشەری بەشداربوو لە كۆماری مەهاباد (مامۆستا هاشم بەزان)،ڕۆژنامەی كوردستانی نوێ ، ژ (٤٧٥٥)،٢٠٠٨/١٢/٢٨.

١٩ – ڕەحیم سابیر،حكومەتی میللی كوردستان،چ١، خانەی چاپ و بڵاوكردنەوەی چوارچرا، سلێمانی،٢٠١١،ل٤٧.

* – كوردستانی ئێران پێك دێت لە چوار پارێزگا لە ڕۆژئاوای ئێران كەبریتین لە :ئازەربێجانی ڕۆژئاوا،كوردستان،كرماشان،عیلام. بەلام حكومەتی ئێرانی ناوی كوردستان بەشێوەیەكی فەرمی تەنها بە پارێزگای كوردستان وەسف دەكات ، كە مەلبەندەكەی شاری سنە یە بەتەنها، ڕووبەرەكەی

١٢٥,٠٠٠کم٢، کە ٨٪ رووبەری ئێران بوو، وەرێژەی دانیشتوانی سێ ملیۆن کەس بوو لە ساڵی ١٩٣٩، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە :فوزية صابر محمد، أيران بين الحربين العالميتين:تطور السياسة الداخلية ١٩١٨ – ١٩٣٩، رسالة ماجستير غير منشورة قدمت الى مجلس كلية الاداب ، جامعة البصرة،١٩٨٦،ص٤٢٢.

٢٠ – هوزان سليمان الدوسكي، م.س،،ص٩٩" حامید گەوهەری ، س.پ،ل٢٧٠.

٢١ – حەسەن دانیشفەر(هێور)،بارزانی لە ویژدانی رۆژهەلاتی کوردستاندا،چ وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠١٠،ل١١١.

٢٢ – وليم ايغلتن الابن، م . س ، ص ١٣٢.

٢٣ – هۆزان سليمان ميرخان الدوسكي،م.س،ص ١٠٠.

٢٤ – حامید گەوهەری ، س . پ ، ل ٢٧٠.

٢٥ – وليم ايغلتن الابن، م . س ، ص ١٣٣.

٢٦ – حامید گەوهەری ، س . پ ، ل ٢٧١ " ئەوشیروان مستەفا ئەمین، حکومەتی کوردستان(کورد لە گەمەی سۆڤێتی دا)چ٢،چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان،هەولێر،١٩٩٣،ل١٧٦.

٢٧ – حسین مەدەنی، س.پ،ل٢٤٦.

٢٨ – هـ . س ، ل ٢٨٦.

٢٩ – دارا توفیق کاکە ئەمین، ناوچەی پشدەر لەسەردەمی پاشایەتیدا(١٩٢١–١٩٥٨) توێژینەوەیەك لە بارودۆخی رامیاری – کۆمەلایەتی ، نامەیەکی ماستەری بلاَونەکراوەیە پێشکەش بە ئەنجومەنی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەدین کراوە، هەولێر ، ٢٠٠٩ز،ل ١١٦.

* – حزبی رزگاری کورد :لە شوباتی ١٩٤٥ دروست بوو لە چەند کۆمەلەیەکی بچووکی کوردی و پاشماوەی حیزبی هیوا و جگە لە شۆرش، ئەو حیزبە بارەگای خۆی لە بەغدا کردەوە، سەرکردایەتیەکەی لە حەوت کەس پێکهاتبوو کە بریتی بوون لە : صالح حیدری، نافع یونس ، دکتۆر جەعفەر مەحەمەد کەریم، نوری شاویس، نوری مەحەمەد ئەمین، رەشید باجەلان، تەها محی ئەدین مەعروف، ئامانجی بریتی بوو لە یەکێتی و سەربەخۆیی کوردستانی گەورە، وە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی کارگێری لە کوردستانی عێراق،بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : د. عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات و المنظمات و الاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨–١٩٥٨، ط الاولى، بغداد،١٩٨٩م،ص ص ١١٤–١٤٠.

٣٠ – مەهدی مەحەمەد قادر ، س.پ، ل٣٥٤.

٣١ – هوزان سليمان الدوسكي، م.س،،ص١٠٦" بۆ زانیاری زیاتر لەسەر پوختەی سەردانەکانی بارزانی بڕوانە : نەوشیروان مستەفا،س.پ،ل١٧٨.

٣٢ – یاسین سەردەشتی ، س ، پ ، ل ١٦٧.

٣٣ – مەهدی محەمەد قادر ، س.پ، ل٣٤٦.

٣٤ – هوزان سليمان الدوسكي، م.س،،ص١١٦.

٣٥ – زنار سلوبي ، م .س، ص٢٢٣.

٣٦ – یاسین سەردەشتی، س . پ ، ل ١٩٥.

٣٧ – نەوشیروان مستەفا ئەمین، حکومەتی کوردستان(کورد لە گەمەی سۆڤێتی دا)چ٢،چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان،هەولێر،١٩٩٣،ل١٤٨.

٣٨ – هوزان سليمان الدوسكي، م.س،،ص١١٩.

٣٩ – عولە ، س . پ ، ل ١٧.

٤٠ – فؤاد ئەحمەد، کوردستانی نوێ.

٤١ – جەمال فەتحوللا، کۆیە (١٩١٨ – ١٩٥٨)،چ٢،چاپخانەی شەهاب،هەولێر،٢٠٠٨،ل ١٢٥.

٤٢ – هوزان سليمان الدوسكي، م.س،،ص١١٧.

٤٣ – هوزان سليمان الدوسكي، م.س،،ص١١٨.

٤٤ – کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی ١٩–٢٠،و: حەمە کەریم عارف، چاپخانەی شڤان، سلێمانی ، ٢٠٠٢، ل٢٢٤.

* – گۆڤاری کوردستان : یەکەم ژمارەی لە ٦ دیسامبری ١٩٤٥ لە چاپخانەی کوردستان لە مەهاباد چاپکراوبڵاوبۆتەوە،گۆڤاری کوردستان لەژێر ناوەکەی دا نوسراوە )):بڵاوکراوەی بیری حیزبی دیموکراتی کوردستان))و((گۆڤارێکی ئەدەبی ،کۆمەلایەتی،سیاسییە،هەر پازدەرۆژ جارێك بڵاودەکرێتەوە)) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:نەوشیروان مستەفا ئەمین، س.پ ، ل ل١٥٤–١٥٦.

٤٥ – حامید گەوهەری ، س . پ ، ل ١٦٤.

* – گۆڤاری نیشتمان : زمانحالی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردە ، لەساڵی ١٩٤٣ز یەکەم ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە، لەلایەن نوسەرانی کورد (ژ.ك)دەرچووە، وە نۆ ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە :هیمداد حسێن ، رۆژنامەوانی کوردی سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان(١٩٤٣–١٩٤٧)چاپخانەی ئاراس،هەولێر،٢٠٠٨،ل٦٩.

* – گۆڤاری هاواری کورد : گۆڤارێکی سیاسی مانگانە بوو، ژمارە (١) لەلایەن کۆماری کوردستان لە مەهاباد دەرچووە مانگی ئەیلولی ١٩٤٥ز، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : سدیق ساڵح، بیرەوەریەکانی شا پەسەندی ، چاپخانەی شڤان،سلێمانی، ٢٠٠٧ز،ل٢٨.

* – گۆڤاری ئاوات : ئەم گۆڤارە یەك ژمارەی لێ چاپكراوە لە ساڵی ١٩٤٥،بۆ زانیاری زیاتر بروانە:
یاسین سەردەشتی ،س .پ،ل٢٣٨.
٤٦ – ولیم ایغلتن الابن، م . س ، ص ١٧١.
٤٧ – هیمداد حسێن ، رۆژنامەوانی كوردی سەردەمی كۆماری دیموكراتی كوردستان(١٩٤٣–
١٩٤٧)چاپخانەی ئاراس،هەولێر،٢٠٠٨،ل١٦٠.
* – بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ناوی رۆشنبیرانی باشوری كوردستان لەوانەی چوونە مەهاباد بروانە :
مەهدی مەحەمەد قادر، س . پ ،ل٣٥٠.
٤٨ – جەمال فەتحوللا تەیب ، كۆیە (١٩١٨ – ١٩٥٨)، چاپی دووەم ،چاپخانەی شەهاب، هەولێر ،٢٠٠٨،ل ١٢٠.
٤٩ – كەمال میراودەلی،دیوانی فانی، بەرگی یەكەم،چاپخانەی راپەرین، سلێمانی،١٩٧٥،ل١٦١.
٥٠ – نەوشێروان مستەفا، س .پ ، ل ١٥٩.
* – مەغدید كوری مامە كوری فەیزی كوری مامە نانەكەلی یە ،بە مەغدید سۆرانیش ناسراوە،١٩٢٢ز لە شارۆچكەی بنەسلاوەی سەر بە شاری هەولێرلەدایك بووە .لە مزگەوت خراوەتە بەرخوێندن و قورئانی خەتم كردووە، ١٩٣٥.بەیانیان لای مەلا عەزیزی شۆربەشی تەسریفی مەلا عەلی خوێندووە،زۆربەی ئێوارانیش لە مەلا مەحەمەدی سەرسیانەوە فێری كوردایەتی بووە . ئەندامی حزبی هیوا و ە لە دوای نەمانی حیزبی هیوا ١٩٤٦ز بۆتە ئەندامی حیزبی رزگاری كوردستان ، لە كۆماری كوردستان لەسەر داواكاری مەلا مستەفای بارزانی كراوە بە كارمەند لە رۆژنامەی "كوردستان"دا ، لە ساڵانی ١٩٧٠–١٩٧٤ز بۆتە سكرتێری نوسینی گۆڤاری "هەولێر"،، دواترسكرتێری نوسینی گۆڤاری"نووسەری نوێ"ی لقی هەولێری یەكێتی نوسەرانی كوردیش بووە،لە ٢٠١٠/٩/٢٦ لە شاری هەولێر كۆچی دوایی كردووە،بۆ زانیاری زیاتر بروانە : رۆژنامەی كوردستان"مەهاباد ١٣٢٤–١٣٢٥ ی هەتاوی(١٩٤٦)"، ئامادەكردنی:رەفیق ساڵح, سەدیق ساڵح،پرۆژەی هاوبەش دەزگای ئاراس وبنكەی ژین،چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر،٢٠٠٧،ل٢٧.
٥١ – هیمداد حسێن ،س.پ،ل١٦٨.
٥٢ – لازاریف ، س . پ ، ل ٤٢٧.
٥٣ – مەهدی مەحەمەد قادر ، س.پ، ل٣٥٢.
٥٤ – رەحیم سابیر،س.پ،ل٢٣.
٥٥ – حامید گەوهەری، س . پ ، ل١٧٤.
٥٦ – ولیم ایغلتن الابن،م . س ،ص١٣٤.
٥٧ – نەوشیروان مستەفا ، س . پ ،ل ١٨٠.

٥٨ – لازاريف و أخرون،تأريخ كوردستان،ت:عبدي حاجي،طالاولى،مطبعة حاجى هاشم،أربيل،٢٠٠٦ز،ص٢٦١.

٥٩ – مەهدی مەحەمەد قادر، س.پ،ل ٣٤٨.

٦٠ – هۆزان سليمان ميرخان الدوسكي، م.س، ل ١٠٩.

٦١ – نەوشیروان مستەفا،حکومەتی کوردستان،ل١٧٣.

٦٢ – وليم ايغلتن الابن،م . س ،ص١٣٥.

٦٣ – نەوشیروان مستەفا،حکومەتی کوردستان،ل١٧٤.

٦٤ – نەوشیروان مستەفا ، حکومەتی کوردستان ، ل١٨٠.

٦٥ – حسێن مەدەنی ، س. پ ، ل ٢٨٧.

٦٦ – حامید گەوهەری، س . پ ، ل ١٧٥.

٦٧ – وليم ايغلتن الابن ، م . س ، ص١٣٦.

٦٨ – بەکر عەبدولکەریم حەوێزی، گەشتێك بە كۆماری مەهاباد، چاپخانەی سەردەم،ب.چ،٢٠٠٠،ل١٧.

٦٩ – فەرەیدون نوری، بزاڤی بارزانی، چاپخانەی ئاراس،هەولێر ، ٢٠٠٧،ل١٩٢.

٧٠ – بەکر عەبدولکەریم حەوێزی، س . پ ، ل ٤١.

٧١ – مسعود البارزاني ، م.س،ص٢٠٩.

٧٢ – عەبدوڵلا ئەحمەد ڕەسول پشدەری‌یاداشتەکانم، بەشی یەکەم،ب.چ،بەغدا،١٩٩٢، ل٦٠.

٧٣ – هۆزان سليمان ميرخان الدوسكي،م.س،ص ١٠٩.

٧٤ – حامید گەوهەری، س . پ ، ل٣٤٩.

٧٥ – مسعود بارزاني ، البارزاني و الحركة التحررية الكردية" ثورة بارزان ١٩٤٥-١٩٥٨"،كردستان،١٩٨٧،ص٢٤.

٧٦ – هۆزان سليمان ميرخان الدوسكي،م.س،ص ١١١.

٧٧ – عەزیز شەمزینی ،جولانەوەی ڕزگاریی نیشتمانی کوردستان،و: فەرید ئەسەسەرد، سلێمانی، ٢٠٠٦ز،ل٣٠٦.

٧٨ – – حامید گەوهەری، س . پ ، ل٣٧٨ .

٧٩ – عەزیز شەمزینی ، س . پ ، ل ٣١٠.

٨٠ – هـ . س ، ل ٣١٦.

٨١ – جەلال تالەبانی، کوردستان و بزوتنەوەی کورد ،کتێبخانەی جەمالی عەلی باپیر،ب.ش ،٢٠١١ ،ل٢٥٢.

# گرینگی سازدانی کۆنگرەی نەتەوەیی کورد

ئامادەکردنی: سۆزان خالد

**پێشەکی:**

کۆنگرەی نەتەوەیی کورد خەونێکی لە مێژینەی گەلی کوردە، بەڵام بەهۆی پارچە پارچەبوونی خاکی کوردستان، پەرت و بڵاوی بزافی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد، نەبوونی زمینەیەکی گونجاو، ئەم خەونە تا ئێستا نەتوانراوە بێتەدی.

بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستان، هۆشیاربوونەوەی گەلی کورد لە گشت پارچەکانی کوردستان و گەیشتن بەو قەناعەتەی کە تەنیا بە یەکبوون و یەکگرتوویی ئاواتەکانمان دێتەدی، بریاروایە کۆنگرەی نەتەوەیی کورد ببەسترێت.

لە پەراوێزی ئەم کۆنگرەیە ئەم دیراسەتە بچووکەم ئامادەکرد بەو هیوایەی کە ئەم کۆنگرەیە ببەسترێت خەونی دەیەها ساڵەی نەتەوەی کورد بێتەدی و ئەم کۆنگرەیە سەرەتایەک بێت بۆ سەربەخۆیی یەکجارەکی کوردستان دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی.

## پێناسەی کۆنگرە:

کۆنگرە بریتییە لە کۆبوونە رۆشنبیرییەکان کە پسپۆرەکان لە گشت بوارەکان بانگەشەی بۆ دەکەن بۆ دیراسەتکردنی بابەتێکی دیاریکراو و پێشکەش کردنی چارەسەری مەسەلەیەک و لە میانی کۆنگرە ژمارەیەک توێژەر و ئەکادیمی ئامادە دەبن بەپێی جۆری بابەتی کۆنگرە، رێوشوینی کۆنگرەش لە بارەگا زانستییەکان دیاری دەکرێت وەکو سەنتەری زانکۆکان..[1]

پێناسەی کۆنگرەی نەتەوەیی کورد:

١- بەرێز مەسعود بارزانی لە وتاری لە بەردەم ئەندامانی کۆنگرەی نەتەوەیی کورد بەم شێوەیە کۆنگرە پێناسە دەکات "ئامانجی سەرەکیی ئێمە لەو کۆنگرەیە بریتییە لەوەی هەموو لایەنە سیاسییە کوردییەکانی هەر چوار پارچەی کوردستان ببنە خاوەنی وتار و ستراتیژییەکی هاوبەش کە لەسەر بنەمای گەیاندنی پەیامی ئاشتی و پێکەوەژیان بۆ گەلانی ناوچەکە بنیات نرا بێت. ئێمە لەو کۆنگرەیەدا دەمانەوێ بە گەلانی عەرەب و تورک و فارس بڵێین، کە کورد چاوی لە پێکەوەژیانێکی ئاشتیانە و یەکسانە لەگەڵ ئێوەدا[2].

٢-هەروەها بەرێز د. کەمال کەرکوکی سەرۆکی پێشووی پەرلەمانی کوردستان لە میانی وتارێکی لە رۆژنامەی خەبات پێناسەی کۆنگرە دەکات "لێرەدا گرنگیی سازدانی کۆنگرەی نەتەوەیی و کۆبوونەوەی هێز و لایەنە کوردیەکان بەدیار دەکەوێ، بۆ داکۆکیکردن لە مافە رەواکانی گەلەکەمان و جەختکردنەوە لەسەر گرتنەبەری شێوازی ئاشتییانە و دیموکراسیانە بۆ

وەدیهێنـانی هیـوا و ئامانجەکانمـان لە چوارچێـوەی پرانسیپی پێکەوەژیـانی ئاشـــتییانە و رێزگرتنـــی تەواو لە مـــاف و ئازادییەکـــانی ســـەرجەم ئەو پێکهاتانەی لەسەر خاکی کوردستان دەژین بە جیاوازیی ئـایین و ئەتنیـک و زمان و بیروبۆچوون و ئایدیاوە"[٢].

کۆنگرە لە مێژووی هاوچەرخی کورد:

١- کۆنگرە نێوخۆیی و نێودەوڵەتییەکان.

٢- کۆنگرەی پارتە سیاسییەکانی کوردستان و پارتە جیهانییەکان.

٣- هۆکاری چی بوو کە کورد نەیدەتوانی لەم کۆنگرانەدا مافەکانی بەدەست بێنێت؟:

لە لاپەرەکانی مێژووی کوردی هـاوچەرخ چەنـدین کـۆنگرە بەدی دەکـرێن کە تیایانـدا دۆزی کـورد تـاوتوێ کـراوە، هەر لە ســەرەتاکانی ســەدەی نـۆزدەمەوە هەسـتی نەتەوایەتـی زۆر پەرەی سـەند سـەرکردەکانی بزاڤـی رزگاریخوازی کورد هەوڵیان دا کە کوردەکان لە گشت پارچەکانی کوردستان کۆبکەنەوە بەمەستی خەبات کردن بۆ وەدیهێنـانی سـەربەخۆیی کوردسـتان، بـۆ ئەم مەبەسـتەش چەنـدین کـۆنگرە و کۆبـوونەوەو پەیمـانیی نـاوخۆیی ئەنجام دراوە.

هەروەها لە ئاستی کـۆنگرە نێودەوڵەتییەکـان زۆر جـار مەسـەلەی کـورد یەکێک بووە لە تەوەرەکانی ئەم کۆنگرانە، کە هەنـدێ جـار بریارەکـانی ئەم کـونگرانە کـاریگەری ئەرێنـی هەبـووە بـۆ گەلـی کـورد و هەنـدێک جـاریش کاریگەری نەرێنی هەبووە، لە خوارەوە وەکو نمـوونە هەنـدێک لەم کـۆنگرانە دەخەینەروو:

١- کۆنگرەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری ساڵی ١٨٨٠: شێخ عوبێدوڵڵای نەهری بیری لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی کردەوە، بۆ ئەم مەبەستەش کۆنگرەیەکی بەست بە ئامادەبوونی ٢٢٠ سەرۆک هۆزی کورد کە گشتیان پاڵپشتی خۆیان بۆ ئەم بابەتە راگەیاند و، دواتر شێخ عوبێدوڵڵا نامەی نارد بۆ هەردوو دوڵەتی تورکی و ئیرانی کە ئەگەر وەڵامی داخوازییەکانی گەلی کورد نەدەنەوە ئەوا دەست دەکەن بە شۆرش. لەبەرئەوەی هەردوو دەوڵەتی ناوبراو وەڵامی داخوازییەکانی گەلی کوردیان نەدایەوە شۆرشی چەکداری کوردەکان دژ بە دەوڵەتی تورکیای عوسمانی و ئێرانی قاجاری دەستی پێکرد، هەرچەندە کوردەکان توانیان لە سەرەتا سەرکەوتن بەدەست بێنن، بەڵام دواتر هەردوو دەوڵەتی تورکیاو ئێران بە هاوکاری روسیا و بریتانیا توانیان شۆرشەکە دابمرکێننەوە[٤].

٢- پەیمانی پیرۆز ١٨٤٣: بەمەبەستی کۆکردنەوەی هۆزە کوردییە پەرت و بڵاوەکان و نەهێشتنی دووبەرەکی لەناو کوردان، بەدرخان پاشا سەرۆک هۆزەکانی کوردی لە سایەی خۆیدا کۆکردەوە پەیمانێکیان بەست بەناوی "پەیمانی پیرۆز"، مەبەست لەم پەیمانە خەبات کردن بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی کوردستان[٥].

٣- کۆنگرەی پاریس بۆ ئاشتی لە ساڵی ١٩١٩ کە لەلایەن وڵاتانی سەرکەوتوو لە شەڕی جیهانی یەکەم بەسترا:شەریف پاشای خەندان لەلایەن کوردان راسپێردرا کە نوێنەرایەتی کورد بکات لە کۆنگرەکە، ئەو لایەنانەی کە شەریف پاشایان راسپارد (لە باکوری کوردستان کۆمەڵەی ئیستقلالی کورد، کۆمەڵەی تەعالی کورد، لە باشوری کوردستان دوای ئەوەی شەریف

پاشا نامەی بۆ شێخ مەحمود رەوانە کرد و شێخ مەحمود لەگەڵ هۆزە کوردییەکان کۆبۆوە رەزامەندیان دا بە دەستنیشان کردنی شەریف پاشا لە کۆنگرەی پاریس بۆ ئەم مەبەستەش رەفیق حلمی یادداشتێکی ئامادە کرد و شاندێک بە نوێنەرایەتی عیزەت مەدفەعی و عەبدوڵڵا ئاغا و حاجی حەمە سعید رەوانەی ئێران کران بۆ کۆکردنەوەی واژۆی پشتگیری، پاشان رەشید کابان و ئەحمەد بەرزنجی راسپێردران بۆ ئەوەی ئەو واژۆیانە بگەیننە شەریف پاشا بەڵام ئەم دوو بەرێزە لە رێگەیان لە سوریا "وڵاتی شام" دەستگیر کران و نەفی کران نەتوانرا واژۆکان بگەیننە کۆنگرە.

هەروەها نیاز وابوو لە گشت پارچەکانی کوردستان شاندی کوردی بچن بۆ پاریس بۆ پاڵپشتی کردنی شەریف پاشا بەڵام بە هۆکاری جیاجیا ئەم شاندانە نەیانتوانی بگەنە ئەم شوێنە هەروەها بەدرخان پاشا نامەیەکی بۆ شەریف پاشا رەوان کرد تیایدا جەختی لەسەر ئیستقلالی کوردستان کردەوە.

بەم شێوەیە شەریف پاشا تاکە کورد بوو لە کۆنگرەی پاریس نوێنەرایەتی کوردی کرد.

گرنگترین ئەنجامەکانی ئەم کۆنگرەیە بۆ کورد:

**أ-** ئاشتبوونەوەی کورد و ئەرمەن بەستنی رێککەوتنامە لە نێوانیان.

**ب-** مۆرکردنی رێککەوتنامەی سیڤەر"[٦]

٤- پەیماننامەی سیڤەر: لە سالی ١٩٢٠ رێککەوتنامەی سیڤەر لە نێوان وڵاتانی هاوپەیمان بەسترا لە پێناو لەناوبردنی دەوڵەتی عوسمانی لە بەندەکانی (٦٢،٦٣،٦٤) ئەم رێککەوتنامەدا باس لە مافی گەلی کورد

کراوە کە گرینگترینیان (راگەیاندنی سەربەخۆیی دەوڵەتی کوردی، ئەگەر ئەمە لە ریفراندۆمێک بریاری لەسەر درا)، ئەمە یەکەم جاربوو لە مێژوو کە بەفەرمی باس لە سەربەخۆیی کوردستان بکرێت، بەڵام ئەم ئاواتە زۆری نەبرد لە کۆنگرەی لۆزان ئەم ئاواتەی کورد لەناوبرا.

٥- کۆنگرەی لۆزان ساڵی ١٩٢٣: دوای ئەوەی دەوڵەتی تورکیا توانی سەرکەوتن بەسەر یۆنان تۆمار بکات پاشگەزبوونەوەی بریتانیا لەبەر هەندی بەرژەوەندی، لە کۆنگرەی لۆزان بەندەکانی رێککەوتنامەی سیڤەر هەڵوەشایەوەو بەم شێوەیە دووبارە کورد مافی چارەی خۆنووسینی لەدەستدا.

٦- کۆنگرەی باکۆ ١٩٤٨: لە ساڵی ١٩٤٨ کۆنگرەی باکۆ لە ئازەربێجان بەسترا، کە نوێنەری کوردانی گشت پارچەکانی کوردستان بەشدارییان تیادا کردووە، لە میانی ئەم کۆنگرەیە مستەفا بارزانی وتارێکی پێشکەش کرد تیادا باسی لە بزافی رزگاریخوزی کوردی لە گشت پارچەکانی کوردستانی کرد و جەختی لەسەر سەربەخۆیی کوردستان کردەوە[٧].

٧- کۆماری کوردستان: دوای خەباتی چەندین ساڵ میللەتی کورد لە گشت پارچەکانی کوردستان گەلی کورد توانی هەندی دەسکەوتی مێژوویی تۆمار بکات وەک دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە رۆژهەلاتی کوردستان ساڵی ١٩٤٦ لەلایەن پێشەوا قازی موحەمەد بە هاوکاری بارزانی نەمر و سوپای بارزان[٨] بەڵام دوای ساڵێک کۆماری کوردستان هەرەسی هێنا بەهۆی کشانەوەی هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت لە سالی ١٩٤٥ –١٩٤٦[٩] و پەیوەندی ئێران لەگەل وڵاتە زلهێزەکان.

٨- کۆنگرەی وڵاتانی ئۆپێک لە جەزائیر ساڵی ١٩٧٥:رێککەوتنامەی ١١ ئادار سالی ١٩٧٠ وەرگرتنی مافی ئۆتۆنۆمی لە باشووری کوردستان دەستکەوتێکی مێژوویی بوو بەڵام بەهۆی رێککەوتنی نێوان سەدام حسین و شای ئێران لە کۆنگرەی وڵاتانی ئۆپیک لە جەزائیرلەسەر حسابی مافەکانی کورد رێککەوتن و رێککەتنامەی ساڵی ١٩٧٠ کە لە نێوان کورد و رژێمی عێراق بەسترا بوو هەلوەشایەوە.[١٠]

٩- کۆنگرەی پارتە سیاسییەکان و جیهانییەکان:

لە سەرەتای سەدەی بیستەم دوای شۆرشی مەشروتە لە تورکیا ساڵی ١٩٠٨ کوردەکان بوونە ئەندام لە کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی کە دروشمی ئیسلامی هەڵکردبوو کە گوایە گشت گەلانی تورکیا لە ژێر ئالای ئیسلام کۆدەکاتەوە، بەڵام لە کۆنگرەی سێیەمی ئیتحاد و تەرەقی کە لە دوای شۆرشی مەشروتە لە سالۆنیک بەسترا رەگەزپەرستەکانی تورک رایانگەیاند کە ئایدلۆجیای تۆرانی تاکە ئایدلۆجیای حکومەتە، بۆیە کوردەکان لەم کۆمەڵەیە دەرهاتن دەستیان کرد بە دامەزراندنی حزب و کۆمەڵەی سەربەخۆ[١١] لە رێکەوتی ١٩٠٨/٩/١٩ کوردەکان کۆمەلەی تەعاون و تەرەقی کوردیان دامەزراند[١٢]

لە دوای ئەمەش گەلی کورد بە درێژایی سەدەی بیستەم لە گشت پارچەکانی کوردستان دەستییان کرد بە پێکهێنانی کۆمەلەو پارتی کوردی وەک ( کۆمەلەی هێڤی، کۆمەلەی رزگارکردنی کوردستان، کۆمەلەی خۆیبوون، پارتی دیموکراتی کوردستان- عێراق، پارتی دیموکراتی کوردستان – ئێران، یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، پارتی کرێکارانی

کوردستان...هتد)، ئەگەرچی شێوازی خەباتکردنیان جیاواز بووە بەڵام ئامانجی ئەم پارتانە هێنانەدی ئامانجەکانی نەتەوەی کورد بووە.

بزاڤی رزگاریخوازی کورد لەلایەن پارتە سیاسییەکانی کورد رابەری دەکرا و ئەم پارتانە لە میانی کۆنگرەکانیان باس لە مافی کورد و سەربەخۆیی کوردستان دەکەن، گرنگترین کۆنگرەش کە بە ئاشکرا باس لە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان کرا (کۆنگرەی ١٣ی پارتی دیموکراتی کوردستان) لە ساڵی ٢٠١٠ کە بەرێز مەسعود بارزانی بە ئاشکرا و زۆر بەروونی باسی سەربەخۆیی کوردستان و پێکهاتنی دەوڵەتی کوردی کورد.

هەروەها لەسەر ئاستی کونگرەی پارتە جیهانییەکان بەرێز مەسعود بارزانی لە رێکەوتی ٢٠١٢/٩/٢٩ بەشداری کرد لە چوارەم کۆنگرەی پارتی دادو گەشەپێدان لە وڵاتی تورکیا کە لەم کۆنگرەیە بە زمانی کوردی وتاری پێشکەش کرد و لە میانی وتارەکەیدا چەندین جار ناوی کوردستانی هێنا ئەمەش بووە مایەی خۆشحاڵی ئامادەبووان کە بۆ یەکەم جارە سەرکردەیەکی کورد لە وڵاتی تورکیا بە زمانی کوردی وتار پێشکەشبکات[١٣].

هەروەها لە کۆنگرەی نێودەڵەتی پارتە دیموکراتییەکان لە وڵاتی ئیتالیا لە رێکەرتی ٢٠١٢/١٢/٢١ بەرێز مەسعود بارزانی باسی لە دۆزی کورد و نەهامەتییەکانی گەلی کوردی لە گشت پارچەکانی کوردستان کرد[١٤].

وێرای ئەوەی کۆنگرەی پارتەکان مینبەرێک بووە بۆ داکۆکی کردن لە مافەکانی گەلی کورد و باس لە مافی چارەنووسی کوردی تیادا کراوە، بەڵام مەسەلەی کورد پێویستی بە کارکردنی بە کۆمەڵ هەیە و پێویستە گشت

لایەن و هێزە کوردییەکان بەیەک دەست و بەیەک گوتارو یەک بەرنامە کار بکەن بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی گەلی کورد لە هەر چوار پارچەی کوردستان، بۆیە ئەنجامدانی کۆنگرەی نەتەوەیی کورد زۆر گرینگە.

**دەرئەنجام:**

یەکەم: هۆکاری چی بوو کە کورد نەیدەتوانی لەم کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان مافەکانی بەدەست بێنێت؟:

١ـ لەم کۆنگرانە نوێنەری کورد بەشداری نەدەکرد.

٢ـ کۆنگرەکان لەسەر خاکی کوردستان نەدەبەستران.

٣ـ لەرووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستی زەمینەی کورد لەبار نەبوو.

٤ـ میللەتی کورد بەهۆی چەوساندنەوەی لە هەرچوار پارچەی کوردستان ئاستی خوێندەواری و هۆشیاری نزم بوو نەیدەتوانی بە باشی داکۆکی لە خۆی بکات.

ولاتانی زلهێز زیاتر بەرژەوەندییان لەگەڵ ولاتانی (تورکیا و عێراق و ئێران و سوریا) دەگونجا.

دووەم: گرینگی بەستنی کۆنگرەی نەتەوەیی کورد ٢٠١٣.

بەستنی ئەم کۆنگرەیە لەم کات و ساتەدا پێویستییەکی مێژووییە لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١ـ لە باشووری کوردستان ئازادییەک بەدەست هاتووە، ئارامی و ئاسایش دەستەبەر کراوە، بەڵام لە پارچەکانی تری کوردستان (باکور، رۆژئاوا،

ڕۆژهەڵات) تا ئێستا گەلی کورد دەچەوسێندرێتەوە و جینۆساید دەکرێت تا ئێستا بێ بەشن لە مافە یاسایی و مرۆییەکان.

٢- دوای ٢٠ ساڵ ڕاپەڕینی گەلی کورد لە باشووری کوردستان و دامەزراندنی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان تاکو ئێستا نەتوانراوە پرۆژەی دەستووری هەرێم بدرێتە ریفراندۆم، بێگومان ئەمەش ئەجندای دەرەکی لە پشتە، پێویستە لە کۆنگرەی نەتەوەیی کورد ئەم بابەتە چارەسەر بکرێت.

٣ـ تاکو ئێستا یەک گوتاری کوردی نییە لە بوارەکانی (نووسینەوەی مێژووی کورد، ڕاگەیاندن، یەکخستنی زمانی کوردی،.. هتد) پێویستە ئەم بابەتە لە میانی کۆنگرە چارەسەر بکرێت.

٤- براکوژی و ململانێی تەسکی حزبی لە نێوان لایەنە کوردییەکان هەمیشە کۆسپ بووە لەبەردەم سەرکەوتنی میللەتی کورد، لە کۆنگرەی نەتەوەیی کورد پێوستە ئەم مەسەلەیە یەکلا بکرێتەوە، یەکریزی و تەبایی گەلی کورد لە گشت پارچەکانی کوردستان بڕیاری لەسەر بدرێت.

**سەرچاوەکان:**

**کتێبەکان:**


١- صالح محمد حسین "عزت بادی"شەریف پاشا حیاتە و دورە السیاسی ١٨٦٥-١٩٥١،، کوردستان عراق – دهوک، دار سبیرز للنشر، ٢٠٠٥.

٢- (هۆزان سلیمان الدوسکی،جمهوریە کوردستان دراسە تاریخیە – سیاسیە، کوردستان عراق – دهوک، دار سبیرز للنشر، ٢٠٠٥ ).

[3]- مەسعود بارزانی و بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد١٩٦١-١٩٧٥، بەرگی سێیەم بەشی دووەم،، بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری و هونەر لە هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە هەولێر، ژمارەی سپاردن ٥٣٩ ساڵی ٢٠٠٤ لاپەرە ١٦٩.

[4]- علی تتر توفیق نیروەیی، الحیاە السیاسیە فی کوردستان ١٩٠٨-١٩٢٧،، مگبعە خانی دهوک، ٢٠٠٧، ص ٨٠.

[5]- د. جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمبراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێران د. کاوس قەفتان، خانەی هروری بۆ چاپ، ١٩٨٧، بەغداد، عێراق.

**وێب سایتەکان:**

* ttp://www.dz-modern.com
http://www.kurdistantv.net
١http://www.xebat.net/index.php
http://www.krg.org/a/d.aspx?l=١٤&s=٠١٠١٠١٠٠&r=٨١&a=٤٥٤٢١&s=٠١٠٠
*http://www.kurdsat.tv/axbar.php?id=٢٧٧٨&cor=mheli.
'http://www.newroz٢١.net/ar/civat/archive/index.php/t-٣٦٢٨.html

[1]- سەرچاوە سەلاح بەدرەدین چاوپێکەتن لەگەڵ رۆژنامەی خەبات.

[2]- http://www.hekar.net/modules.php?name=News&file=article&sid=٦٢٢٦

---

[1]/ttp://www.dz-modern.com

[3]http://www.kurdistantv.net/default١.aspx?page=amticles&c=articles&id=١٠٩٩٤١.

[3]http://www.xebat.net/index.php

[4]http://www.newroz٢١.net/ar/civat/archive/index.php/t-٣٦٢٨.html

[5]د. جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمبراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێران د. کاوس قەفتان، خانەی هروری بۆ چاپ، ١٩٨٧، بەغداد، عێراق

[6]شەریف پاشا حیاتە و دورە السیاسی ١٨٦٥-١٩٥١، صالح محمد حسین "عزت بادي"، کوردستان عراق – دهوک، دار سبیرز للنشر، ٢٠٠٥.

[7] سەرچاوە سەلاح بەدرەدین چاوپێکەتن لەگەڵ ڕۆژنامەی خەبات.
http://www.hekar.net/modules.php?name=News&file=article&sid=٦٢٢٦

[8] هۆزان سليمان الدوسكي ،جمهوريه كوردستان دراسه تاريخيه – سياسيه , كوردستان عراق – دهوک , دار سبيرز للنشر , ٢٠٠٥)،

[9] هەمان سەرچاوە لا ١٧٦

[10] (مەسعود بارزانی , بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد١٩٦١-١٩٧٥ , بەرگی سێیەم باشی دووەم , , بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە هەولێر، ژمارەی سپاردن ٥٣٩ ساڵی ٢٠٠٤ لاپەرە ١٦٩.

[11] (علي تتر توفيق نيروةيي ،الحياة السياسية فى كوردستان ١٩٠٨-١٩٢٧ , , مطبعة خاني دهوک , ٢٠٠٧ , ص ٨٠.

[12] (هەمان سەرچاوە لاپەرە ٨٦.

[13] http://www.krg.org/a/d.aspx?l=١٤&s=٠١٠١٠١٠٠&r=٨١&a=٤٥٤٢١&s=٠١٠٠.

[14] .http://www.kurdsat.tv/axbar.php?id=٢٧٧٨&cor=mheli

# دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی

نجم الدين عبدالله اسماعيل - قوتابی ماستەر

## پێشەکی:

دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی بەیەکێك لەگرنگترین دەسکەوتە مێژوویەکانی جیهانی عەرەبی دادەنرێت، بەهۆی ئەو کاریگەریە قوولّ وگرینگەی کەدروستی کردلەسەر رەوت ورووداوەکان، وە نەهێشتن ولاوازکردنی بەرژەوەندی داگیرکەران لەجیهانی عەرەبی بەتایبەتی بەرژەوەندی داگیرکەری بەریتانی، لەلایەکی تر دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی بووە سەرەتایەکی زۆر گرنگ بوو بۆ پەیدابوونی هەستی نەتەوایەتی عەرەبی وهەنگاو نان بەرەو یەکێتی نەتەوەی عەرەبی و بەدی هێنانی سەروەری وبوژاندنەوە وهەم ئاهەنگی نێوان ولاتانی ئەندام لە کۆمکاری ولاتانی عەرەبی.

هەلّبەتە بایەخدان وتوێژینەوە لەسەربابەتێکی هەستیارو گرنگی وەکو بابەتی دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی کەوەکو رێکخراوێکی هەرێمی عەرەبی، وەبەهۆی دروست بوونی هەستی نەتەوایەتی عەرەبی لەناو ولاتانی عەرەبی خۆی لە خۆیدا کارێکی گرنگ وئەکتیڤە لەخۆرهەلاتی ناوەراست و ولاتانی عەرەبی وە ئامانج لەدامەزراندنی ئەم رێکخراوەیە بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندی یەکسان لەنێوان ولاتانی ئەندام وهاوکاری وهەم ئاهەنگی کردن لەرووی ئابووری وکۆمەلایەتی ورۆشنبیری وهتد.

سەبارەت هەڵبژاردنی بابەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ گرنگی و بایەخی ئەم بابەتە هەستیارە بەنیسبەت وڵاتانی عەرەبی و وڵاتانی داگیرکەر چونکە خاڵێکی وەرچەرخان بوو بۆ دروست بوونی یەکێتی نەتەوەی عەرەبی.وە لەلایەکی تر ئارەزووی توێژەر لەسەر نووسینی ئەم بابەتە هاندەرێکی تر بوو بۆ هەڵبژاردنی ئەم بابەتە.

جێگای ئاماژەپێکردنە بۆ لێکۆلینەوەیەکی لەم جۆرەش توێژەر دووچاری تەگەرەوکۆسپی زانستی دەبێتەوە لەوانەش بەدەست هێنانی سەرچاوەی رەسەن کەزۆربەیان عەرەبیە،دەستە بەرکردنی ئەم سەرچاوانەش لەرێگەی هەوڵ و ماندووبونێکی زۆر بەدەستەوە هاتووە.

توێژینەوەکە لەپێشەکی یەك و پێنج باس پێك هاتووە، هەر باسێك دابەش دەبێت بە سەر چەند لقێك.

باسی یەکەم: بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی وئامانجەکانی، کەلێرەدا ئاماژە کراوە بەسەرەتای سەرهەڵدانی پرۆژەی دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی کە لەلایەن سەرۆك وەزیرانی میسر پێشنیار کراوە.

باسی دووەم: رۆڵ وهەڵوێستی وولاتی عێراق بۆ دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی، لێرەدا باس لەورۆلە گرنگەی عێراق کراوە کەوا چۆن رۆلێکی کاریگەری هەبووە لەسەر دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی وەباس لەهەڵوێستی خەڵکی عێراق کراوە کەوا چۆن پالپشتیان کردووە لەو هەنگاوەی سەرۆك وەزیرانی میسر وپالپشتیان لەهەڵوێستی حکومەتی عێراق کردووە.

باسی سێیەم: رۆڵ وهەڵوێستی وولاتی میسر بۆ دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی، لێرەدا باس لەورۆلە گرنگەی میسر کراوە کەوا چۆن رۆلێکی

کاریگـەری هــەبووە لەسـەر دامەزرانـدنی کۆمکـاری وڵاتـانی عـەرەبی وەبـاس لەهەڵوێـستی رۆشـنبیرانی میـسر کـراوە کـەوا چـۆن پالپـشتیان کـردووە لـەو هەنگاوەی سەرۆك وەزیرانی میسر.

باسی چوارەم: هەڵوێستی وڵاتانی تری عەرەبی لەسەر دامەزراندنی کۆمکـاری وڵاتانی عەرەبی، کەتیایدا بـاس لەرایـە جیاوازەکـان کـراوە وەهـەروەها بـاس لـە یـەکریزی هەلوێـستی وڵاتـانی عـەرەبی کـراوە کـەوا چـۆن پێـشوازیان کـردووە لەداوەتنامەکەی سەرۆك وەزیرانی میسر.

باسی پێنجـەم: هەڵوێستی بـەریتانیا لەسـەر دامەزرانـدنی کۆمکـاری وڵاتـانی عەرەبی، کەتیایـدا باسـی لـەرارای بـەریتانیا دەکـات کـەوا خـاوەن هەڵویستێکی نـاجێگیرەو بـەگوێرەی بەرژەوەندیـەکانی هەڵوێـستی دەگۆڕێـت، وەپـاش گـەز دەبێتەوە لەبریارەکانی لەسەر یەکێتی عەرەبی ودژی دەوەستێ.

توێـژەر لـەکۆی گـشتی لێکۆلینەوەکەپـشتی بەسـتووە بـە ژمارەیـەکی زۆر لەسەرچاوەی گرنگ ونزیکی رووداوەکە وتایبەت بەدامەزراندنی کۆمکاری عەرەبی ویەکێتی عەرەبی وهەستی نەتەوایەتی عەرەبی.

هەنـدێك لـەم سەرچـاوانە تایبـەت بـوون بـە دامەزرانـدنی کۆمکـاری عـەرەبی ویــەکێتی عــەرەبی وهەســتی نەتەوایــەتی عــەرەبی وەهەنــدێکیش پەیوەنــدی راستەوخۆیان نـەبووە بەدامەزرانـدنی کۆمکـاری عـەرەبی تـەنها هەنـدێك لایـەنی لاوەکـی تێـدا باسـکرا بـوو. ئـەو سەرچـاوانەی کـەزۆر سـوودم لێ وەرگرتـووە وە چەندین کتابی تر.

(ابـو خلـدون سـاطع الحـصری )کتابەکـەی بـەناوی (أراء واحادیـث في القومیـة العربیة) وە (محمد طلعـت الغنیمـی) کتابەکـەی بـەناوی (جامعـة العربیـة دراسـات

قانونية سياسية) وە (سامي الحكيم ) کتابەکەی بەناوی (ميثاق الجامعة العربية والوحدة العربية)وە(عبدالرزاق الحسني) کتابەکەی بەناوی (تاريخ الوزارات العراقية) وە چەندین سەرچاوەی تر ناکرێ ناوی هەموویان بخەینە روو.

لەکۆتایدا لێکۆلینەوەیەکی لەم شێوەیە هەولێکی زانستی زۆری بۆدراوە سەرەرای ئەوەی کەنمانتوانیووە بچینە ناخی بابەتەکە، بەلام هیوادارین توانیبمان زانیارێکی رێك وپێك ببەخشین سەرەرای ئەوەی کە بێ کەم کوری نیە بەلام هیوادارم بەچاوێکی زانستیانە وەربگیرێت.

## باسی یەکەم:

## بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمکاری ولآتانی عەرەبی وئاما نجەکانی

### ا- بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمکاری ولآتانی عەرەبی:

لەدەستپێکی جەنگی دووەمی جیهانی لەگۆرەپانی خۆرهەلاتی عەرەبی نەوەیەکی نوێ پەیدا بوو کەبریتی بوون لەلاوی رۆشنبیرو دەرچوانی زانکۆکانی دەرەوەو ناوەوە، ئەمانە کەسانی سیاسی تەقلیدی نەبوون بەلکو کەسانێك بوون خاوەن بیرۆکەی نەتەوەی وە هەولی پێك هێنانی وولاتی یەکگرتووی عەرەبیان دەدا، ئەم نەوەیە سەربەخۆی نیشتمانی ویەکێتی عەرەبیان بەچارەسەردەزانی بۆ یەکگرتن لەدوا رۆژدا، خاوەن ئایدۆلۆژیایەکی روون بوون سەبارەت بەبیری نەتەوەی وەداوای رزگاربوونی ولآتانی عەرەبیان دەکرد لەژێر دەستی داگیرکەران، هەروەها هەموو ئەو کەسانە کەسایەتی سیاسی بوون لەسەر یەکێتی عەرەبی هاوکۆك بوون تەنها لە هەندێك بۆ چوون جیاواز بوون[1].

بێ گومان بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی لەلایەن عەرەبە نەتەوە پەرستەکان دروست بوو، بەلام یەکەمین کەس کە بەم بیرۆکەیە هەڵسا مصطفی نحاسی سەرۆك وەزیرانی میسر بوو کەداوای لەوڵاتانی سەربەخۆی عەرەبی کرد بەشداری بکەن لەئامادەکاری بۆ ووتوویژ لەسەر دامەزراندنی کۆمکاری عەرەبی وڵاتانی عەرەبیش پێشوازیان لەداوایەکەی نحاس کرد، هەرچەندە هەوڵی دامەزراندنی کۆمکاری عەرەبی لەلایەن نحاس دوای ئەوە هات کە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا ئەنتۆنی ئایدن رایگەیاند کە زۆر بەی رۆشنبیرانی عەرەبی داوای یەکێتی وڵاتانی عەرەبی دەکەن وە دروست کردنی پەیوەندی هاوبەش لەرووی ئابووری وسیاسی وکۆمەلایەتی ئەمەش لەلای بەریتانیا ئاسایە پشتیوانی لێ دەکەین، بەلام بەریتانیا مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆی بوو لەووتانی عەرەبی، دوای ئەوەی وڵاتانی عەرەبی نوێنەریان نارد بۆ ووتو وێژ کردن لەسەردامەزراندنی کۆمکاری عەرەبی بۆیە لیژنەیەك پێکهێنرا کە لە ٢٥ی ئەیلولی ١٩٤٤ لەشاری ئەسکەندەریە کۆبونەوە وە وڵاتانی بەشداربوو بریتی بوون لە (میسر - عێراق - لوبنان - سعودیا - خۆرهەلاتی ئوردن - سوریا - یەمەن )، دوای گفتو گۆیەکی زۆر رێکەوتن لەسەر پرۆتۆکۆلی ئەسکەندەریە[٢].

دوای گفتو گۆیەکی زۆر بریاری دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی درا، پێویستە ئەوەش بزانین کەوا راگەیاندن رۆلێکی بەرچاوی بینی لەماوەی نێوان هەردوو جەنگەکە بۆ هۆشیارکردنەوەی نەتەوەی عەرەبی بۆ پەیوەست بوون بە یەکێتی عەرەبی، هونەروسینەمای میسریش رۆلێکی ئەکتیڤی بینی بۆ ئاراستە کردنی هەستی نەتەوایەتی وپەرەپێدانی لەسەر ئاستی گەلی عەرەبی دا راگەیاندنی عێراقیش رۆلێکی گەورەی بینی بۆ یەکێتی عەرەبی وە جەختیان

لەسەر پێویستی بەستنی کۆنگرەی عەرەبی لەوانە ڕۆژنامەی دەنگی ئەهالی وڕۆژنامەی البلاد و الاخبار وە ڕۆژنامەی العالم العربی باس لە گونجاوی بارودۆخەکە دەکەن بۆ یەکگرتنی ولاتانی عەرەبی، ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەوەیە کە قۆناغی یەکەمی ژیانی کۆمکاری عەرەبی بریتی بوو لە پەیوەست بوون بەنفوزی بەریتانیا، وە لەقۆناغەکانی دواتر هەوڵدان بۆ ڕزگار بوون لەم نفوزە، بەڵێنامەکەی کۆمکاری عەرەبی هیچ توانایەکی نەبوو بەرامبەر بە بەریتانیا تەنها بڕیارێکیش دەرکات، سەرەتای کۆمکاری عەرەبی سەرەتایەکی هەڵە بوو چونکە دەرکەوت وەکو ڕێکخراوێك کە بەریتانیا بۆ بەرژەوەندی خۆی دروستی کردبێ وە نەی دەتوانی کارێك بکا بۆ پاراستنی کیانی نەتەوەی عەرەبی بەڵکو بەپێچەوانەی کۆمکاری عەرەبی تەنها هەم ئاهەنگی بوو لەنێوان حکومەتەکان و ولاتانی عەرەبی، سەرەرای ئەوەی کە کۆمکاری ولاتانی عەرەبی چەندین کەموو کوری هەبووە بەلام هەنگاوێك بووە بۆ بەرەو یەکێتی نەتەوەی عەرەبی چونکە هەنگاوەکە زۆر بەحەماس بوو لەهەموو ولاتانی عەرەبی وەیارمەتی دەربوو بۆ بلاو بوونەوەی بیری نەتەوەی عەرەبی لەووتانی عەرەبی[٣].

دوای ئەوەی بڕیاری دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی درا ئەندامیەتی لەکۆمکاری عەرەبی دیاری کرا کە چەند مەرجێکی لەخۆی گرتبوو کەبریتی بوون لە:

١-دەبێ دەولەتەکە عەرەبی بێت، واتە لەبەڵێنامەکەهاتووە کە دەولەتی عەرەبی ئەو وولاتەیە کە گەلەکەی انتمایان بۆ کۆمەلگەی عەرەبی بێت وە بەستراوەتەوە بەیەکێتی زمان ومێژوو وئەمانەتی هاوبەش[٤].

٢-دەبێ دەولەتێکی سەربەخۆ بێت، واتە هەر وولاتێکی عەرەبی کەدەبێتە ئەندام لەکۆمکاری عەرەبی پێویستە سەربەخۆ بێت بەو شێوەیەی کە

ناسراوە لەلایەن رێکخراوە نێو دەولەتیەکان وە ئەبێ مەرجی سەربەخۆی بوونی تێدا بێت.

٣-دەبێ رەزامەندی ئەنجومەنی کۆمکاری ولآتانی عەرەبی لەسەر بدرێت، واتە هەر وولاتێك دەبێتە ئەندام پێویستە داواکاری پێشکەش بەئەنجومەنی کۆمکاری عەرەبی بکات، دواتر لەلایەن ئەنجومەن گفتوگۆی لەسەر دەکرێ وئەنجومەنی کۆمکار بریاری لەسەر دەدات [٥].

لەراستی دا کۆمکاری ولآتانی عەرەبی لەسەر ئەم بنەمایانەی خوارەوە دەروات:

ا-پارێزگاری کردن لەسیادەی ولآتانی ئەندام

ب-یەکسانی نێوان ئەندامەکان لەرووی یاسایەوە

ج-بنەمای تەدخول نەکردن

د-بەکار نەهێنانی هێز

هـ-بنەمای هاوکاری کردنی یەکتری (٦).

## ب- ئامانجەکانی کۆمکاری ولآتانی عەرەبی:

بەڵێنامەی کۆمکاری ولآتانی عەرەبی پیك هاتبوو لە چەند ئامانجێکی دیاری کراو کە پەیوەندیان هەبووە بە نزیك بوونەوە وتێك گەیشتنی هەریمەکانی عەرەبی وە بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان ولآتانی بەشداربوو، رێکخستنی نەخشەی سیاسی وهاوکاری کردن لەپێناوی سەربەخۆی وولاتە ئەندامەکان وە هاوکاری کردنی ولآتانی ئەندام لەرووی ئابووری ورۆشنبیری و کۆمەلایەتی وتەندروستی وە گرینگترین ئامانجەکانی بریتی بوون لە:

١-پارێزگاری کردن لە ئاشتی وئاسایشی عەرەبی، ئەم ئامانجە جێ بەجێ ناکرێ تەنها بەوەنەبێ کەکۆمکاری عەرەبی خاوەن یەك سوپا نەبێ وەگرینگترین ئەرکی کۆمکاریش بریتــی بــوو لەنەهێـشتنی نــاکۆکی نێـوان ئەندامــەکان وەهــەروەها ئەرکێکی تری کۆمکار ئەوەیە کەنابێ قبولی بکات کەداگیرکـەر پەلاماربداتـە سـەر هیچ وولاتێکی ئەندامی کۆمکار بەلام لەم لایەنەوە کەم تەرخەم بوو هۆکارەکەشی بریتی بوو لە:

أ- بەڵێنامەی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی دیاری نـەکرابوو کـەبریار بـدات بەتـەنها بـۆ روو بـەروو بوونـەوەی داگیرکـەران بـەڵکو بریـاری ئەنجومـەن بـەکۆی دەنـگ دەردەچوو وە لەکاتی بوونی هەر ناکۆکیەکی نێوان ئەندامەکان ئـەوا ئـەم بریـارە بەکی دەکەوت.

ب-بەڵێدنی نامەکە نوێ نەدەکرایەوە بۆ هەڵسان بەجێ بـەجێ کردنـی بریـاردان دژی دوژمن.

٢-جـێ بـەجێ کردنــی هاوکــاری عــەرەبی لــەکاروباری کۆمەلایــەتی وئــابووری ورۆشنبیری وتەندروستی، وەرۆڵی گرنگی بینی لەم بوارەوە

٣-هەڵـسان بـەهاوکاری کردنــی ولاتــانی عــەرەبی لــەکاروباری سیاســی لەســەر ئەساسی هەم ئاهەنگی سیاسەتی دەرەوە بۆ گرفتە سەرەکیەکان(٧).

نــاوەرۆکی بەڵێننامــەی کۆمکــاری ولاتــانی عــەرەبی بریتــی بــوو لــەکارکردن لەپێناوی دەرکردنی هــەموو سـوپای بیــانی لەنیـشتمانی عــەرەبی وە هــەنگاونان بــەرەو یــەکێتی عــەرەبی لەهــەموو نیـشتمانی عــەرەبی، راوەسـتان و رووبــەروو بونەوەی پیلانی دامەزرانـدنی دەولـەتی جولەکـە لەفەلەسـتین، وەلەبەڵێننامەکـە هاتووە کە پەیوەست نابێ بەناکۆکیەکانی تایبەت بەبارودۆخی ناوەخۆی ولاتـانی

ئەندام، لەمادەی پێنجەمی بەڵێننامەکە باس لەپرەنسیپی ناوبـژیوانی وهاوکـاری کردن لەئەنجومەنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی بەویست وئارەزووە وە پـەیرەوی بیروڕاکانی نەتەوە یـەکگرتووەکان دەکـەن، هـەوڵ دەدەن وتێدەکۆشـن لـەپێناو برینـەوەی نـاکۆکی وکیـشەکان بەرێگـەی ئاشـتیانە وە کاردەکـەن لـەپێناوی یەکسانی لـەرووی یاسـایەوە وە پرەنـسیپی دەسـت تێـوەر نـەدان جـێ بـەجێ دەکرێت [٨].

## باسی دووەم:

## ڕۆڵ وهەڵوێستی عێراق بەرامبەر بە دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی

### ١- ڕۆڵی عێراق لەدامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی

سـەبارەت بـە ڕۆڵی عێـراق لەدامەزرانـدنی کۆمکـاری وڵاتـانی عـەرەبی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق کە لـە ١٨تـشرینی دووەم ١٩٤٤ ڕەزامەنـدی دەربـڕی لەسـەر پێـك هێنـانی وەفـدێك بەسـەرۆکایەتی نـوری سەعید سەرۆك وەزیرانی عێراق بۆ بەشداری کردن لەکۆبونەوەی لیژنەی سیاسـی بۆ ئامـادەکردنی بەڵێننامـەی کۆمکـاری وڵاتـانی عـەرەبی وەئـەم وەفـدە ڕێگـای پێدرابوو کە هەموو توانایەکی هەیە لـەبڕیاردان بـەناوی وولاتـی عێـراق، نوێنـەری عێراق ولوبنـان دووپرۆژەیـان پێشکەش کـرد بـەلام لەکۆتایـدا پرۆژەکـەی نـوری سەعید و پرۆژەی لوبنان پەسەند کرا لە٢٢ئازاری ١٩٤٥بەگشتی بڕیـاردرا لەسـەر هاوپێچی تایبەت بەکێشەی فەلەستین وەپرۆژەکـەی عێـراق دانـرا لەبەڵێننامـەی کۆمکـاری عـەرەبی کەتەواوکـەری برۆتوکـولی ئەسـکەندەریە بـوو، پێـشنیارو پرۆژەکەی عێراق بریتی بوو لە مانەی خوارەوە:

١-پارێزگاری کردن لەلایەن کۆمکاری وڵاتانی عەرەب بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان وڵاتانی عەرەبی وەهەم ئاهەنگی کردنی پلانە سیاسیەکان بۆ هاوکاری کردنیان وپارێزگارکردن لەسەر سەربەخۆی وسیادەی وڵاتانی عەرەبی وەپارێزگاری کردن لە وڵاتانی ئەندام لەدەست درێژی وپیلانەکانی داگیر کەران بەگشتی لەکاروباری وڵاتانی عەرەبی.

٢-ئەندامیەتی بۆ ئەو وولاتانەی کەواژوویان کردووە لەسەر بەڵێننامەی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی کردووە و وڵاتانی عەرەبی تریش کە دەیانەوی ببنە ئەندام پێویستە عەرەبی بێت وە سەر بەخۆ بێت وە وڵاتانی ئەندام رەزامەندی لەسەر بدەن.

٣-رێکەوتنامەکانی کە لەنێوان وڵاتانی عەرەبی یان بیانی دەبەسترێ پێویستە ئەنجومەنی کۆمکاری عەرەبی ئاگاداربێت لەرێکەتنامەکە.

٤- سیاسەتی دەرەوەی وڵاتانی عەرەبی ئەندام نابێ ببێتە مایەی زەرەر لێدان لە سیاسەتی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی یان سیاسەتی هەر یەکێك لەوڵاتانی ئەندام وە کارکردن لەپێناوی یەکخستنی ئاراستە سیاسیەکان لەرووی دەرەوە لەنێوان وولاتە ئەندامەکان لەرێگەی گفتوگۆو راوێژکردنی رێکخراودا.

٥-نەهێشتنی ناکۆکی نێوان وڵاتانی ئەندام لەکۆمکاری وڵاتانی عەرەبی وەنابێ توندوتیژی بەکاربێ بەبەکارهێنانی هێز وە نابێ هیچ کەسێك، وولاتێك بکرێتە ناوبژیوان تەنها لەلایەن ئەنجومەنی کۆمکار دەبێ.

٦-هاوکاری کردنی یەکتری بکەن لەکاروباری ئابووری و کۆمەلایەتیو رۆشنبیری وهتد[٩].

سـەرەرای ئـەوەی کەئەوپرەنـسیپەی کـە لەپرۆژەکـەی عێـراق کەباسـی لەپارێزگاری کردنی ولاتانی عـەرەبی کردبـوو لـەکاتی دەست درێـژی کردنەسەر وولاتێکـی عـەرەبی بـەلام لـەبرۆتۆکۆلی ئەسـکەندەریە ئاماژەنـەکرابوو ئامـاژەی پێنـەکرابوو، وەلەبرۆتۆکۆلەکـە ولاتـانی بەشـدار بـوو بـەلێنیان دا کـە سـەلامەتی زەوی وسەربەخۆیان بپارێزن لەدەست درێـژی دەرەکـی وە یەکخـستنی سـوپای سـەربازی و چـەك وتەقەمـەنی وە هەنـدێك لـەبریارەکان دەسـتکاری کـران لەبەلێننامەکەدا دواتر بەکۆی گشتی پەسەند کرا(١٠).

ئەوەی شایانی باسە پرۆژەکەی عێراق تووشی چەندین رەخنە بۆووە لەلایەن ئۆپۆزسیۆنەکانی کە رەخنەکان بریتی بوون لە:

أ–جگە لەپرۆژەی سەربەخۆی ولاتانی عەرەبی وعروبە کەمـەرجی سـەرەکی بـوو لەوەرگرتنی وولاتان بۆ بوون بەئەندام لەکۆمکاری ولاتانی عەرەبی بێ ئەوەی کـە دەسـەلات ومـاف بـدات بەئەنجومەنـەی کۆمکـار لـەبریاردان لەسـەر شـێوازی سەربەخۆی بوون چونکە زۆر وولات ی عەرەبی سەر بەئیستعمار بوون.

ب–پرۆژەکـەی عێـراق رێگـای بەئەنجومـەنی کۆمکـاری ولاتـانی عـەرەبی نـەدا کەسەرپەرشتی رێکەوتنامە وپەیماننامەکانی نێوان ولاتـانی عـەرەبی بکـات بـەلکو لەلایەن ئەندامی کۆمکار دەنگی لەسەر دەدرێ.

ج–لەپرۆژەکەی عێراق هاتووە کە پێویـستە ولاتـانی ئەنـدامی کۆمکـاری ولاتـانی عەرەبی رووبەرووی ئەو داگیرکەرانەببنەوە کەهێرش دەکاتە سەروولاتێکی ئەندام ئەمەش کارێکی قورسە چونکە لەوانە وولاتێکی ئەنـدام پەیوەنـدی هـەبێ لەگـەلْ ئەو وولاتە داگیرکەرە.

د-سیاسەتی دەرەوەی سەپاند بەسەر ولاتانی ئەندام بەو ئاراستەیەی کەبەریتانیا دەیەوێت، ئەمەش لایەنێکی باش نیە چونکە بەریتانیا دژی بەرژەوەندی ولاتانی عەرەبی بوو.

هـ- پرۆژەکە باس لەوە دەکات کەلەکاتی بوونی ناکۆکی نێوان ولاتانی عەرەبی دەبێ بدرێتە دادگای نێو دەولەتی یان ئەو شوێنەی کەپسپۆرە لەچارەسەر کردنی کێشە نێو دەولەتیەکان، سەرەرای ئەوەی کەوا رەفزی پرەنسیپی ناوبژیوانی لەلایەن ولاتانی بیانی نەکرد لەکاتی بوونی ناکۆکی نێوان ولاتانی عەرەبی وبیانی، ئەمەش وادەکات کەمجالێکی باش بدات بە ولاتانی داگیرکەر بخزنە ناو کۆمکاری عەرەبی [11].

## ب- هەلوێستی عێراق بەرامبەر بەدامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی

وولاتی عێراق پێشوازی کرد لەدامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی بەو پێیەی کە هەنگاوێکە بۆ بەدەست هێنانی کاری هاوبەشی عەرەبی وە لەم چوار چیوەیەدا ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق دووپاتی کردەوە کە گرنگی دەدات بەمەسەلەی نەتەوەی، وە وەزارەتەکانی عێراق پالپشتی خۆیان بۆ ئەو هەنگاوە ناو رایان گەیاند کەوا عێراق بەستراوەتەوە بەولاتانی عەرەبی وەکاردەکات بۆ بەرەوپێش چوونی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی و دیاری کردنی ئەرکەکانی [12]،

هەلبەتە وولاتی عێراق لەپێشەوەی ئەو وولاتانە بووە کەپالپشتی تەواوی کردووە لە دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی ورۆلێکی بەرچاوی بینیووە بۆ دامەزراندنی کۆمکاری عەرەبی وە بەدامەزرێنەری راستەقینە دادەنرێت هەرچەندە سەرەتای بیرۆکەکە لەلایەن سەرۆك وەزیرانی میسر هاتبووە پێشنیار

کردن بەلام عێراق رۆلێکی ئەکتیڤی بیینی لەدامەزراندنی کۆمکارەکە، وولاتی عێراق توانیویەتی رەزامەندی ولاتانی تری عەرەبیش بەدەست بهێنی وە ئامانجی یەکگرتنی ولاتانی عەرەبی لەسەر دۆسیەی عەرەبی هاوبەش، خەڵکی عێراق هەلوێستێکی دیارو ئاشکرای هەبووە سەبارەت بە دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی وەدوای راگەیاندنی لەعێراق ئاهەنگیان گێرا وەپشت گیری تەواویان لە دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی کرد کە بەیەکگرتنی عەرەبی دادەنرا [١٣].

لەراستی دا عێراق لەسەرەتای دروست بوونی بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی هەلوێستی روون وئاشکرابوو کەپشتگیری کردووە لەو بیرۆکەی کە مصطفی نحاسی سەرۆك وەزیرانی میسر وسەرکردەی حزبی وەفدی میسرە بانگی بۆ راهێشت بۆ دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی، کاتێك نحاس داوەتی نامەیەکی بۆ نوری سەعید نارد وەخاوەنی پرۆژەکەهلال خصیب بۆ سەردانی کردنی بۆ قاهیرە ورەزامەندی دەربری لەسەر داواکەی وەسەرکەوت لەجێ بەجێ کردنی بۆ پرۆژەکە کە پێشتر ئامازەمان پێ کرد [١٤].

دەکرێ بلێین کەوا وولاتی عێراق وگەلەکەی هەلوێستیان باش بوو وەپشت گیریان کرد لە دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی وەخەڵکی عێراق پێشوازیان لەم هەنگاوە کرد وەکارێکی باشیان زانی بۆ یەکێتی ولاتانی عەرەبی بەلام دواتر بۆیان روون بۆوە کە ئەمە بۆ مەبەستی پاراستی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا بووە چونکە نوری سەعید سەرۆك وەزیرانی عێراق بۆ خزمەتی بەرژەوندیەکانی بەریتانیا کاری دەکرد بەلام هەڵویستی خەڵکی عێراق نەگۆر بوو هەولی سەرکەوتنی یەکێتی عەرەبیان دەدا و تێدەکۆشان لەپێناو بەدەست هێنانی مافەکانی گەڵی عەرەب ورووبەروو بونەوەی داگیرکەران لەنیشتمانی عەرەبی.

## باسی سێیەم:

## رۆڵ وهەڵوێستی وولاتی میسر بەرامبەر بە دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی

### أ- رۆڵی وولاتی میسر لەدامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی

لەراستی دا دروشمی یەکێتی عەرەبی هیوایەکی بەرز وگرنگی گەلی عەرەبی بوو لەهەموو ولاتانی عەرەبی، ئەم هیوایە لەدەزگاکانی ئەلمانی بلاوکرایەوە بەمەبەستی راکێشانی هەست وسۆزی گەلی عەرەب لەجەنگی دووەمی جیهانی وە داوای سەربەخۆی ولاتانی عەرەبی دەکات وەبەگوێرەی ئارەزووی دانیشتوان ئەمەش بووە هۆی وورووژاندنی هەستی رای گشتی عەرەبی [١٥]. ئەمە لەرووی بارودۆخی نێو دەولەتی ئەمە بارودۆخی بۆبەریتانیا ئالۆز کرد چونکە زۆربەی ولاتانی عەرەبی لەژێر دەسەلاتی بەریتانیابوو، ئەمەش ئاسان نەبوو بۆ بەریتانیا بۆیە دوای سەرکەوتنی ئەلمانیا لەبەرەکانی ئەوروپا وە هەروەها لەناوچوون وتێکشکانی هێزەکانی فەرەنسا بەرامبەر بەهێزەکانی ئەلمانیا وە تەسمیل بوونی هێزەکانی فەرەنسا بەبێ مەرج ئەمەش کاری کردە سەر جەبهەی ئەفریقیاش، بەریتانیا هەوڵی دا کە ئەمە فراوان نەبێ وتەشەنەنەکات وناوچەکانی تر نەگرێتەوە بۆیە هەر زوو وەزیری دەرەوەی بەریتانی ئەنتۆنی ئایدن لێدوانێکی دا لە٢٩ئاياری ١٩٤١رای گەیاند کەوا لەلای بەریتانیا کارێکی ئاسایە کەوا ولاتانی عەرەبی یەکێتی، پێك بهێنی بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیەکانی ولاتانی عەرەبی لەرووی سیاسی وئابووری وکۆمەلایەتی [١٦].

گومانی تێدا نیە کەوا بەریتانیا رەزامەندی دەربریوە لەسەر یەکێتی عەرەبی لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندیە ستراتیژیەکانی خۆی لە ولاتانی عەرەبی وەهەروەها راکێشانی رای گشتی ولاتانی عەرەبی بۆ لای خۆی کەئەمەش جۆرێك

بوو لە فرِوفێڵەکانی دژ بەئامانجەکانی گەلّی عەرەب، بەلام وولاتی میسر رۆلێکی بەرچاوی بیینی لەدامەزراندنی کۆمکاری ولآتانی عەرەبی دوای ئەوەی کەنحاس سەرۆك وەزیرانی میسر وەسەرۆکی حزبی وەفدی میسری پێشنیاری کرد بۆ ولآتانی عەرەبی بۆ ئەوەی نوێنەری خۆیان بنێرن بۆ لیژنەی ئامادەکاری بۆ دامەزراندنی کۆمکاری ولآتانی عەرەبی لەشاری ئەسکەندەریە لیژنەی ئامادەکاری دەستی بەکارەکانی خۆی کرد دوای ئەوەی کەنوێنەری ولآتانی عەرەبی هاتن وەبرۆتۆکۆلی ئەسکەندەریە بەسترا دوای ئەوەی گفتگۆیەکی زۆر کرا لەسەر چۆنیەتی دامەزراندنی کۆمکاری ولآتانی عەرەبی ودیاری کردنی پرە نسیپەکان وبنەماکانی کۆمکاری عەرەبی وەهەروەها ئامانجەکانی ودواتر پێشنیاری هەریەکێك لەنوێنەرانی ولآتانی عەرەبی خرانە روو دواتر گفتوگۆیان لەسەر کرا لەکۆتایدا تاوتوێی پرۆژەکانی وولاتی عێراق کرا لەگەلّ پرۆژەکەی لوبنان دواتر پەسەند کران ئێنجا بریاری دامەزراندنی کۆمکاری ولآتانی عەرەبی درا، ئەبێ ئەوەش بزانین کە وولاتی میسر رۆلێکی باشی بیینی بۆ سەرکەوتنی ئەم یەکێتیەی کە لەنێوان ولآتانی عەرەبی هاتە ئاراوە وەهەروەها لەسەر ئاستی جەماوەریش پێشوازیەکی زۆری لیّ کرا وە رۆژنامەکان رۆلی بەرچاویان بیینی، جگە لەوەی کەوا هونەرو سینمای میسری رۆلێکی ئەکتیڤیان بیینی بۆ راکێشانی هەستی نەتەوایەتی وسەرکەوتنی دامەزراندنی کۆمکاری ولآتانی عەرەبی [١٧].

**ب ـ هەلوێستی وولاتی میسر بەرامبەر بە دامەزراندنی کۆمکاری ولآتانی عەرەبی**

شایانی باسە سەرۆکایەتی میسر بەتایبەتی مصطفى نحاس رۆلێکی بەرچاوی بیینی لەسەرەتای پێشنیار کردنی داوەتانامەی کە نارد بۆ ولآتانی عەرەبی زۆر

بەبایەخەوە لەلایەن وڵاتانی عەرەبی پشتیوانی لیٚ کرا وەهەروەها بۆیە میسر بەم کارەش هەڵسا بەهۆی بوونی پێگەی وولاتی میسر وشوێنی جوگرافی یەکەی کە هەرسیٚ قارەی ئاسیا وئەورووپاو ئەفریقیا بەیەکەوە دەبەستێتەوە، جگە لەوەی کەووتوێژەکان تێرو تەسەل بوو وەپێشنیاری وولاتان خرانە روو وەلیژنە پێکهات کە سیٚ بۆچوونی لەخۆ گرتبوو ئەوانیش یەکێکیان داوای دامەزراندنی وولاتێکی عەرەبی یەکگرتووی دەکرد لەژێر دەسەلاتی ناوەندی، بۆچوونی دووەم داوای دامەزراندنی دەولەتێکی اتحادی و برلمانی اتحادولیژنەی اتحادی یەکگرتووی دەکرد، دوا بۆچوون داوای رێکەوتن وهاوکاری کردنی دەکرد لەنێوان وڵاتانی عەرەبی بۆیە بۆچوونی سێیەم سەر کەوت ئەمەش بەهۆی رۆڵی میسر وعێراق بوو، وەهەروەها دوای ئەوەی گفتو گۆ تەواو بپرۆتوکۆلی ئەسکەندەریەبوو بەڵگەنامەی یەکەم بۆ کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی کەبریارەکانی بریتی بوو لە:

١–کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی پێك دێت لەوڵاتانی سەربەخۆی عەرەبی وە ئەنجومەنێك دانرا کەنوێنەری وولاتەئەندامەکانی تیدایە.

٢–بریارەکانی ئەنجومەن پابەندە بەهەموو ئەو بریارانەی کەوا قبول کراوە لەلایەن وڵاتانی ئەندام.

٣–نابیٚ هێز بەکاربیٚ لەکاتی بوونی ناکۆکی نێوان دوو وولاتی ئەندامی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی.

٤–نابیٚ سیاسەتی دەرەوە وڵاتانی ئەندام زیان بەسیاسەتی دەرەوەی کۆمکار بگەینیٚ.

٥–دان نان بەسیادەوسەربەخۆی لوبنان بەگوێرەی سنورەکەی.

٦–جەخت کرایەوە لەسەر دابین کردنی مافی عەرەبەکانی فەلەستین [١٨].

دەکـرێ بلـێین کـەوا خـەڵکی میـسر هەلوێـستێکی بەرچـاو کارایـان بیینـی لەپێشنیارکردنی پرۆژەی دامەزراندنی کۆمکـاری وڵاتـانی عـەرەبی وسەرخـستنی ئەم پرۆژەیە بەهاوکاری وهەم ئاهەنگی لەگـەڵ وڵاتـانی تـری ئەنـدام لـەکۆمکاری وڵاتانی عەرەبی بەتایبەتی رۆڵی بەرچاوی سەرۆك وەزیرانی عێـراق نـوری سـەعید وهەولدانی بۆرازی کردنی وڵاتانی تری عەرەبی بۆ بەشداربوونیان بۆ ئەم کۆنگرە بۆ دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی وەهەروەخا سەرخستنی ئـەم پـرۆژەی کـە لەلایـەن سـەرۆك وەزیرانـی میـسری پێـشنیار کرابـوو، وەخـەلکی میـسریش هەلوێـستێکی دیـارو باشـیان هـەبوو لەسـەرکەوتنی ئـەم پرۆژەیـەی نحـاس، رۆشنبیرانی میسریش بیٚ بەش نەبوون لەهەلوێـست بەرامبـەر بەیـەکێتی وڵاتـانی عەرەبی،وەرۆلێکی ئەکتیڤیان هەبوو لەوانە هونەرو سـینماو رۆژنامـەکان کـارێکی زۆر گەورەیان کردە سەر هەستی نەتـەوەی عـەرەبی وپالپـشتی کردنیـان لەسـەر کەوتنی پرۆژەی دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی.

## باسی چوارەم :

## هەلوێستی وڵاتـانی تری عەرەبی بەرامبەر بە دامەزراندنی کۆمکاری عەرەبی

لەنیوەی ئابی ١٩٤٣ حکومەتی میسری داوەتنامەیەکی ئاراستەی هەریـەك لـە وڵاتانی عێراق وسـوریا ولوبنـان وپاشانـشینی عـەرەبی سـعودی ویەمـەن کـرا بـۆ بەشداری کردن کۆبونەوە بەئامانجی دامەزرانـدنی یـەکێتی عـەرەبی وە نوێنـەری وولاتان بەشێوەیەکی رەسمی بەشدار بوون نوێنەری عیراق نـوری سـعید سـەرۆك وەزیران وتوفیق ابوهدی سـەرۆك وەزیرانـی خۆرهـەلاتی ئـوردن وسـعدالله جـابری سـەرۆك وەزیرانـی سـوریا وە شـێخ یوسـف یاسـین نوێنـەری سـعودیا وە حـسین قبیسی نوێنەری یەمەن [19].

هەلوێستی خۆرهەلاتی ئوردن بەتەواوی پالپشتی لەپێشنیارەکانی میسر کرد وەبەشداری کرد وەهەولی یەکگرتنی یەکێتی سوریای دەدا وەهەروەها داوای یەکگرتنی سوریای گەورە دەدا.وەنوێنەری سوریاش پشتگیری تەواوی وولاتەکەی دەربری بۆ پێشنیارەکەو هەولی دا کەوا پەیوەندیەکی بەهێز هەبێ لەنێوان ولاتانی عەرەبی، وەهەلوێستی نوێنەری لوبنان هاوسۆزی وولاتەکەی دەربری بۆ ئەم پرۆژەیەی کەلەلایەن میسر پیشکەش کراوە وە داوای هاوکاری دەکرد لە ولاتانی عەرەبی بۆ ئەوەی دان بنێن بە سیادەو سەربەخۆی لوبنان، وولاتی سعودیا خوازیار بوو کەوا هاوکاری ولاتانی عەرەبی لەچوارچیوەی ئەنجومەنی نا جێ بەجێ کاری بێ وە نوێنەری سعودیا ئامادەی وولاتەکەی دەربری بۆ هاوکاری کردنی ولاتانی عەرەبی لەرووی رۆشنبیری وئابووری وە بارودۆخی سیاسیش لەبەرچاو بگرن وە پشتگیری لەپرۆژەکەی نحاس دەکات چونکە دەترسا لەپرۆژەکانی یەکێتی کە هاشمی پیشنیاری کردبوو بۆ وە پەیوەست بوو بە یەکێتی ولاتانی عەرەبی، بەلام هەلوێستی سەرۆك وەفدی یەمەن باسی لە بیرۆکەی هاوکاری کرد لەلایەنی ئابووری ورۆشنبیری لەنێوان ولاتانی عەرەبی بەمەرجێ پارێزگاری بکرێ لەسیادە ومافەکانی ولاتانی عەرەبی وە هاوکاری یەکتری بکەن لەسەر ئەساسی یەکسانی نیوان ولاتانی عەرەبی[٢٠].

لێرەدا دەتوانین بلێین هەموو ولاتانی عەرەبی کەبەشداربوون لەو کۆنگرەیەی کە بۆ پرۆژەکەی سەرۆك وەزیرانی میسر بەسترا بۆ دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی دەردەکەوێت کەهەموو ولاتانی بەشدار بووی کۆنگرە داکۆکی دەکەنەوە لەسەر یەکێتی ولاتانی عەرەبی وە ئامانجیان پاراستنی بەرژەوەندی هاوبەشە وە هەروەها پاراستنی گیانی هاوکاری ویارمەتی دان

وهەنگاو نـان بـەرەو یـەکێتی نەتـەوەی عـەرەبی، هەرچـەندە هەنـدێك بیروڕایـان جیـاواز بـوو لەسـەر شـێوازی یـەکگرتنی وڵاتـانی عـەرەبی وە کـارکردن لـەپێناو وەدیهێنــانی گیــانی هاوکــاری وبــەهێز کردنــی پەیوەندیــە ئــابووری وسیاســی وکۆمەڵایەتی وڕۆشنبیریەکان.

## باسی پێنجەم:

## هەڵوێستی بەریتانیا بەرامبەر بەدامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی

دوابــەدوای دەســت پێکردنــی جــەنگی دووەمــی جیهــانی لــەنێوان وڵاتــانی هاوپــەیمان ووڵاتــانی میحــوەر، لــەوڵاتانی عــەرەبی بەتایبــەتی لەلایــەن چــینی رۆشنبیران بیرۆکەی یەکێتی عەرەبی سەری هەڵدا، وە دروشمی ئەم یەکێتیە بـوو بەئامانج ودروشمی گـەلی عـەرەبی لەزۆربـەی وڵاتـانی عـەرەبی، لەلایـەکی تـریش ئەلمانیا کەلەبەرەی دژ بەبـەریتانیا دەجـەنگا لـەدەزگاکانی راگەیانـدن دروشمـی یەکێتی بۆ وڵاتانی عەرەبی بـەرز کـردەوە، وەزۆر بەبایەخـەوە گرنگـی دەدا بـەو مەسەلەیە بۆئەوەی بتوانێ هەست وسۆزی گەلی عـەرەبی بـۆ خـۆی رابکێشێ بـۆ ئەوەی لایەنگری بکەن لە دژی بەرەی هاوپەیمانان بەتایبەتی بەریتانیا، ئـەلمانیا داوای ئەوەی دەکرد کەپێویستە وڵاتانی عەرەبی سەربەخۆ بن بەگویرەی ویستی دانیشتوان عەرەبی، ئەم هەنگاوەی ئەلمانیا زۆر کاریگەر بوو ووروژاندنی هەستی نەتەوەی عەرەبی ورای گشتی [٢١].

لەراستی دا ئەم بارودۆخە کاری کردە سەر بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا چونکە لەلایـەك رای گـشتی عـەرەبی بـەرەو لای ئـەلمانیا دەچـوو،لەلایەکی تـر ئـەلمانیا ســەرکەوتنێکی گــەورەی بەدەســت هێنــا لەبــەرەکانی جــەنگ دژبەفەرەنــسای

هاوپەیمانی بەریتانیا وەتوانی سوپای فەرەنسا بەدیل بگریێ، وەهەروەها لە خۆرهەلاتی عەرەبی شۆرشی مایس لەعێراق سەری هەلدا کەئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا، وەسوپای میحوەر لە سوریاو لوبنان بوو، وەگەلی عەرەبی لەفەلەستین وخۆرهەلاتی ئوردن زۆر بەپەرۆش بوو ن بۆ رزگار بوون لەژێر دەسەلاتی هاوپەیمانان وترسناکی سەهیۆنی، بەریتانیا هەولی دا کە ئەو یەکێتیەی عەرەب داوای دەکەن وهەولی بۆ دەدەن لەناوی ببات، بۆیە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا ئەنتونی ئایدن لە ٢٩ئایا ١٩٤١رایگەیاند کەزۆربەی بیرمەندەکانی عەرەب داوای جیێ بەجیێ کردنی یەکێتی عەرەبی دەکەن لەنێوان ولاتانی عەرەبی بۆ هاوکاری وبەهێزکردنی پەیوەندی ئابووری ورۆشنبیری وکۆمەلایەتی یە ئەمەش لای بەریتانیا ئاسایە [٢٢].

لێرەدا دەکریێ بلێین کەوا ئەو راگەیانراوەی بەریتانیا هەژماربکریێ بە پێچ وپەناوفێلی سیاسی کەئامانجی پاراستنی بەرژەوەندیەکانیەتی لە ولاتانی عەرەبی، وەرازی کردنی رای گشتی عەرەبی وە دامرکاندنەوەی ئەوبیرۆکەی کەئاراستەکە بەرەو یەکێتی نەتەوەی عەرەبی دەبات بەبیێ ئەوەی ئەم یەکێتیە ناکۆك بێت لەگەلێ بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا، بەلام دواترئەم بیرۆکەیە لەناو ولاتانی عەرەبی فراوانتر بوو زیاتر چووە ناو ناخی تاکەکانی عەرەبی وهەنگاوی نا بەرەو یەکێتیەکی راستە قینە، وەئەم راگەیاندراوەی بەریتاندیا پێشوازی لیێ کرا لەلایەن ولاتانی عەرەبی.

دوابەدوای ئەوەی کەوا بەریتانیا یەکێتی ولاتانی عەرەبی لای ئاسایی بوو بۆیە سەرۆك وەزیرانی میسر مصطفی نحاس بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی سەری هەلدا وە داوای لەولاتانی عەرەبی کرد کەوا نوێنەری

خۆیان بنێرن بۆ بەشداری کردن لە کۆنگرەی ئامادەکاری بۆ دامەزراندنی کۆمکاری عەرەبی بۆ یە لەلایەن وڵاتانی عەرەبی پێشوازی گەرمی لێکرا وەرۆشنبیرانی عەرەبیش توانیان رۆڵی خۆیان ببینن، سەرۆك وەزیرانی عێراق نوری سەعید رۆڵێکی کارای هەبوو، هەندێك لەتوێژەران پێیان وایە کەوا میسر سەرکردایەتی ئەم بیرۆکەیەوئەم یەکێتیە دەکات لەبەر چەند هۆکارێك لەوانەبوونی کەسانی هاوکاری بەریتانیا لەمیسر لەوانە نحاس کە بەزەبری هێز ببووە سەرۆك وەزیرانی میسر وە بەریتانیای دڵنیا کردبۆوە لەوەی کە دروست کردنی کۆمکاری عەرەبی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا دەپارێزێت، وەشوێنی جوگرافی میسر کەهەرسێ قارەی ئاسیا وئەوروپا وئەفەریقیا بەیەکەوە دەبەستێت ئەمەش هۆکارە،وەهەروەها پێشەنگی وڵاتانی عەرەبی بوو لەرووی رۆشنبیری وئابووری وسیاسی، وەژمارەی دانیشتوانی زۆربوو لەناوچەکەدا، وەبەریتانیا داوای لەسەرکردایەتی میسر کرد کەمیسر سەرکردایەتی یەکێتی عەرەبی بکات بۆ کەمکردنەوەی داواکاری گەلی عەرەبی، دوابەدوای دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی وە بەرەو پێش چوونی رووداوەکان لەوڵاتانی عەرەبی ونێو دەولەتی لەوساڵەی کەکۆمکار دامەزرا لە ١٩٤٥سیاسەتی بەریتانیا گۆرا لەتێروانین وهەڵوێستی بەرامبەر بەکۆمکاری وڵاتانی عەرەبی کەهەڵوێستەکەی بریتی بوو دژایەتی کردنی کۆمکاری عەرەبی لەجیاتی پالپشتی ولایەنگری وە هەڵوێستی بووە پاڵپشتی کردن لەپرۆژەکەی هاشمی کەداوای یەکێتی سوریای گەورەی دەکرد [٢٣].

## دەرەنجـــام

ئـەم توێژینەوەیـە لـە بـاس لـە بیرۆکـەی دامەزرانـدنی کۆمکـاری وڵاتـانی عـــەرەبی دەکـــات، منـــیش لەئـــەنجامی توێژینەوەکـــەم گەیـــشتمە ئـــەم دەرئەنجامانەی خوارەوە:

١- لـەم توێژینەوەیـە دەرکـەوت کـەوا بیرۆکـەی دامەزرانـدنی کۆمکـاری وڵاتـانی عەرەبی بۆیەکەم جـار لەلایـەن سـەرۆك وەزیرانـی میـسری پێـشنیارکرا، ئەمـەش دوای ئەوە هات کەوا وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بۆپاراستنی بەرژەوەندیـەکانی رەزامەندی دەربری لەسەر یەکێتی عەرەبی وەبەستنی پەیوەندی هاوکاری نێوان وڵاتانی عەرەبی لەرووی ئابووری وکۆمەلایەتی ورۆشـنبیری، وەراکێـشانی سـۆزی گەلانی عەرەب بۆ لای خۆیان واتەبەریتانیا لـەناو جـەنگی دووەمـی جیهـانی بـوو بۆیە نەیویست بارودۆخی وڵاتانی عـەرەب کەلـەژێر بەرژەوەنـدی خـۆی بـوو تێـك بچێ ودژی بوەستنەوە.

٢- دەکرێ بڵـێین کـەوا هـەردوو وولاتـی میـسر وعێـراق رۆڵـی بەرچـاویان هـەبوو لەدامەزرانـدنی کۆمکـاری وڵاتـانی عـەرەبی بەتایبـەتی نـوری سـەعید سـەرۆك وەزیرانی عێراق ومصطفی نحاس سەرۆك وەزیرانی میسر وەهەولەکانیان بۆ رازی کردنی بەریتانیا وراکێشانی سۆزی گـەلی عـەرەب بـوو بـۆ لای خۆیـان وبەدەسـت هێنانی دەسکەوتی تایبەتی.

٣-گومانی تێدانیە کەبەریتانیا لەترسی ئەوەی کەوا سۆزی گـەلی عـەرەب بـەرەو لای ئەلمانەکان بچێ ، بۆیـە ئـەم بریـارەی دا وەهـەروەها ئـەوکات لەشـەر دابـوو لەبـــەرەی دژ بەئـــەلمانیا وەهـــەوەها ئـــەلمانیا ســـەرکەوتبوو بەســـەر ســـوپای

هاوپەیمانی بەریتانیا کەفەرەنسا بوو وەمەترسی کەوتەسەر بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لە میسر وئەفریقیا.

٤-لەلایەکی تر بەریتانیا ترسا لەوبڕیارەی کە ئەلمانیا رایگەیاند کەپێویستە وڵاتانی عەرەبی یەکێتی پێك بهێنن وسۆزی عەرەب بۆخۆی رابکێشێت ، وەهەروەها پشتگیری گەلی عەرەبی بەدەست بهێنی دژی بەریتانیا بۆیە هەر زوو بەریتانیا لەسەر زاری وەزیری دەرەوە رایگەیاند کە رۆشنبیرانی عەرەب دەیانەوی یەکێتی پێك بهێنن بۆ هاوکاری ئابووری ورۆشنبیری وکۆمەلایەتی ئەمەش بەلای بەریتانیا ئاسایی یە بۆیە ئەم لێدوانەی دا تا بەرژەوەندیەکانی نەکەوێتە مەترسی لەناوچەکە.

٥-لەم توێژینەویە دەردەکەوێ کەبەریتانیا خاوەن هەلوێستێکی ناجێگیرە چونکە سەرەتا رازی بوو لەسەر دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی بەلام دوای ئەوەی دیتی هەنگاو بەرەو یەکگرتن دەنێن وکاردەکاتە سەر بەرژەوەندیەکانی یەکسەر لەلایەنگری بوو بە بەرهەڵستیکاری یەکێتی عەرەبی وهەلی داپشتگیری لەبیرۆکەکەی هاشمی بکات.

٦-لەم توێژینەویەدا تێبینی ئەوەم کرد هەڵوێستی وڵاتانی عەرەبی بۆ یەکێتی عەرەبی سێ جۆر بوو بەلام هەرهەموویان کۆك بوون لەسەر یەکێتی عەرەبی بەلام بەشێوازی جیاواز بەلام دواتر رەزامەندی درا لەسەر دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی وکارکردن لەپێناوی هاوکاری کردن لەنێوان وڵاتانی ئابووری وکۆمەلایەتی وگیانی یەکسانی وپاراستنی بەرژەندی هاوبەشی نەتەوەی عەرەبی.

٧- لەلایەکی تر نوری سەعید ئەو رۆلە گرنگ وگەورەی بینی لە دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی بەلام دواتر لە تورکیا رایگەیاند کەپێویستە عێراق

لەکۆمکاری عەرەبی پاشەکشەی بکات هەرچەندە حکومەت گوێی بەداویەکەی نەدا چونکە نوری سەعید لەپێناوی بەرژوەندی بەریتانیا کاری دەکرد.

٨-دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی هەنگاوێکی گەورە بوو لەمێژووی نەتەوەی عەرەب بۆ یەکێتی وڵاتانی عەرەبی ولێك نزیك بوونەوەی وڵاتانی عەرەبی وهەم ئاهەنگی کردنی وڵاتانی عەرەبی لەزۆربەی بوارە جیاجیاکان دا،کارکردن لەپێناو پارستنی سیادەی عەرەبی و راوەستان دژلی ئیستیعمار وە بەدەست هێنانی مافی فەلەستین وسنوور دانان بۆ جولەکە، وەهەروەها گوررزێکی ترسناك بوو کەبەر بەریتانیا کەوت لەرووی ئابووری وسیاسی، وەهەروەها کاری کردە سەر بەرژەوندیەکانی بەریتانیا لە وولاتی عەرەبی.

٩- ئەوەی شایانی تیبینی کردن بوو ئەوە بوو کەرۆشنبیرانی عەرەبی بەتایبەتی لە وولاتی عێراق ومیسر رۆلی بەرچاویان هەبوو لەووشیار کردنەوەی نەتەوەی عەرەبی وهۆکارێکی کاریگەر بوون بۆ سەرخستنی برۆتۆکۆلی ئەسکەندەریە، وە دواتر دامەزراندنی کۆمکاری وڵاتانی عەرەبی ئەو رۆلەش لەرێگەی هونەر وسینەماو رۆژنامە وراگەیاندن بوو چ راگەیاندنی سەر بەحکومەت یاخود راگەیاندنی ئەهلی، ئەم کاریگەریش بووە هۆکاری وورووژندنی هەستی نەتەوایەتی عەرەبی وسەرکەوتنی پرۆژەکە.

## پەراوێزەکان

[1]- محمد علی القوزی، دراسات فی تاریخ العرب المعاصر، ط١،بیروت، ١٩٩٩،ص٤٩٩.

[2]- پرۆتۆکۆلی ئەسکەندەریە: ئەو پرۆتۆکوله بوو لەتەمووزی ١٩٤٤دانرا دوای ئەوەی مصطفی نحاس سەرۆك وەزیرانی میسر داوای لەولاتانیسەربەخۆی عەرەبی کرد کەبەشداری بکەن لە دامەزراندنی کۆمکاری ولاتانی عەرەبی دوای گفتوگۆ پێشنیارەکان خرانە روو وە ئەرکەکانی ئەنجومەن دیاری کرا ئەمە پێی دەوترێت پرۆتۆکۆلی ئەسکەندەریە کە لە٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٤ بەسترا. بۆ زانیاری زیاتر بروانە:رحیم عوید نغمیش، التنظیم الاداری لجامعة الدول العربیة، قاهیرة، ١٩٩٠،ص٢٨٧.

[3]- ابو خلدون ساطع الحصری، أراء واحادیث فی القومیة العربیة، ط٢،بیروت، ١٩٨٥،ص١٥.

٤- محمد طلعت الغنیمی، جامعة العربیة دراسات قانونیة سیاسیة، القاهیرة، ١٩٧٤،ص١٩.

[5]- محمد حافظ غانم، العلاقات الدولیة العربیة، مطبعة النهضة الجدیدة، القاهیرة، ١٩٦٧،ص٣٤١.

[6]- محمد حافظ غانم، نفس المصدر، ص٣٤٥.

٧- عادل احمد امین، الفکر القومی، دار المعارف، القاهیرة، ١٩٧٠،ص١٢١.

٨- مجدی حماد، الوحدة العربیة، تجاربها وتوقعاتها، مرکز دراسات الوحدة العربیة، بیروت،١٩٨٥،ص٣٥٢.

[9]- احمد محمود جمعة، تاریخ المصریین،انشاء جامعة الدول العربیة مقدمتها وتطورها، ج٢٠٠٦،٣،ص٤٢٤.

١٠- سامی الحکیم، میثاق الجامعة العربیة والوحدة العربیة، المطبعة الفنیة الحدیثة، القاهیرة، ١٩٦٦،ص٢١٤.

١١- سامی الحکیم،المصدر نفسه، ص ص ٥٦-٥٧.

١٢- عبدالرزاق الحسنی، الاصول الرسمیه فی تاریخ الوزارات العراقیة فی العهد الملکی الزائل، بیروت، ١٩٦٤،ص٢٠٧.

١٣- محمد فاضل المجالی، من واقع السیاسة العراقیة، بیروت، ١٩٥٦،ص١٩.

١٤- عبدالرزاق الحسنی، تاریخ الوزارات العراقیة، ط٥،ج٦،صیدا، ١٩٧٨،ص١٥٠.

١٥- ابو خلدون ساطع الحصری، أراء واحادیث فی القومیة العربیة، المصدر السابق، ص ص ١٥-١٦.

١٦- ابو خلدون ساطع الحصری، أراء واحادیث فی القومیة العربیة، المصدر السابق، ص ١٥.

١٧- يحيى حلمى رجب، الرابطة بين جامعة الدول العربية ومنظمة الوحدة الافريقية، مطبعة دار الشعب، القاهرة، ١٩٧٦،ص ص ١٨-١٩.

١٨- احمد الشقيرى، علم واحد وعشرون نجمة، المطبعة والسنة لاتوجد، ص٣٣٧.

١٩- الحكيم،ميثاق الجامعة العربية والوحدة العربية، المصدر السابق، ص٣٠.

٢٠- احمد الشقيرى، الجامعة كيف تكون جامعة، تونس، ١٩٧٧،ص٣١.

٢١- عبدالرزاق الحسنى، تاريخ الوزارات العراقية، ط٥،ج٦،المصدر السابق، ص١٥٠.

٢٢- انيس الصايغ، الهاشميون وقضية فلسطين، بيروت، ١٩٦٦،ص٣١٤.

## ليستى سەرچاوەكان


١-ابو خلدون ساطع الحصرى، أراء واحاديث في القومية العربية، ط٢،بيروت، ١٩٨٥.

٢- احمد محمود جمعة، تاريخ المصريين،انشاء جامعة الدول العربية مقدمتها وتطورها، ج٦،٢٠٠٦.

٣- احمد الشقيرى ، الجامعة كيف تكون جامعة، تونس، ١٩٧٧.

٤-احمد الشقيرى، علم واحد وعشرون نجمة، المطبعة والسنة لاتوجد.

٥-انيس الصايغ، الهاشميون وقضية فلسطين،بيروت، ١٩٦٦.

٦- سامى الحكيم، ميثاق الجامعة العربية والوحدة العربية، المطبعة الفنية الحديثة، القاهرة، ١٩٦٦.

٧-عادل احمد امين، الفكر القومى، دار المعارف، القاهرة، ١٩٧٠.

٨- عبدالرزاق الحسني، الاصول الرسمية في تاريخ الوزارات العراقية في العهد الملكي الزائل، بيروت، ١٩٦٤.

٩- عبدالرزاق الحسنى، تاريخ الوزارات العراقية، ج٥،صيدا، ١٩٦٧.

١٠- رحيم عويد نغميش، التنظيم الادارى لجامعة الدول العربية، قاهرة، ١٩٩٠.

١١- مجدى حماد، الوحدة العربية، تجاربها وتوقعاتها، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت،١٩٨٥.

١٢- محمد فاضل المجالى، من واقع السياسة العراقية، بيروت، ١٩٥٦.

١٣-محمد على القوزى، دراسات في تاريخ العرب المعاصر،ط١،بيروت، ١٩٩٩.

١٤- محمد طلعت الغنيمى، جامعة العربية دراسات قانونية سياسية، القاهرة، ١٩٧٤.

١٥-محمد حافظ غانم، العلاقات الدولية العربية، مطبعة النهضة الجديدة، القاهرة، ١٩٦٧.

١٦-يحيى حلمى رجب، الرابطة بين جامعة الدول العربية ومنظمة الوحدة الافريقية، مطبعة دار الشعب، القاهرة، ١٩٧٦.

# پەیوەندی و هەڵوێستی عەبدولکەریم قاسم بەرامبەر کورد

ئامادەکردنی: م. ئارام مەجید عەلی

## پێشەکی

سەرکەوتنی شۆڕشی تەموز لەعێراق بووە هۆی گەشەسەندنی چالاکی سیاسی جەماوەری،ئەم پرۆسەیە بایەخێکی زۆر گرنگی هەبوو بەتایبەتیش بۆ جەماوەری کارای کوردستان کەلەتوانایدا بوو بەشداری بکات بەشێوەیەکی کاریگەر لەخەبات و تێکۆشانی گشتی دیموکراتی خوازانە،لەئەنجامیشدا شۆڕشی ١٤ی تەموزی ساڵی ١٩٥٨ی عێراق ئومێدێکی گەورەی بەتەواوی گەلی عێراق بەگشتی و گەلی کورد بەتایبەتی بەخشی،ئەویش بەپێدان و دابینکردنی بەشێك لەمافەکانی هەر گەلێکی ئازاد بۆیان،ئەم مافانەش لەسەرەتای هاتنە سەردەسەلاتی ئەوان بوو تاپێگەو هێزی خۆیان بەهێزکرد و دواتر ئەوەی وتیان و ئەوەی ویستیان بیکەن تەنها بوو بەخەون و وەك مەرەکەبی سەرکاخەز پێش وشکبوونەوەی سڕایەوە،سەرئەنجام ئەم مانگە هەنگوینییەی نێوان و کورد و حکومەتی تازەی عێراق زۆری نەخایاند و حکومەت لەبەڵێنەکانی بەرامبەر گەلی کورد پەشیمان بویەوە،ئەمەش دیسانەوە خولێکی دیکەی نائومێدی و ڕەشبینی بەکورد بەخشییەوە و ئەو خەونەی ئاواتی بۆ دەخواست نەهاتەدی و کێشەکەی بردەوە خاڵی سەرەتا،بەمەش کێشەی کورد لەو قۆناغەدا بەماوەیەکی مێژووی

یەکجار گرنگدا تێدەپەڕێت لەعێراق چ لەسەر ئاستی گۆڕانکاریە سیاسیە هەرێمییەکان بەگشتی و نێوخۆی عێراق بەتایبەتی،چونکە گۆڕانی ڕژێمی پاشایەتی لەعێراقدا و دامەزراندنی سیستەمێکی کۆماری بۆ یەکەمین جار بەفاکتەرێکی گرنگ دادەنرێت کە کورد بتوانێت بەشێك لە مافە نەتەوایەتیەکانی دەستەبەر بکات،بەلاّم ڕووداوە سیاسیەکان بەقازانجی کێشەی کوردا هەنگاوی نەنا بەهۆی پاشگەز بوونەوەی قاسم و سەرانی شۆرشی تەموز لەبەلێنەکانیان بەرامبەر بەکورد،سەرئەنجام هەلوێسی قاسم لەسەرەتادا لەپێناو چەسپاندنی دەسەلاّتی خۆی بریتی بوو لەوەی چەند بەلێنێك بە کورد بدات بەلاّم دواتر لەو هەلوێستانە پەشیمان بوویەوە و بۆ کورد دەرکەوت هەلوێستی قاسمیش وەك هەمان هەلوێسی سەرکردەکانی دیکەی عێراقە، ئیدی لێرەوە کورد هەنگاو لەدوای هەنگاو بەرەو نەهامەتیەکان و قۆناغەکانی شەڕ هەنگاوی دەنا،هەرچەندە کەسایەتیەکی وەك مستەفا بارزانی و هەوادارانی چەندین جار هەولّی ئاشتیخوازانەیان داوە بۆ ڕازیکردنی قاسم و دەست و پەیوەندەکانی بەئاراستەی چارەسەری کێشەی کورد بەلاّم بەهۆی ملنەدانی قاسم و دەسەلاّتە تاك ڕەوییەکەی سەرئەنجام کوردی ڕووبەڕووی شۆڕێکی دیکەی خوێناوی کردەوە ئەویش شۆڕشی ئەیلول بوو لەساڵی ١٩٦١دا ئەمەش تا لەناوچون و نەمانی قاسمدا بەردەوام بوو، هۆکاری هەلبژاردنی ئەم بابەتە بۆ گرنگی ئەو قۆناغە مێژووییە دەگەڕێتەوە کە ڕووی لەعێراق و کوردستان کرد و ئەو گۆڕانکارییە گرنگەی لەدەسەلاّتی عێراقدا لەگۆڕانی سیستەمی پاشایتی بۆ سیستەمی کۆماری ڕوویدا و کوردیش دەیویست لەو گۆڕانکارییەدا بەمافەکانی خۆی بگات و ئاشنابوونی توێژەرە لەپەیوەندی و هەولّویستی (عەبدولکەریم قاسم)بەرامبەر بەکورد، لەنوسینەوەی ئەم توێژینەوەیەدا پشتمان بەڕێبازی توێژینەوە بەستوە

و هەوڵمانداوە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی بەکار بهێنین لەنوسینەوەی ناوەڕوك و پەراوێزەکان و ڕێکخستنی بابەتەکە بەپێی ڕووداوی مێژوویی، گرفتی ئێمەش لەم توێژینەوەیەدا کێشەی زمانە،ئەمەش لەبەرامبەر ئەوەدا کەبەشێکی زۆری سەرچاوەکانی تایبەت بەو قۆناغە مێژووییە بەعەرەبی بوو ئەمەش وایکرد ئێمە نەتوانین سوود لەو سەرچاوانە وەربگرین و توێژینەوەکەی پێ دەوڵەمەند بکەین،بەڵام ئەوەی بەنیسبەت ئێمەوە گرنگ بوو ئەنجام درا، پێکهاتەی ئەم توێژینەوەیە دابەشکراوە بەسەر چوار تەوەی سەرەکیداو لەم چوارچێوەیەشدا خۆیان دەبیننەوە وەك،تەوەری یەکەم پەیوەندی کورد و شۆڕشی چواردەی تەموز و تەوەری دووەم پەیوەندی کورد و عەبدولکەریم قاسم و تەوەری سێیەم تێکچونی پەیوەندی کورد و عەبدولکەریم قاسم و تەوەری چوارەم هەلگیرسانی شۆڕی ئەیلول و لەناوچوونی قاسم.

## تەوەری یەکەم:

## پەیوەندی کورد و شۆڕشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨

بۆ ئەوەی بمانەوێت ئاستی ژیانەوەی کێشەی کورد دوای بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەموزی ساڵی ١٩٥٨ لەعێراق بزانین، سەرەتا پێویستمان بەئاشنابوون بەهەڵوێسی کورد لەم شۆڕشە هەیە،بەڵام بەر لەوە پێویستە ئەوە بزانین کە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ئەوەیان ساغ کردوەتەوە کەبارودۆخی گەلانی عێراق بەگشتی و گەلی کورد بەتایبەتی لەسەردەمی ڕژێمی پاشایەتیداالەژیان و گوزەرانێکی خراپدابوون[١]، لەناوەڕاستی ساڵانی پەنجاکاندا هەوێنی نەتەوایەتی لەعێراقدا هێندە پەرەی سەندبوو کەمەترسی لەسەر بەزیندوو هێشتنەوەی ڕژێمی پاشایەتی هاشمی سەر بەبەریتانیا دروست

بکات،لەمانگی تەموزی ساڵی ١٩٥٨دا دەستەیەك لەئەفسەرانی سوپا کەپێیان دەوترا (ئەفسەرانی ئازاد) لەژێر سەرکردایەتی قاسمدا کودەتایەکی سەرکەوتوو لەهەمان کاتدا خوێناوییان دژی مەلیك فەیسەڵ و حکومەتەکەی بەرپا کرد و بانگەوازی دامەزراندنی ڕژێمێکی سیاسی نوێی کۆماریان لەعێراقدا بڵاوکردەوە،زۆربەی گروپە نەیارەکانی وڵات پێشوازیان لەلابردنی ڕژێمی پاشایەتی کردو پشگیری و لایەنگیری خۆیان بۆ حکومەتی کۆماری نیشاندا لەگەڵ هیواخواستن بۆ ئەوەی کەسەردەمێکی نوێ لەپەیوەندی نێوان کورد و عەرەب دەست پێ بکات[٢]،

لەبەهاری ساڵی ١٩٥٤دا دەستەیەك ئەفسەری عێراقی ڕێکخراوێکی نهێنیان بەنێوی ئەفسەرانی ئازادەوە سازکردبوو بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی پاشایەتی هاشمی کاریان دەکرد،ئەو دەستەیە هەوڵیان دەدا کەچەند لە توانایاندا بێت چەك و تەقەمەنی کۆبکەنەوە وبیشارنەوە بۆ بەکارهێنانی لەداهاتوو و کاتی پێویستدا،ئەمانە لەهەل و دەرفەتێك دەگەڕان کەشاو جێ نشینی شا و سەرۆکی حکومەت هەرسێکیان پێکەوە لەیەك شوێن و کاتدا بگیرێن و لەهەمان کاتدا لەنێوببرێن،وەها دەرفەتێکیش لە١٤ی تەموزی١٩٥٨دا هەڵکەوت کاتێك ئەو سێکەسە کۆبونەوە و دەیان ویست بۆ ئامادەبوون لەکۆنگرەیەکدا بچن بۆ ئەستەمبوڵ[٣]، ئەوە بوو لەبەربەیانی ١٤ی تەموزی ساڵی ١٩٥٨کودەتایەکی سوپایی بەرپاکراو ڕژێمی پاشایەتی ڕووخا،لەسەردەستی کۆمەڵێك لەئەفسەرانی ئازادیخوازی عێراقی بەسەرکردایەتی عەبدول کەریم قاسم (مەلیك فەیسەڵی دووەم و نوری سەعیدی)سەرۆك وەزیران وەلی عەهد(عبدالاه) کوژران و زۆر بەی وەرزیرو دەسەڵاتدارنی سوپا گیران و دوای ماوەیەك دادگای شۆڕشیان بۆ پێك هێنان و دوای چەندین دانیشتنی دادگای کردن ژمارەیەکی بەرچاویان تیرباران

کران و لەسێدارە دران[٤]،بەکوشتنی ئەمانە شۆڕش سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە جەماوەر و پارتە سیاسیەکان ڕۆڵێکی بەرچاویان تێدا گێراو بۆ بەرەبەیانی ١٤ی تەموز لەبەغدا و شار و شارۆچکەکانی دیکەی عێراقی خەڵکی بەسەرجەم چین و توێژەکانەوە هاتبوونە سەر شەقامەکان و پشتگیری خۆیان بۆ شۆڕش دووپات دەکردەوە،ئەوەبوو هەر لەیەکەم ڕۆژی شۆڕش جەماوەری شارەکانی (سلێمانی ،کەرکوك،هەولێر،کۆیە،زاخۆ)هاتنە سەرشەقامەکان و ئەفسەر و سەربازانی کورد و جەماوەری کوردستان بوونە شۆڕشگێڕی ڕاستەقینەو دڵسۆزی خۆیان بۆ کۆماری تازەی عێراق دەربڕی،لەڕاستیدا سەرکەوتنی شۆڕشی تازەی عێراقی بەندە بەپشتیوانی کورد ،چونکە لەسێ بەشی سوپا بەشێکی کوردبوون و ڕۆڵێکی بەرچاویان گێڕا لەگەڵ ئەفسەرە عەرەبەکان و شان بەشانی یەکتری توانیان ڕژێمی پاشایەتی کۆتایی پێبهێنن[٥]،تەنانەت کاتێك قاسم لەساڵی ١٩٥٨ لەشا هەڵگەڕایەوەو بانگی سیستەمی کۆماریدا،کارەکەی تەنها کودەتای ڕامیاری نەبوو بەڵکو شۆڕش بوو بەرەی دیموکراتیخواز لەگەڵی بوون تەنانەت پارتی دیموکراتی کوردستانیش[٦]، ئەگەر چی ئەو ئەفسەرە لاوانەی کەلەساڵی ١٩٥٨ هاتبوونە سەر تەخت و ڕوانینێکی ئاشکرایان بۆ داهاتووی عێراق نەبوو،هەروەها هیچ ئیلتیزامکردنێکی دیاریان لەبەرامبەر کێشەی کورد پیشان نەدابوو،بەلام هەڵوێستیان بەرامبەر کورد هەڵوێستێکی دۆستانەبوو،بەهەر حاڵ ئەگەر وەهاش نەبوبێت ئەوا بەشێوەیەکی لەبەرچاو هاوسۆزی کورد بوون[٧]،لەهەمان کاتدا کوردەکانیش هەرچەندە بەرنامەی کاری کودەتا چیەکان و هەڵوێستی ئەوانیان بەرامبەر بەکێشەکانیان نەدەزانی بەلام ئەو سیاسەتەی کە ڕژێمی پاشایەتی لەماوەی ٣٧ ساڵی دەسەلاتیدا لەعێراق بەرامبەر بەکورد پیادەی دەکرد لەدامرکاندنەوەی شۆڕشەکان و دەربەدەرکردنی دانیشتوانی کوردستان و زیندانی

کردنی سەرکردەکانیان و دژایەتی کردنی خواستەکانیان وای کرد کوردی باشور بەگشتی پشتیوانی خۆیان بۆ کودەتاکە دەربڕن[٨] و دامرکاندنەوەی شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی کورد و بێبەشکردنی لەمافە سەرەتاییەکانی هەموو ئەمانە هۆکارێك بوون بۆ ئەوەی کورد هەمیشە بۆ دەرفەتێك دەگەڕا کە ئامانجە نەتەوەییەکانی بەدەست بهێنێت،بۆیە.شۆڕش دەستی پێکرد لەلایەن دەستەی ئەفسەرانی ئازادەوە کە لەو دەستەیە ئەفسەرێکیان بەڕەگەز کورد بوو وەك(عەقید ڕوکن محێدین عەبدولحەمید)پارتی دیموکراتی کوردستانیش کەلە کۆنگرەی ١٦/٨/١٩٤٦دا پاش هەڵوەشاندنەوەی هەردوو حیزبی شۆڕش و ڕزگاری دامەزرا و بارزانیان بەسەرۆك هەڵبژارد و ئامانجەکانی ڕوون بوون کەبریتی بوو لە تێکۆشان بۆ ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی و ڕزگاری دیموکراسی[٩]، شۆڕشی ١٤ی تەموز ئەفسەرانی ئازاد مژدەی خولێکی ئومێد بەخشیان بەکوردان دا،قاسم کاتێك جڵەوەی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت گفتی دا کۆمارێکی دیموکراتی لەوڵات دامەزرێنی و کابینەیەکی پێك هێنا کەئەندامەکانی ئەفسەران و ئەندامانی (بەرەی نیشتیمانی یەککگرتوو)بوو ئەگەرچی پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی لەم کابینەیەدا ئەندام نەبوون،بەلآم (باباعەلی کوڕی شێخ مەحمود)بانگ کرا بۆناوکابینەکە[١٠]، بەلآم وەکو ئاماژەیەك بۆ نیشاندانی نیەت پاکی ئەوان بەرامبەر بەکورد لیژنەی سەرکردایەتی نوێ کە لەسێ کەس پێك هاتبوو واخۆی نیشان دەدا لەجارەکانیدا کەسەرکردایەتیەکی بەکۆمەڵی وڵاتە و لەو سێ کەسەش یەکێکیان کورد بوو کەئەویش (خالید نەقشبەندی)بوو کەپێشتر پارێزگاری هەولێر بوو لەخێزانێکی خاوەن موڵکی ئاینی بوو[١١]،وە ئەفسەری پێشوو بوو، (محەمەد مەهدی کوبە،کەسەرۆکی پێشووی حیزبی ئیستقلال بوو، ،نەجیب ئەلروبەیعی سوننە کەئەفسەر و لایەنگرێکی بێدەنگی

بزووتنەوەی ئەفسەرە ئازادەکان بوو، ئەمەش بۆ رازیکردنی هەرسێ پێکهاتە سەرەکیەکەی عێراق دانرا ئەوانیش(شیعە،کورد،عەرەبی سونە)بوون[12]،ئەم کارەش بەئاشکرا کارێکی نمایشی بوو[13]،هەروەها گۆرانی رژێمی پاشایەتی لەعێراقدا و دامەزراندنی سیستەمێکی کۆماری بۆ یەکەمین جار بەفاکتەرێکی گرنگ دادەنرێت کە کورد بتوانێت بەشێك لەمافە نەتەوایەتیەکانی دەستەبەر بکات[14]،سەرئەنجام دەتوانێت بوترێت ئەو دەسکەوتانەی کە کورد بەدەستی هێنا لەم شۆرشەدا وپشتگیری (عەبدولکەریم قاسم)ی بۆ کێشەکەی زیاتر بەهێزی کرد و لێرەوە ژیانەوەی کێشەی کورد زیاتر برەوی سەند[15]، ئەگەر کەمێك بۆ رووداوەکانی سەرەتای هەلگیرسانی شۆرشی تەموز بگەرێینەوە بەئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کەنەتەوەکەمان رۆلێکی باشی گێراوە لەسەرخستنی شۆرش شان بەشانی عەرەب،بەتایبەتی رێکخستنەکانی پارتی و ئەفسەرانی کورد لەوانە(مقدم عبدالفتاح شالی،رئیس مستەفا عەبدولا) و چەند ئەفسەرێکی تربەشداریەکی کاریگەریان هەبوو لەسەر خستنی شۆرشدا،بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە سەرکوتنی شۆرشی ١٤ی تەموزی سالی ١٩٥٨ خالێکی وەرچەرخان بوو لەپەرەسەندن و بەرەوپێشچوونی دۆزی رەوای کورد لەناوچەکەو جیهان[16]،لەراستیدا رووخانی (رژێمە رەشەکە)سەرکەوتنێکی مێژوویی بوو کەبەهەول و تێکۆشانی هاوبەشی هێزی عەرەبی و کوردی و کەمە نەتەوەییەکانی دیکەی عێراق بەدەست هات[17]،بەمەش کودەتای ١٤ی تەموزی ١٩٥٨توانی دسەلاتی ٣٧سالەی پاشایەتی لەعێراقدا کۆتایی پێ بێنێت و لەگەل خۆیدا کۆمەلێك ئەنجام بەدەست بهێنێت کەکورد لەمێژووی رابردووی لەسنوری عێراقدا ئەم جۆرە دەسکەوتانەی بەدەست نەکەوتبوو[18]،لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کورد رۆلێکی دیار و بەرچاوی هەبووە لەسەر کەوتن و سەرخستنی

شۆڕش و لەناوبردنی ڕژێمی پاشایەتی لەعێراقدا و ئەم کارەشی بەر ئەنجامی ئەو هەمووە زوڵم و زۆرە بوو کەلەسەردەمی پاشایەتیدا لەکورد کراوە لەباشوری کوردستان،بۆیە کورد هەمیشە چاوی لەهێزێکی دیکەی عێراقی بووە کە وەك فریاد ڕاسێك کەبێتە سەرحوکم و گۆڕانکارییەکی نوێ لەعێراقدا ئەنجام بدات و دان بەمافەنەتەوەییەکانی گەلی کوردا بنێت لەناوعێراقداو هەر بۆیە کاتێك شۆڕشی ١٤ی تەموز لەعێراقدا ڕوودەدات کورد بەشدارییەکی بەرچاوی دەبێت لەسەر خستنی ئەم شۆڕشەدا.

## تەوەری دووەم:

## پەیوەندی کوردو عەبدول کەریم قاسم و هەڵوێستی بەرامبەر کورد

سەر ئەنجام شۆڕی ١٤ی تەموز ڕوویدا و سەرکەوتنێکی دیارو بەرچاوی بەدەست هێنا لەماوەیەکی کەمداو سەردەمێکی نوێ بۆ گۆڕانکاری لە عێراقدا هاتەدی و کوردیش چاوی لەو گۆڕانکاییە بوو بۆ چارەی کێشەکانی.ئێستا بەڕووکەش هەموو شتێك بۆ چارەسەرکردنی گرژی نێوان بەغداد و کۆمەڵی کورد لەساڵی ١٩٢١وە بەردەوام لەباربوو[١٩]،لەوبارودۆخەدا سیستەمی حوکمڕانی عێراق چەندین گۆڕانکاری لەسەر ئاستی ناوخۆی و نێوچەیی و نێودەوڵەتی هێنایەکایەوە،لەشێوەی گۆڕانی سیستەمی فەرمانڕەوایی عێراق و پەیوەندیە نێوچەیی و نێودەوڵەتیەکان،لەبارەی پرسی کوردیشەوە لەباشوری کوردستان سەرەتای قۆناغێکی نوێ لەبزووتنەوەی نەتەوەی کورد دەستی پێکرد[٢٠]،ئەوەبوو دوو ڕۆژ دوای کودەتاکە لە١٦ی تەموزدا پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان بەیانێکی دەرکردوو هەموو توانایەکی خۆی خستە ژێر دەسەڵاتی سەرکردایەتی شۆڕی ١٤ی تەموز و لایەنگری شۆڕشەکەی کرد[٢١]،بەم شێوەیە،ئیبراهیم ئەحمەد

وەك سکرتێری گشتی پارتی دیموکراتی کوردستان دەست بەجێ پشتگیری پارتی بۆ ڕژێمی تازە ڕاگەیاند و بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە کەتێیدا بەگەرمی پێشوازی لەڕژێمی تازە و ئازادی و برایەتی هەردوو میللەتی کورد و عەرەب دەکرد، لە١٦ی تەموزی ١٩٥٨ پارتی بەیانێکی بۆ گەلی کورد بڵاوکردەوە و لیژنەی ناوەندی بەکۆی دەنگ پەسەندی کرد،کەتێیدا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کەپارتی پێی وایە هەلومەرجی نوێی عێراق زەمینە بۆ ژیانێکی پڕ لەئازادی و یەکسانی لە نێوان هەردوو گەلی کورد و عەرەب دەڕەخسێنێت،لەبەر ئەوە بەهەموو توانایەوە بەرگری لەکۆماری عێراق و چەسپاندن و گەشەسەندنی دەکات و هەموو توانایەکی دەخاتە ژێر دەسەڵاتی سەرکرداتیەکەوە و ئامادەیە هەموو ئەندام و لایەنگرانی خۆی وەك گیان بەخش سازبکات بۆ ئەو ئامانجە حکومەتی تازەی عێراق بەرامبەر بەو هەڵوێستە گەشە کردووەی کورد هەڵوێستێکی ئەرێیانەی هەبوو،ئەمەش لەگەڵ هەنگاودا ڕەنگی دایەوە کە حکومەت بەپەلە ئەنجامی دا[٢٢]، لەڕاستیدا پشتگیری کردنی سەرکردایەتی کورد لەشۆڕشی چواردەی تەموز کارێکی دروست و پڕبایەخ بووە،چونکە چاوخشانێك بەماك و بیروباوەڕەکانی شۆڕشدا دەردەکەوێت کەزۆربەیان لەبەرژەوەندی پرسی کورد بوون[٢٣]، سیستەمی نوێ بەڵێنیدا کە گۆڕانکاری جدی لەبارودۆخی مەسەلەی کورددا بکات[٢٤]،گۆڕانی دید و بۆچونی دەسەڵاتدارانی عێراق بەرامبەر بەکێشەی کوردستان و گەلی کورد یەك لەدوای یەك ڕوویاندا،ئەوەبوو لەڕۆژی ١٩٥٨/٧/٢١بەبڕیارێکی تایبەت لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانی کۆماری عێراقەوە گوناهبار و سیاسیەکان عەفوو کران و لێبوردنی گشتی ڕاگەیەنراشێخ ئەحمەد و بارزانیەکان و شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمود وگۆرانی شاعیر یەکەم کەسانێك بوون کە ئەم لێبوردنە گشتیە گرتنیەوە[٢٥]،ئیدی لەئەنجامی ئەو گرنگیەی شۆڕش

بوو وەفدێکی پارتی بەسەرۆکایەتی (ئیبراهیم ئەحمەد)لە ٢٧ی تەموزی ١٩٥٨ سەردانی بەغدادی کرد و لەوەزارەتی بەرگری چاویان بە(عەبدولکەریم قاسم)کەوت،تێیدا ئیبراهیم ئەحمەد بەناوی ئامادەبوانەوە وتارێکی پێشکەش کرد و باسی گەلی کورد و خاکی کوردستانی کرد،هەروەها یاداشتێکی پێشکەش بەحکومەتی تازەکرد کەناوەڕۆکی یاداشتەکە بریتی بوو لە:

١. دەرکردنی لێبوردنی گشتی بۆ بارزانییەکان

٢. خوێندن بەزمانی کوردی بێت لەکوردستان

٣. ڕێگە بدرێت بەڕێکخراوە سیاسی و پیشەیی و کۆمەڵایەتیەکانی کورد کە بەئاشکرا کاری خۆیان ئەنجام بدەن

٤. بوژانەوەی کشتوکاڵی و دامەزراندنی کارگەی پیشەسازی لەشارە کوردیەکان و دامەزراندنی فەرمانبەرانی کورد لەوشوێنانە[٢٦]،جێگەی باسە کەڕۆڵی دیبلۆماسیەتی سەرکردایەتی پارتی و خودی(برایم ئەحمەد)کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبووە لەسەر(قاسم) بۆ دەربڕینی ڕەزامەندی بەگەڕانەوەی بارزانی و یاوەرانی بۆعێراق چونکە سەرکەوتنی هەوڵی گەڕانەوەی بارزانی ڕێگەی بۆ سەرکەوتنی دیکە خۆشکرد لەشێوەی خستنە ڕووی دۆزی نەتەوەیی کورد و داخوازییەکانی[٢٧]، بەلاّم لەمەگرنگتر لە٢٧/٧/١٩٥٨دەستوری نوێی عێراق دانرا،لەبڕگەی(٣)ی دەستورەکە دانی نا بەهاوبەشی کورد و عەرەب لەخاکی عێراق[٢٨] و بەپێی ئەم دەستورە مافە نەتەوایەتیەکانی کورد لەناو عێراق دەچەسپێ،ئەمەش بۆ یەکەمین جارە دەربارەی یەکێك لەو دەوڵەتانەی کەبەشێك لەکوردستانیان داگیر کردوە دانینا بەمافە نەتەوایەتییەکانی کوردا[٢٩]،لەلایەکی ترەوە لەناوەڕۆکی دەستورە کاتییەکەوە بۆ یەکەم جارڕدانرا بەبوونی کوردا وەکو پێکهاتەیەکی ئێتنیکی جیاواز لەیاڵ ئەوەشدا دان بەوەدا

نرا کەدەبێت کورد مافی نەتەوایەتی خۆی هەبێت[30]،ئەم یەکسانییەی هەردوو شەریکی عەرەب و کوردە لەچوارچێوەی وڵاتی عێراقدا کەبۆ یەکەم جار لەرۆژی دامەزراندنی وڵاتی عێراق بەم لاوە باسکراوە[31]،ئەمە بۆ یەکەمین جاریشە لەمێژووی عێراق و بگرە لەمێژووی کوردستاندا دانی نا بەهاوبەشی عەرەب و کورد لەیەك نیشتیماندا[32]،بەم شێوەیە لەو دەستورە کاتییەداحکومەتی نوێی عێراق بەڵێنی دا کە سەرجەم مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لەچوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا جێ بەجێ بکات[33]،جێگەی باسە لەم بەندەی دەستوری کاتی عێراق، سەرکردایەتی پارتی و خودی(برایم ئەحمەد)رۆڵیان لەچەسپاندنیدا هەبووە و بێ ئەو مەبەستەش بەردەوام لەپەیوەندی و گفتوگۆدابوون لەگەڵ سەرکردایەتی پارت و رێکخراوە عێراقیەکان[34]، هاوکات لەگەڵ ئەوانەشدا، عەبدولکەریم قاسم کەدایکی بەکوردێکی شیعە دادەنرا بەئاشکرا سوور بوو لەسەر چاککردنی بارودۆخی مەسەلەی کورد و ژمارەیەك کوردی لەئاستە بەرزەکانی حکومەتدا دانا[35]،تەنانەت لەپێکهاتەی یەکەمین حکومەتیش کە سیازدە وەزیری لەخۆ گرتبوو دوانیان کورد بوون،ئەوانیش(بابا عەلی شێخ مەحمود) وەزیری گواستنەوە و ئەشغال و (د.محەمەد سالح) وەزیری تەندروستی بوون[36]،بەلام هەردوو کیان کەسایەتی سەربەخۆ بوون[37]، سەبارەت بەهەڵویستی مەلامستەفا و بارزانیەکانی سۆڤیەت بەرامبەر کودەتاکە و عێراقی نوێ،ئەوانیش وەك زۆربەی کوردەکانی باشور دڵسۆزی خۆیان بۆ دەسەڵاتی نوێ پیشاندا[38]،لەم سەروو بەندەدا دوای ئەوەی مستەفابارزانی هەواڵی سەرکەوتنی شۆرشی بیست لەمۆسکۆبوو ئەم هەواڵەی بەهاورێکانی خۆی راگەیاند و لە ١٩٥٨/٨/٢١ مۆسکۆی بەجێ هێشت و رووی کردە رۆمانیا و لەشاری بوخارستانەوە بروسکەیەکی بۆ قاسم نارد و پیرۆزبایی سەرکەوتنی شۆرشی لێکرد و داوای

لێکرد رێی بدات خۆی و هاورێکانی بگەرێنەوە عێراق بۆ خزمەت و پشتگیری کۆماری تازە دامەزراو[39]، عەبدولکەریم قاسم سەرکردەی شۆرش و سەرۆك وەزیرانی ئەوکات بەبروسکە وەلامی نامەکەی بارزانی دایەوە داوای لێکرد بگەرێتەوە نیشتیمان،نامەکەی بارزانی و وەلامەکەی قاسم بۆماوەی رۆژێك لەبرگەی یەکەمی دەنگ و باس لەئێزگەی بەغداد خوێنرایەوە،ئالەم روانگەیەوە بارزانی ئەمر بۆ دەستەی حکومەتی تازەی عێراق دەیسەلمێنێ کەئاشتی خوازە و دژی شەرە[40]،لەوەلامی نامەکەی بارزانیدا قاسم بەناوی حکومەتی نوێی عێراقەوە داوای لێبووردنی لێکرد،دەربارەی ئەو ناعەدالەتیانەی کە حکومەتی پاشایەتی لەوەو پێش دەرهەق بەگەلی کورد پیادەی کردبوو،لەدرێژەی نامەکەدا قاسم داوای لەبارزانی کردبوو بگەرێتەوە ولات،ئەم نامەیەی قاسم ئومێدێکی زۆری لای بەرزانی دروست کرد،کەلە سایەی حکومەتی نوێدا کۆتایی بەژیانی ئاوارەیی خۆیی و هاورێکانی بێت و بگەرێتەوە بۆ عێراق و درێژە بەخەباتی نەتەوەیی خۆیان بدەن تادەگەن بەئامانج[41]، لەرێکەوتی ١٩٥٨/٨/٢١دا هەر یەکە لەبارزانی و میرحاج ئەحمەد و ئەسعەد خۆشەوی مۆسکۆیان بەجێ هێشت و گەیشتنە بوخارست و دواتر پراگی پایتەختی چیکۆسلۆفاکیا، پاشان برایم ئەحمەد رێوشوێنی گەرانەوەی (بارزانی) رێکخست و توانی لەرێگەی وەزیری ناوخۆ(عەبدولسەلام عارف) ەوە چوار پاسپۆرت ئامادە بکات و بۆ پێشوازیکردن لەبارزانی و هاوەڵەکانی و بەرەو پراگ بەرێکەوت،دواتر لەپراگ چاویان بە برایم ئەحمەد کەوت و دوای وتوێژێکی کەم لەبارەی رێکخستنەکانی پارتی و بارودۆخی کوردستان،بەباش زانرا کەبە(قاهیرە)ی‌پایتەختی میسردا بگەرێنەوە و هەلومەرجی گفتوگۆیەکی سیاسی لەنێوان مستەفابارزانی و جەمال عەبدولناسردا رێکخرا،بەو هێوایەی کەبناغەی هاوکاری نێوان نەتەوەی(کورد وعەرەب)دارێژن[42]،

سەرئەنجام بارزانی دەگەڕێتەوە و پاش هەڵوەستە و لادانێك لەمیسر (جەمال عەبدولناسر)سەرۆکی میسر دەبینیّ و لە ١٩٥٨/١٠/٦دا بەفڕۆکەیەك دێتەوە بەغدا،وەکو سەرۆکی دەوڵەتێك لەلایەن جەماوەرێکی گەورەی بەجۆش و خرۆشەوە پێشوازی لێدەکرێت،بارزانی چەند ڕۆژێك لەئوتێل (سەمیر ئەمیس) بەسەر دەبات پاشان قاسم کۆشکی کوڕی نوری سەعیدی پیّ دەدا و لەوێدا نیشتەجیّ دەبێت[٤٣]،و ئۆتۆمبێلێکی خستە خزمەتی و مانگانیەیەکی باشیشی بۆ بڕیەوە[٤٤]،بارزانی سوپاسگوزاری و منەتباری خۆی پێشکەش بەقاسم کرد و چەندین جار گوتی من سەربازێکی شۆڕشی چواردەی تەموزم و لەژێر فەرماندەی عەبدولکەریم قاسمدام،لەبەرامبەردا قاسم ڕێزی لەخۆی و بنەماڵەکەی گرت[٤٥]،هاتنەوەی بارزانی نەمر بۆ خاکی نیشتیمان لەساڵی ١٩٥٨ یەکێتی کورد و عەرەب و کەمە نەتەوەکان پتەوتر بوو،هەربۆیەش پێشوازیکردنی بارزانی تەنها لەلایەن کوردەوە نەبوو بەڵکو خەڵکێکی زۆری عەرەب بەشداریان تێدا کرد لەئامادەبوون لەفڕۆکەخانەی بەغدا شان بەشانی کورد کەلەگشت ناوچەکانی کوردستان و عێراق هاتبوونە پێشوازی،ئەم هەمووە شتانە بەڵگەی ئەوەیە بارزانی کەسێکی ئاشتی خوازە بەگەڕانەوەی ئاشتی سەقامگیر دەبێت لەنێوان گەلانی عێراقدا[٤٦]، ئەو بارزانیانەی کەلە سۆڤیەت مابوون لە ١٩٥٩/٤/١٦دا بەکەشتیەکی نەفەر هەڵگری سۆڤیەتی بەناوی کرزیا لەئۆدیساوە گەیشتنەوە بەسرە[٤٧]،ئەمانە بریتی بوون لە ٤٦٠ پیاو ١٨٠ ژنی سۆڤیەتی نەژاد،بەتایبەت قەرقیزی و لەگەڵ ٢٢٥منداڵ[٤٨]،دوای پێشوازیەکی گەورە لە ٤/١٧دا بەسەر کەرکوکدا تێپەڕین و چوونەوە بۆ هەولێر و هاوینە هەواری سەلاحەدین و شەقلاوە،لەئیستگەی کەرکوکیشەوە دیسان پێشوازیەکی گەورە کران[٤٩]،وە ژمارەیەکیان لەبەغداد مانەوە و دەستیان کرد بەهاوکاری مەلا مستەفا[٥٠]، هەر

لەومانگەدا بارزانی نامەیەکی سوپاسگوزاری بەبۆنەی گەڕانەوەی یاوەرەکانی لەسۆڤێتەوە بۆ عێراق پێشکەش بەعەبدولکەریم قاسم کرد و بەڵێنەکانی پێشووی دووپاتکردەوە[51]، لەسالآنی سەرەتای دەسەلآتی قاسمدا پەیوەندی هێمنی و پێکەوە گونجاندن لەنێوان حکومەت و کوردا پەرەی سەند،قاسم و مەلا مستەفا کەوەك پاڵەوانێك دوای یانزەساڵ لەئاوارەی سۆڤیەت گەڕابوونەوە بۆ عێراق گەیشتنە ئەو بۆ چوونەی کەپێویستە هاوکاری یەکتر بکەن بەمەبەستی بێدەستکردن و بێتواناکردنی نەیارە تایبەتیەکانیان[52]،نەیارەکانی قاسم بریتی بوون لە کۆمۆنیست و بەعسی و ناسریەکان و هەروەها عەرەبە قەومیەکانی دیکە[53]، هاتنەوەی بارزانیش بەخۆڕایی نەبوو بەڵکو لەئەنجامی کۆمەڵێك هۆکاری ناوەوە و دەرەوەی کوردستان و عێراق و ناوچەکەبوو،بەهاتنەوەشی نەتەوەکەمان گەلێك دەسکەوتی سیاسی و ڕۆشنبیری و ئابووری و کۆمەلآیەتی لەعێراق بەدەست هێنا،ئەم دەسکەوتانەش لەپارچەکانی دیکەی کوردستان دەنگی دایەوە،ئەوەبوو هەستی نەتەوەیی سەرلەنوێ بوژایەوە لەلایەن کوردەوە،ئینجا لەڕووی دەرەوەش نەتەوەکەمان گەلێك دەسکەوتی مەزنی بەدەست هێنا لەوانە:پاڵ پشتی کردنی یەکێتی سۆڤیەت و ولآتانی بەرەی سۆشیالستی لەگەڕانەوەی بارزانی و هەڤاڵەکانی دەسکەوتێکی دیکەی گەورە بوو لەسەر ئاستی دەرەوە نەتەوەکەمان بەدەستی هێنا[54] هەروەها کێشانەوەی عێراق لەپەیمانی بەغداد لەڕۆژی ٢٤ی حوزەیرانی ١٩٥٩،ئەم پەیمانەش لەئەساسەوە دژی نەتەوەی کورد دامەزرابوو لەنێوان داگیرکەرانی کوردستان بەپاڵپشتی بەریتانیا،وەکشانەوەی عێراق لەیەکێتی هاشمی[55]،هاوکات لەگەڵ ئەوانەشدا،سەرئەنجام بەهۆی سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ لەعێراق ئاسۆیەکی نوێ بۆ نەتەوەی کورد کرایەوە بەتایبەت بۆ گەلی کورد لەکوردستانی

عێراق لەسەرئاستی دەرەوە و ناوەوە گەلی کورد گەلێك دەسکەوتی بەدەست هێنا،لەسەر ئاستی ناوەوەش وەك: لەبەندی (٣)ی دەستوری عێراق هاتووە کە (کورد و عەرب)لەم نیشتیمانەدا هاوبەشن و کورد بوو بەئەندام لەئەنجوومەنی سەرکردایەتی کە لەسێ ئەندام پێك هاتبوو ئەویش بەڕێز عەقید (خالید نەقشبەندی)بوو،وە یەك وەزیری کورد لەحکومەت بەشداربوو،سەرئەنجامیش گەورەترین دەست کەوت کورد بەدەستی هێنا گەرانەوەی سەرۆکی ڕۆحی ناوداری کورد (بارزانی نەمر)بوو بۆ عێراق، وە پارتی دیموکراتی کوردستان بەرەسمی ناسرا و بەدەیان ڕۆژنامەوگۆڤار بەزمانی کوردی دەردەچوون، وە دروشمی دەوڵەتی تازە نیشانەی سەردەمی وەك یەك بوونی دوو نەتەوەی کورد و عەرەبە[٥٦]، چونکە لە ئارمی ڕەسمی کۆماریدا کەبریتیە لەخەنجەرێکی کوردی و شمشێرێکی عەرەبی و بەشێوەیەکی یەکتر بڕدانراون وەك ڕەمزێك بەرجەستە دەبێت[٥٧]، لەساڵی ١٩٥٩دا پەیوەندی سەرکردایەتی کورد و قاسم بەهێزبوو ئەمەش وایکرد حکومەت ڕێگە بەدەرچوونی (١٤)گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی بدات[٥٨]،لەنێوانیاندا ڕۆژنامەی (خەبات) ی ئۆرگانی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان کە لە٤/٤/١٩٥٩دا دەرچووە و ڕۆژنامەی کوردستانیش زمانحاڵی ئەو پارتەبوو،هەروەها لێرەوە ئاسۆیەکی بەربلاو لەبەردەم گەلی عێراقدا کرایەوە و بناغەی بۆ برایەتی هەردوو نەتەوەی سەرەکی لەکورد و عەرەب و کەمایەتیەکانی نەتەوەی ئاینی دانا[٥٩]،یەکێکی دیکە لەدەسکەوتە فەوریەکانی شۆرش کەبۆ کوردان یەکجار بەبایەخە ئازادی چاپەمەنیە،هەڵبەتە کوردەکان لەسایەی ڕژێمی پێشووشدا دەیان توانی ژمارەیەك گۆڤار و ڕۆژنامە دەربکەن،بەلام ئەم بلاوکراوانە هەمووی ئەدەبی و لێکۆڵینەوەی مێژوویی و ئەدەبی و چیرۆك و شیعر بوون،کەم و زۆر بەلای باسی ڕووداوە سیاسیە هاوچەرخەکاندا نەدەچوون، هەتاو

کەمانگانـە بـوو لەسـاڵی ١٩٥٣ لەسـلێمانی دەردەچـوو وەکـو گەلاوێژ،کـەدوای شۆڕش هێوا جیگـەی گرتـەوە و ژیـن کـە گۆڤـارێکی دوو هەفتانـە بـوو،وە پـاش شـــۆڕش کـــوردانی ســـلێمانی جگـــە لەمانـــە پێـــشکەوتن و شـــەفەقیان بلاودەکردەوە،لەکەرکوکـدا گۆڤـاری بـەیان و رۆژی نـوێ بـلاو دەبوونـەوە،[٦٠] هـەروەها قاسم بەرێوەبەرایەتیـەکی بۆخوێنـدنی کـوردی دامەزراند،لەزانـستگەی بەغدادیش بەشێکی بۆزمانی کـوردی کردەوە،بەرنامـەی کـوردی ڕادیـۆی بەغـداد زیادکرا،لەقوتابخانەسـەرەتاییەکاندا دەرس بـەکوردی دەگوترایـەوە[٦١]،هـەروەها ڕێگە درا بە کورد زمانی کـوردی وەك زمـانی ڕەسمـی خۆیـان بـەکاربهێنن[٦٢]،بـەم شێوەیە لەساڵانی سەرەتادا ڕژێمی قاسم بواری چالاکی کەلتوری کوردی دا هـەتا گەشە بکات و پەرەبسەنێت[٦٣].

سەرئەنجامی ئەمانـەش کـورد پـشگیری و هاوکـاری تـەواوی لەدەسـەلاتەکەی قاسم دەکرد و لە زۆربەی ڕووداوەکاندا هاوکاری تەواوی قاسمی دەرکرد، یەکێکی دیکـە لـەو ڕووداوانـەی کـە لەعێراقـدا ڕوویـدا، کـورد ڕۆلێکـی باشـی بینـی لەدامرکاندنـەوەی بـۆ هاوکـاری عەبدولکـەریم قاسـم کودەتـای شـەواف بـوو لەموسـڵ،ئەمەش لەرێکـەوتی٨ مارسـی ١٩٥٩ لەشـکری دووی عێـراق لەموسـڵ بەفەرمانـدەی شـەواف کودەتـای کـرد و هەوڵیـدا هێـرش بکاتـە سـەربەغداد،ئەم کارەش جێگەی عەبدولکـەیم قـاسمی خستە مەترسیەوە چونکە ئەگـەر لەسـەر بازەکانی ناو بەغداد کەڵکی وەربگرتایـە ئـەوا ناسریەکان لەوانـە بـوو لەپـشتەوە پەلاماری بدەن و ببنە هۆی ڕووخانی ڕژێمەکـەی و هـەروەها لەوانـە بـوو هەنـدێك لەهێزەکانی لەکاتی شەڕدا بچنە پاڵ لەشکری دووەم هەرچۆن بوو قاسم بەبیریـدا هـات داوای[٦٤]،لـە شـوعیەکان و کوردەکـانی ژێـر فەرمانـدەی بـارزانی کـرد بـۆ ڕووبەڕووبونـەوە و دامرکاندنـەوەی یـاخی بوونەکە،ئـەوە بـوو بـارزانی پـشگیری

و بەسەرکەوتوویی بڕوانامەی ئەفسەری یەك ئەستێرەی بە پلەی جێدار(ملازم) بەدەست هێناوە،لەماوەی خوێندنیدا پەیوەندی بە بزاڤی سیاسی و ڕۆشنبیری کوردستان هەبووە، تەنانەت یەکێك بووە لە دەستەی دامەزرێنەر و ئەندامی کارای حیزبی هیوا، دواتریش ئەندامی حیزبی رزگاری بووە تا ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی رابردوو.



دوای وەرگرتنی بڕوانامە و دەرچوونی لە کۆلیژی سەربازی لەگەڵ نەجیبەی کچی عەبدەی ئەمینی سێ براده‌لاك (ئەویش هەر خانەوادەیێکی شاری سلێمانین) پرۆسەی هاوسەرگیری کردووە، ئەو ماوەیە شوێنی کارکردنی لە سەربازگەی قەرەغان(جلولا) بووە و لە کاری ڕێکخستنی نهێنی حیزبی هیوا لەگەڵ کۆمەڵێك ئەفسەری گەرمیانی بەردەوام بووە، لە نێو سەربازگەشدا هەڵوێستی نەتەوەیی روونی هەبووە تەنانەت لەسەر گفتوگۆیەك دەربارەی جەژنی نەتەوەیی نەورۆز لەگەڵ ئەفسەرێکی عەرەب توشی دەمەقاڵێ بووە لەئەنجامدا زلەیەکی لە ئەفسەرە عەرەبەکەداوە و بەهۆی ئەوەوە بڕیاری (٥) ساڵ زیندانی بێ دادگایی کردن لە گرتووخانەی ناوەندی بەغدا دراوە، بەڵام بەهۆی کۆمەڵێك ئەفسەر و پاسەوانی بەندیخانەکە کە خەلکی گەرمیان بوون بەناوەکانی(محەمەد و کەریم و عەبدوڵڵا) هاوکاری دەکەن و لەگرتووخانە رایکردووە،دوای ئەوە گەیشتووتەوە دەربەندیخان و لەوێش خێزان و منداڵەکەی بۆ هاتووە، لەو ماوەیەدا دوو منداڵیان بووە بەناوی ئاسۆ١٩٤٣وشیرین١٩٤٥، لەوماوەیەدا چاودێری شۆڕشی بارزانی کردووە و ئاگاداری پێشهاتەکانی شۆڕش بووە، ئیتر دوای کۆتایی پێهێنانی شۆڕشی بارزان و ڕۆیشتنی مستەفا بارزانی بەرەو مهاباد توانی خۆی بگەیەنێتە بارزانی و پەیوەندی بە کۆماری کوردستان کردووە، خێزانەکەشی لەگەڵ دایکی شەهید (محمد قودسی)بەرەو رۆژهەڵاتی کوردستان چوون و لە ئێران نیشتەجێبوون.

نوری ئەحمەد تەها بووەتە جێگای متمانە و باوەڕپێکراوی بارزانی و راوێژکاری سەربازی بووە، لەسەروبەندی تێکچوونی کۆماری کوردستان و دوای دەستگیرکردنی زۆربەی ئەفسەرانی کۆمار ، ناوبراو بۆ ئەوەی خێزانەکەی

ڕەوانەی باشور بکات و بیانئێرێتەوە و خۆشی پەیوەندی بە بارزانی بکاتەوە لەسەر سنور لەلایەن فەرماندەی هێزەکانی سەربازی (سید علی الحجازی) دەگیرێت و ڕەوانەی گرتوخانەی ناوەندی بەغدا کراوە.

ئیتر نێوبراو لەناو پارتی دیموکراتی کوردستان لە سەرکردایەتیدا ڕۆڵی گێڕاوە،هەر لە پێش کۆنگرەی دامەزراندنەوە ئەو ئەفسەرانەی خاوەن بەهرە و توانا بوون ڕێکخستنی (لیژنەی ئازادی)یان دامەزراند، بووە هەوێنی دروست بوونی پارتی دیموکراتی کوردستان و جگە لە هەمزە عەبدولاَ هەریەك لە نوری ئەحمەد تەها و میرحاج ئەحمەد و مستەفا خۆشناو و محەمەد مەحمود قودسی و خەیرولا عەبدولکەریم و عزەت عەبدولعەزیز ئەوانە ئەو ئەفسەرانە بوون ریزی حیزبی هیوایان جێهێشت و پەیوەندیان بە شۆڕشگێرەکانی بارزانی کرد و لیژنەی ئازادیان دامەزراند، دروست بوونی پارتیش وەکو پێداویستیەکی مێژوویی لەو قۆناغەدا دروست بوو،دوای دامەزراندن و دوای گیرانی نێوبراو لە کۆنگرەکانی تری پارتی ڕۆڵی سەرکردایەتی گێڕاوە و هەڵبژێردراوە، لە کۆنگرەی سێیەمی پارتی لەکەرکوك لە ١٩٥٣/١/٢٦بەسترا نوری ئەحمەد تەها یەکێك بوو لە ١٣ئەندامەکەسەرکردایەتی نوێدا، لە پێش کۆنگرەی چوارەمیشدا بەهۆی بوونی کێشەی ناوخۆیی پارتی نوری ئەحمەد تەها لە پێکهاتەی کاتی لیژنەی ناوەندی بووەتە یەکێك لە ئەندامانی لیژنەی ناوەندی پارتی لەساڵی ١٩٥٥دا، لەکۆنگرەی چوارەمیشدا کە لە ١٩٥٩/١٠/٧ بەستراوە بە ئەندامی لیژنەی ناوەندی هەلبژێردرایەوە، لەکۆنگرەی پێنجەمیش دوای مۆڵەت وەرگرتنی پارتی بۆیەکەم جار بە ئاشکرا لە مایسی ١٩٦٠بەسترا بە ئەندامی لیژنەی ناوەندی هەڵبژێردرایەوە لەپاڵ جەلال تالەبانی و عەزیز شەمزینی بەلاَم بێ ئەوەی

ناوەکانیان ئاشکرابکەن چونکە خۆی و ناوبراوان لە نێوسوپادا ئەفسەربوون و ناوەکانیان رانەگەیەنرا، هەر لەسەردەمی کۆماری یەکەمدا(١٩٥٨-١٩٦٣)چەندین پۆستی وەرگرتووە لەلایەن عەبدولکەریم قاسم خۆشەویست بووە و ماوەیەك بەڕێوەبەری ناحیەی (جبایش) بووە،دوای هەڵگیرسانی شۆڕش پەیوەندی بە بە بارزانی کردووە، کەسێکی چالاك بووە لەبواری پەیوەندی و دبلۆماسیدا رۆڵی ئەرێنی گێڕاوە، لە کاتێکدا لەدوای حوزەیرانی ١٩٦٣بەعسیەکان گەورەترین هێرشی کاولکاریان کردە سەرکوردستان، نوری ئەحمەد تەها لە کۆتایی مانگی ئابی ١٩٦٣ توانی بەهۆی عەبدولرەزاق سەید مەحمودی پارێزگاری سلێمانی پەیوەندی بکات و بیرۆکەی ئاگربەست پەسەند بکەن دوای ئەوەی بە شێوەیەکی زۆر نهێنی پەیوەندی پێوە کرد، دەیگەیەنێتە ئەو راستیەی کەوا چارەسەری سەربازی بۆ دۆزی کورد سودی نابێت و پێویستە بەربەستێك بۆ خوێنرژان دابنرێ دەستپێکی دانوستان لە رێگەی نێوبراوەوە دروست بوو، ئیتر تا کەرتبوونی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد و هەوڵی نەهێشتنی دووبەرەکی داوە و لەو ماوەیەدا لە چەمی رێزان داوای لە ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تالەبانی کردووە دووبەرەکی نەکەن و بەقسەی بارزانی بکەن بەلاّم داواکەی نەچۆتە سەر و گەڕاوەتەوە و ئەو ماوەیە لەسلێمانی ژیاوە.

لەدوای کەرتبوونەکە بەگوێرەی دۆکیۆمێنتێکی فەرمی حکومەتی عێراقی وەزارەتی دارایی و بەڕێوەبەرایەتی خانەنشینی گشتی – هۆبەی سەربازی لە١٩٦٦/١٠/٢ مامەڵەی خانەنشینی کردووە وەکو لە بەڵگەنامەکە دەردەکەوێ لەگەڵ دانیشتن بووە، تا رێککەوتنامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ لە سلێمانی ژیاوە و لەو ماوەیەدا پەیوەندی رۆشنبیری لەگەڵ رۆشنبیرانی شار هەبووە، دوای ئەوە

لەبەغدا ژیانی بردۆتە سەر لەگەڵ دەرکەوتنی بارگرژی و پاشگەزبوونەوەی رژێمی بەعس لە بەڵێنەکان و بەیانی ١١ی ئازار و دوا بەدوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول بەهۆی پیلانگێری رێککەوتنامەی جەزائیری ئاداری ١٩٧٥ نوری رووەدەکاتە ئەلمانیا ، بەلام بەهۆی فشاری حیزبی بەعس لەسەر خێزانەکەی دەگەڕێتەوە کوردستان، ئەو ماوەیە لەسلێمانی بەناچاری ژیانی گوزەراند و لەدوای راپەڕین لەکاتی کۆڕەوەکە بەهۆی نەخۆشی لە ٢٥ی ٥ی ١٩٩١لە مهابادی پایتەختی کۆماری کوردستان کۆچی دوایی کرد [1].

[1] تێبینی: بۆ سەرچاوەی ئەو زانیارانە سود لە دۆکیومێنتێکی فەرمی حکومەتی عێراق ،خاتو ناراس نوری ئەحمەد تەهای کچی خوالێخۆشبوو، کتێبەکەی حەبیب محەمەد کەریم بەناوی (تاریخ الحزب الدیمقراطی الکوردستاني_العراق في محطات رئیسیة) و کتێبی بەڵگەنامەیی د.عەبدولفەتاح علی یحیی بۆتانی وەرگیراوە.

# بامەرنێ و زیندانا نخافتی

گارزان محمد بامەرنی

ل ناڤەندا ناحیا بامەرنێ ول نیڤا گرەکی وتایبەتی هندائ تاخێ شیڤا هرجا ژ ئالێ رۆژئاڤایڤـە, شـینوارن شـویرهەکا ژورەکـێ دیاردکـەن، ب ژورا زینـدانێ دهێتـە ناسکرن، ژلایێ دانعەمر و رهسبیێن بامەرنیاڤە، لدویف گـوتنێن ئـەوان ژورا زینـدانێ هاتیە ئاڤاکرن بەرامبەر هەلاتنا رۆژێ ئانکو بەرامبەر هەتاڤێ وتیرۆژکێن رۆژێ , بەلێ ئەز نابێژم زەرەدەشتیا زیندان ئاڤاکریتن ژبـەرکو چـو بەلکـە دەسـتێ منـدا نینـن , تنێ مەرەمامن ژبو دیارکرن ودەستنیشانکرنا جهێ جوگرافیێ زیندانێ بوو, براسـتی جهێ جوکرافێ زیندانێ کەلەکێ ڤەشارتی و نخافتی بوو, ژ دورڤـە زەحمـەت بـزانن ئەڤە زبندانە, تا نێزیك دبین دێ دیاربتن کو ژورەکە دبنێ کەڤرەکی دا هاتیە کـولان و وەك ژورەکا ڤەشارتی یە.

نڤیسەر دگەل دوو کـەنجێنن ئـاکنجیێن بامـەرنێ بنـاڤێ ( بلنـد عبـدالله و تـالان حسن) ل ئێڤارەکێ مە هەرسکێا سەرەدانا شینوارن زیندانێ کر , و ژنێزیك مە وێنە کر , تشتێ پێش جاڤێن مە کەفتی , زیندان پێك دهێت ژ ژورە کا مەزن و کویر ولبن گەڤرەکێ مەزن بکیراتی هاتیە کولان، بـەلێ ببورنـا دەم و سـالان وژئەگـەرێ رهیانـا ئاخ وبەران ژورا زیندانێ ژ نیڤەکێ پتر هاتیە تژیکرن و بەرزەکرن, وشـورها زینـدانێ ئەوا دیاردکەت ژ ئالێ ژدەرڤە بلنداهیا وێ دگەهیتە متر و نیڤـا, وژ ئـالێ ژورڤـە دوو مترا بلندە , وشورهە هاتیە ئاڤاکرن بدەستێن کەسانێن شـەهرەزا و ببـەرێن سـتویر وبەحن ودرێژ , وشورهە هاتیە دانان وبلندکرن برەنگێ کڤانـە، ژ لایـێ راسـتێ درێـژ دبیت تا لایێ چەپێ , ببەرێن پەحن وستویر ودرێژ ودرژا هیا هەر بەرەکێ شـویرهێ ژ مترە کێ تا دوو مترانە , جونکە ئـە و کەسـێ زینـدان دبـتن دا ب هـیچ رەنگـەکی بزاڤا رەڤێ نەکەتن, تنێ سەرێ دەرکەهێ زیندانێ دیاردکە ت دکەڤتە لایێ چەپێ ,

وە سا دیارە ئەو رەخ رێکا سەرەکیا هاتن وچونا زیندانیٚ بوو, وتشتیٚ ما ژ دەرگە هیٚ زیندانیٚ پێك دهێتن ژهەر رەخەکیٚ ویٚ بەرەکیٚ پەحن ودرێژ ومەزن بوو , دیسان بەرەکیٚ پەحن ومەزن ودرێژ وەك بانیٚ(حێسیلە) دەرکە هی هاتبو دانان . هەروەسان ژ لاییٚ راستیٚ ژ ژورا زیندانیٚ شینوارن ریکەکیٚ دیاردکە ن, و وەك مە گوتی ژورا زیندانیٚ دبنیٚ گەڤرە کیدا هاتبو چێکرن،ئەو گەڤر ژی بسروشتیٚ خو وەك کڤانەکیٚ بو (قوس) ئانکو سەریٚ گەڤر دکەڤتە هنداڤ ژورا زیندانیٚ، بسروشتیٚ خو وە ك بانە ك دهاتە کارئنان بو ژورا زیندانیٚ ,بەلکە ژ ئەو کەسێن شەهرەزا زیندان چێکرین بدەست وئامێرێن خو بنیٚ گەڤری شکاندبتن وکربیتە بانەکیٚ خورستی هنداڤی ژورا زیندانیٚ , لە ورا سەریٚ گە ڤری وەك بانەکی لیٚ هاتیە, چدبتن جەیٚ نوبەدار وزێرەڤانان ل رە خ وروێن ژورا زیندانیٚ هەبن, بەلیٚ پێش چاڤێن مە نەکەفتن. جونکە ژئەگەرێن کارتکرنافاکتەرێن خورستی برهانا ئاخ وبە ران جهێن زێرەڤانان هاتنە ڤەشارتن وبەرزە کرن .

**دیروکا زیندانیٚ :**

دیروکا ئاڤاکرنا زیندانا بامەرنیٚ ل هنداف تاخیٚ شیڤا هرچا تانوکە نەهاتیە زانینن, جونکە پەرتوکێن دیروکی بەحس و ئاڤری نەداینە ڤیٚ زیندانیٚ , لەورا کەلەك بزحمەتە دەستبکا ئاڤاکرنا زیندانیٚ بدەمە دیارکرن , بتنیٚ دانعەمر و رەسێن بامەرنا دبێژن مەژی گوه لیٚ بویە ژ باب وباپیرێن خو کو ئەڤە زیندانە و چو پێزانینێن دی نەگوتینە مە . بەلیٚ هەر چاوابیت ناڤیٚ (زیندان) رامانەکا دیروکی ددەتە بامەرنیٚ , وە سا دیاردبیتن کو کەسانێن گونەهبار دهاتنە سزادان، دسان وەسان دیاربتن کو ( میرەکی یان پاشایەکی یان سەرکردەکی) دە ستهەلاداری ل بامەرنیٚ کربیت ل سەردەمەکی بامەرنیٚ جهیٚ پویتەدانا سیاسی یان لەشکەری بیت.

**ژێدەر:**

١ـ سەرەدانەکا مەیدانی بو سەر شوینوارێن زیندانا بامەرنیٚ ل رێکەفتی(٢٠١٢/١١/١٢).

# دۆزی ئەرمەن لە پەرلەمانی کوردستان

پارێزەر/ طارق جامباز
ئەندامی یەکێتی پەرلەمانتارانی کوردستان

ئەرمەن و کورد دوو نەتەوەی ستەم دیدەن کە بەهەموو جۆرێ دەسەڵاتدار هەوڵی سڕینەوەی ناسنامەی نەتەواتیەیانی داوەو (هەردووکیان جینۆسایدکراون) و ڕەوەندێکی زۆریشیان لەسەرتاپای دونیادا هەیەو سووربوونیان لەسەر سەلماندنی ناسنامەکانیان‌و شێوەو شێوازیان بەگوێرەی قۆناغ گۆڕیوەو بەکارهێناوەو پێکەوە ژیاون‌و برایەتی‌و لێبوردەیی بەدرێژایی مێژوو لەنێوانیاندا هەبووەو دەبێ.

ئەرمەنیەکان ژمارەیان نۆ ملیۆن کەس دەبێ، سێ ملیۆن‌و نیویان لەوڵاتی ئەرمینیاو پێنج ملیۆن و نیویشیان لەهەندەرانن ورێژەیەکی بەرچاویش لەنەتەوەی کورد لەوێ دەژین، ئەرمەنیەکان لۆبێکی بەهێزیشیان لەو وڵاتانەی تیا دەژین هەیەو توانیویانە بەپلانێکی تۆکمە بۆ دارێژراو لەچەندین وڵات‌و ویلایەتی وڵاتان‌و ڕێکخراوەکانی نێودەوڵەتی جینۆسایدیان بەنێودەوڵەتیکردنی بەرن‌و لەم پێناوەشدا (یاساو بڕیارێکی) زۆر دەرچووەو دەردەچێ، گەرچی نەتەوەی کورد ژمارەی لەچل ملیۆن کەمتر نییەو لەزۆر وڵاتانی دونیاشدا هەن‌و بۆ نموونە لەئەڵمانیا (ملیۆنێك کورد) هەیە بەڵام بۆ چ لەو ١٦ ولایەتانەی کە ئەڵمانیای لێ پێك دێت لە (تاقە) ولایەتێکیان مەرگەساتی کوردیان بەجینۆساید نەناساندووە؟.

پێویستە چاولێکەری دۆزی ئەرمەنییەکان بکەین و سوود لەئەزموونیان لەبارەی بەجینۆساید ناساندنی دۆزەکەیان بکەین، لەم پێناوەدا دەبوایە چەندین شاند سەردانی وڵاتی ئەرمینیایان کردبایەو بکەن و رەوەندی کوردیش پەیوەندی بە رەوەندی ئەرمەن و لۆبی ئەرمەنی لەوڵاتان بکات تاکو بەپلانێکی تۆکمەی بۆ دارێژراو جینۆساید ناساندنی نەتەوەکەمان بەدونیا بناسێنن و بزانن چیان بەسەر هێناون و هەموو جۆرە چەکێکیان دژی بەکارهێناوەو لەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەر دابەشکراوە تاکو ئێستاش جگە لەبەشێك لەباشووری کوردستان دان بەناسنامەی نەتەوەکەمان نانێن.

لەنێو هۆڵی پەرلەمانی کوردستان زۆرجار کە قافی قسە هاتەوە پەیوەندیم بەخوشکە بایزار کرد کە ئەرمەنی بوو لەخولی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان داوامان لێدەکرد کە قسە لەبارەی دۆزی ئەرمەنییەکان بکات و لەگەڵ پەرلەمانتارانی دیکەی کوردیش لەم بارەوە قسەم دەکرد، ئەوانیش کوردانە قسەیان کردو ئەمەش دەقی وتەکانی پەرلەمانتارانی خولی دووەمی پەرلەمانی کوردستان.

پەرلەمانی کوردستان– عێراق

پرۆتۆکۆلەکان/ ژ٤٦/دانیشتنی ژمارە ٧ لە١٤/٤/٢٠٠٨

بەڕێز طارق محمد سعید جامباز:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن.

دەبی ئێمە بگەڕێینەوە ناساندنی جینۆسایدی کورد ساڵی ١٩٦٢ وڵاتی مەنگۆلیا پێشکەشی یۆئێنی کرد، بەداخەوە پرۆژەکەم بەدەستەوە نییە، بەڵام

لە ١٣ی/ئەیلولی/١٩٨٨ لەکۆنگرێسی ئەمریکی لەهەشت مادە پێشکەش کرا بەناوی جینۆساید، یەك، دوو برگەی دەخوێنمەوە (بەندی یەکەم/ ئەم یاسایە ناودەنرێ بەناوی یاسای قەدەغەکردنی جینۆساید بۆ ساڵی ١٩٨٨، لەبرگەی دووەم/ لەحەرفی (ز)، شالاوە سەربازییەکانی عێراقی دژی گەلی کورد کاریگەری لەکارەکانی نەهێشتنی رەگەزایەتی قەزایەتی جینۆساید ئەوە تاوانێکە بەر نەفەرەتی‌و بێزاری کۆمەڵگەی مەدەنیەت لەهەر شوێنێك دەکەوێت، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو کارە قەدەغەیە بەگوێری یاسای نێودەوڵەتی، بەندی چوارەم/ عێراق تاوانی جینۆسایدی لەدژی گەلی کورد پیادە دەکات، بەندی حەوتەم/ بڕیاری ژمارە ٦٢٠ ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بەنەتەوە یەکگرتوەکان ئیجرائاتی کاریگەر گونجاو دژی عێراق وەربگرێت لەبەر ئەوەی چەندین جار چەکی کیمیایی بەکارهێناوە، ئەوی مەلا سعد الدین باسی کرد، شتێکی زۆر گرنگە بکەوێتە بەر دەست، دەکرێ ئێمە تەماشای جینۆسایدی خۆمان بکەین، هیچی کەمتر نییە لەجینۆسایدی ئەرمەنییەکان، هەر ئەمڕۆ بەتەلەفۆن لەفەرەنسا بۆم هات، کە ١٦ وڵات بڕیاری جینۆسایدی ئەرمەنیەیان لەپەرلەمانەکەیان دەرچوواند، وڵاتەکانیش ئەوانەن (نۆرگوای، قبرص، یونان، روسیا، ئەمریکا، لبنان، بەلجیکا، سوید، فاتیکان، فەرەنسا، سویسرا، ئەرجەنتین، هۆڵەندا، سلۆفاکیا، کەنەدا، پۆڵۆنیا...)، پێنج رێکخراوی نێودەوڵەتیش، دادگای هەمیشەیی نەتەوە یەککگرتووەکان، پەرلەمانی ئەورووپا، ئەنجومەنی ئەورووپا ناساندوویانە، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ فەرەنسا ئەوا بۆ جینۆسایدی ئەرمەنیەکان، لەوێ دوو بڕیار دەرچوو (٢٠٠١، ٢٠٠٦) ئەوەی کە ئێمە دەیکەین شتێکی زۆر باشە، بەڵام لەوێ بڕیار لە ٢٠٠١ بەناساندنی جینۆسایدەکە دەرچووە ، بەڵام ٢٠٠٦ وتوویانە

بڕیارەکە شتێکی رەمزییە، بەڵام ئەوەی نکۆڵی کرد، لەوێ یاسایان دانەناوە، پێم باشە لێرە پرۆژە یاسایەك ئامادە بکرێ، ئەوەی نکۆڵی دەکات، چونکە لەوێ ئەوەی ئینکاری جینۆسایدەکە دەکات، لەوێ زیندانی سالێکیان بۆ داناوە لەگەڵ ٤٥ هەزار یۆرۆ غەرامە لەسەر شەخصەکە، ئێمەش پێویستە بەهەر شێوازێك بێت، شێوازەکان لە مادەکان باس کراوە پاشان دەیدەمە سەرۆکایەتی بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرن، پرۆژە یاسایەکە پێویستە تەنیا ئەوە نەبێت ئێمە لێرە جینۆسایدەکە بناسین، بەڵکو سزای ئەو کەسانە بدرێ کە نکۆڵی لەجینۆسایدەکەش دەکەن، سوپاس.

پەرلەمانی کوردستان– عێراق

پرۆتۆکۆلی ژ٥١ لە دانیشتنی ژمارە (٣)ی نائاسایی

پێنج شەممە رێکەوتی ٢٠٠٩/٢/١٢

خولی دووەمی هەڵبژاردن

بەڕێز جەمال یوسف بۆتانی:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن.

مکەوناتی مەسیحی لەکوردستان نیشانەیەکی پێشکەوتووە بۆ نیزامی دیموکراتی کە ئەمڕۆ هەیە لەعێراق و لەکوردستان. پەیڕەوکردنی لەڕووی عەمەلی و بەو نیزامەی کە دەڵێن کۆتا شتێکی زۆر چاکە، بەڵام من ئەوەی مولاحەزەی دەکەم مکەونێکی تری مەسیحی فەرامۆش کرا کە ئەوانیش ئەرمەنیەکانن، ئەرمەنیەکان غوبنێکی تەئریخیان هەیە. هەر لەساڵی ١٩١٥ وە مەجزەرەکە کە ڕووی داوە و تا ئێستاش دەربەدەرن لەو وڵاتانەی کە ئیهتمام بەحقوقی ئەوان

دەدەن، ئێستا لەئێران ئیهتمامـاتێکی باشیان پێدەدەن‌و نوێنەریان هەیە، لەلوبنان هەر نوێنەریان هەیە، کە ئەو غوبنە تەئریخیەشیان لەسەر هەیە، ئەمڕۆ لەکوردستاندا، حەقە ئێمە میسالێکی چاکتریش بین، جالیەکی گەورەش هەیە لەئەورووپاو لەئەمریکاو کەنەدا، لەزاخۆ لەمەنتیقەی زاخۆ ژمارەیەکی زۆریان هەیە، کە ئێستا دێهاتیان هەیە، حەقە ئەو مکونە مەسیحسە فەرامۆش نەکرێت، ئیتر سوپاس.

بەڕێز اندریوس یوخنا گورگیس:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن:

مولاحەزەم هەیە لەسەر خوشکە بایزار، بەڕاستی خوشکە بایزار هەرچەند ڕێزم هەیە بۆی نوێنەری حزبی کلدانیە، بەڵام ئەو بەخۆی ئەرمەنە، ئەرمەن جیاوازی هەیە لەکلدان‌و ئاشوورو سریان، ئەرمەن نەتەوەیەکی جیاوازە.

بەڕێز عبدالکریم ابوبکر مصطفی:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن:

دووەم: ئەرمەن هەیە، بڵێین‌و نەڵێین لەکوردستان هەیە، ئێستاش لەدەستووری عێراقدا هەیەو لەدەستووری ئێمەشدا لەڕەشنووسەکە ئەرمەنمان تێ کردووە، بەڵام لێرە دانەنراوە، من ئیقتراح ئەکەم ئەوەش بێتە ناو پرۆژەکەوە، چونکە ئەوانیش قەومیەتن، لێرەدا نەهاتووە، دەمەوێت لەم یاسایەشدا بێت، سوپاس.

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن:

باشە ئەوانەی کەناویان نووسیوە با قسە بکەن، کاک تاریق فەرموو

بەڕێز طارق جامباز:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن:

ئەو برگەی کە خوێنداریەوە، بەداخەوە ناوی ئەرمەن لەبیرکراوە، ئەرمەن نەتەوەیەکی تایبەتەو زمانی خۆی هەیە، سەقافەو شتەکانی جیاوازە، لەگەڵ ئەوانی تر، زۆر پێویستە لێرەدا کۆتای هەبێت، من پشت ئەستوورم بەوەی کەوا لایەنی دەستووریو لایەنی یاسایی باس ئەکەم، ئێمە بریارێکمان لەپەرلەمانی کوردستان دەرکردووە، بەژمارە (٢٦) لە ٢٠٠٢/١١/٧ لەویێ پێکهاتەکان ئەرمەنیشی تێدایە، ئەوە خاڵی یەکەم: لەهەمووارکردنی سێیەمی پەرلەمانی کوردستان برگەی یەکمان هەیە، کە کام حزب لەحزبەکانی ئەو نەتەوەیە، زۆرترین دەنگی هێنا کورسیەکی ئەدرێتیێ، ئەرمەن کورسیەکی دراوەتیێ، بەلآم ئێستا ئێمە پەشیمان ببینەوە کورسی نەدەینیێو ناوی نەهێنین ئەوە نابێت، لەقانونی تاڵ لەماددەی نۆ کاك فرسەت لەهەموومان باشتر ئەزانیێ کە ئێمە دواتر لەدەستووری عێراقی بەشداریمان کرد، ناوی ئەرمەن لەدەستووری عێراقدا هەیە، بەسەراحەت دێت، لێرە لابراوە، لەدەستووری عێراقی دان بەهەموویاندا دەنێت، من کەباسی ئەوە ئەکەم لە ١٩٩٢ و ٢٠٠٤ دان بەهەموو بریارو قانونەکانی پەرلەمانی کوردستان دەندرێت، ئێمە کە بریارمانداوە ئێستا پەشیمان ببینەوە، ئەوە ناکرێت، لەپرۆژەی دەستووری ئێستاشمان ناوی ئەرمەن هاتووە، بۆیە مافێکی دەستووری یاساییە، دەبیێ ناوی ئەرمەن بێت، ئەگەر هاتو لەبیرکرا، واتە مافەکانی دەستووریو یاساییان پێشێل دەکرێت، زۆر سوپاس.

بەرێز رۆمیۆ حزیران نیسان:

بەرێز سەرۆکی ئەنجومەن:

ئەگەر دەتانەوێت ناوی ئەرمەنیش بێت، دەبیێ کۆتایەك بۆ ئەرمەنیش هەبێت.

بەرێز سەرۆکی ئەنجومەن:

لەسەر ئەرمەن تۆ پێش کەوتی، مەعلومە هەموو کەس دەزانێت ئەرمەن میللەتێکی جیاوازن، مێژوویان جیاوازە، زمانیان جیاوازە، حەتا بڵێین ناحیەی دینیش تقوسیان جیاواز بێت، کە ئەوەش مەوزوعێکی ترە.

بەڕێز د. ناصح غفور رمضان:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن:

منیش پشتگیری ئەوە ئەکەم کە ئەبێت ئەرمەن نوێنەرێکی هەبێت، بەڵام بۆچی یەك نوێنەر بێت، چونکە بەڕاستی ژمارەی ئەوان بەرامبەر بەئاشووری‌و کلدانییەکان کەمترە، ئەوان لەزاخۆو لەچوار دێی دەوروبەری زاخۆ هەن، تەبعەن جوولەکەش هەیە لەئێران ژمارەیان زۆر زۆر کەمە، دوو، سێ هەزار کەسن، بەڵام نوێنەر تایبەتی خۆیان هەیە، بۆیە منیش پێم وایە زۆر زۆر سروشتیە نوێنەری کۆتاییەك دابنێین یەك نوێنەر بێت. کەسێك هەبێت بۆ ئەرمەن لەهەرێمی کوردستان، زۆر سوپاس.

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن:

دوایش مەوزوعی ئەرمەن دوا بخەن، ئەوە مەوزوعێکی ترە باسی دەکەین.

کاك تاریق نوقتەی نیزامی هەیە، فەرموو.

بەڕێز طارق جامباز:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن.

من جەخت دەکەمەوە کە لەم ماددەیە ناویان بهێنرێت‌و کۆتایان بدرێتێ.

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن

ئێستا موقتەرەحێك هاتووە لەسەر مەوزووعی ئەرمەن، رەئێك هەیە دەڵێ

مەقعەدێکیان بدەینێ، دەمەوێ بەس ئەوەندەیە ئەوانەی شارەزان بەس پێمان بڵێن لەکوردستان لەو سێ شارەدا، چەند ئەرمەن هەیە؟. ژمارەیەکمان بدەنێ، تەقدیرێکمان بدەنێ، بۆ ئەوەی موناقەشەکە لەرۆشناییدا بێت، بەعاتیفە نەبێت، چونکە میللەتێکی عەریقن، میللەتێکی گەورەن، میللەتێکن لەتاریخدا دەوریان هەبووەو دۆستی ئێمەنەو ڕێزیان هەیە، لەدەستووری عێراقیشدا کە ناویان هاتووە، تەحالوفی کوردستان ئیلحاحی کردووە، ئێمە داوامان کرد دەبێ ناوی ئەرمەن بێنن، لەوێشدا لەسەر ئیلحاحی ئێمە ناویان هاتووە، وەئەگەر لێرەشدا نەبن مەعنای وانییە حقوقیان لەدەستوور نییە. دیسان ئاماژەی پێکراوە، وەکو مکونێك لەکوردستاندا ناویان هاتووە، بەڵام دەبێت بزانین ڕێژەیان چەندە، چونکە سابیئەشمان هەیە لەکەرکوك، هەرچەندە لەهەرێمدا نییە، ڕەنگە ٥٠٠٠–٦٠٠٠ کەس زیاتر بن، کێ شارەزایە ژمارەیان چەندە؟ شیرین خان‌و کاك جعفر، فەرموو کاك جعفر.

بەڕێز جعفر مصطفى معروف:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن:

من قسەی کاك جەمال دەکەم چووە دەرەوە، دەڵێت لەمەنتیقەی زاخۆش ئەرمەنیەکان ژمارەیان لە ٢٠٠٠ هەزار کەس زیاترە.

بەڕێز شیرین عبدالرحمن دینۆ:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن:

بەنیسبەت ئەرمەن من تەئیدی کاك جمال یوسف دەکەم، کە ئیشارەتی پێدا هەروەها کاك تاریق، تەئکید ئەرمەن ٢٠٠٠ هەزار زیاترن هەتا سێ هەزاریش

دەبێت، ئێستا لە بەغداو موسل ٣٠٠٠ هەزاری تیادا هەیە تەقریبەن ئەرمەن، بەنیسبەت لەشاری زاخۆ ١٠٠٠ هەزارو تشتەکەن، دوو گوندیان هەیەو قوتابخانەیان هەیە، بەزمانی خۆیان دەخوێنن، لەگەڵ ئەوەش من دەڵێم لەدەسەلاتی پەرلەمانە، ئەگەر هاتو لێرە ناوی ئەرمەنەکان زیاد بکەن، ڕێز گرتنە بۆ ئەو نەتەوە تایبەتیەتی خۆی هەیەو بەشدارە لەهەرێمی کوردستان، من داوا لەهەموو برادەران دەکەم، ئەوەی دەنگی داوە بۆ ئەرمەنەکان تەسبیت بێت لێرە، لەدەسەلاتی سەرۆکی پەرلەمانە، بێتە دەنگدان کارمەندیان هەبێت یان نەبێت؟ ئەگەر ئێمە تەماشا بکەین لەئێران ١٠٠ کەسەك هەبێ لەوێ مەقعەدێکیان هەیە لەپەرلەمان، بەس ئەوان بەهەزاران هەنە، زۆر سوپاس.

بەڕێز ئارێز عبدالله احمد.

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن:

نەتەوە بەژمارە پێوانە ناکرێت، چەندە یان چەند نییە، هەموومان ئەو حەقیقەتە دەزانین، سەبارەت بەئەرمەنیش نەتەوەیەکن هەن، بەس ئێمە کاتێك باسی ژمارە دەکەین، بۆ ئەوەمانە بزانین ئایا کۆتاییەکەیان یەك بێت، پێنج بێت، سێ بێت، چوار بێت بۆ ئەوەیە، ئێستا مەسەلەن بڵێین یەك ڕەنگە کەم بێت، بەس بڵێن پێنج ڕەنگە بەپێی حەجم بێت ئەوەی هەیە، لەبەر ئەوە دوێنێش قسەیەك کرا، بەگوتن پێشنیار نییە، من پێشنیار دەکەم هەم ئەو مەعلوماتانەمان بۆ ئەوەیە بزانین کۆتاییەکە چەند بێت؟ هەم دوایی بەپرۆژە تەقدیم بکرێت، بەپێی ئەو حەجمەی کە هەیە، یەعنی ئەو نسبەتەی کە هەیە، ڕێژەیەك دابنرێت، یەك، دوو، سێ، چوار، ئێستا ئێمە هەرچی بڵێین، لەیەك زیاتر بن، ڕەنگە حەقیان زیاتر بێت، پێشنیار دەکەم ئەو مەسەلەیە تەئجیل بکرێتەوە،

بەپرۆژە تەقدیم بکرێت، سوپاس.

بەڕێز محمد حاجی محمود:

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن:

بەرەئی من مەسەلەی نەتەوەیەك، ژمارە چەند بێت یان چەند نەبێت، گوندێکیش بێت ١٠٠ ماڵیش بێت، ئەوەندە بێت، ئێمە ئەو هەنگاوەی کە ئێستا نراوە، بەقانونی کۆتا با تەکاملی بکەین، باشترە بەرەئی من، ئێمە ئەوەی دەستوور، دوایی دەستوور چۆن قەرار دەداتو چۆن دەکات ئەوە شتێکی ترە، بەڵام بەرەئی من، ئەگەر هەرچەندێك بن با یەك کەسیان بۆ دابنرێت بۆ ئەرمەن، چونکە مەوزوع تەنیا ئەوە نییە، ئەوە ئاینێکە، نەتەوەیەکە بوونی خۆی هەیە، هەرچەندێك بێت پێموایە ئەوە بۆخۆمان و بۆ هەموو لایەك باشە، زۆر سوپاس.

بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەن:

ئێستا دیسان دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی مقعەدێکیان بدەینێ، ئەگەر قسەی ترتان نیە، من ئەو موقتەرەحە هی ئەغلەبتانە، قەومیەتێکی ترن، حەقی خۆیانە ڕێزیان لێ بگیرێت، مەقعەدێك بالە ئێمە کەم بێتەوە، کێ لەگەڵ ئەوەیە کۆتاییەکە بێت، یەك مەقعەد بۆ نەتەوەی ئەرمەن بێت دەستی بەرز بکاتەوە تکایە؟ سوپاس کێی لەگەڵدا نییە؟ سوپاس بەکۆی دەنگ مەقعەدێك لەکۆتادا دەبێتە هی نەتەوەی ئەرمەن.

لەبارەی دۆزی ئەرمەنی قسەیان کردووە تاکو بزانرێ کە (داکۆکی کردن لەمافی نەتەوەیەك) داکۆکی کردنە لەمافی نەتەوەکەی خۆی چونکە کورد لەگەڵ مافی هەموو پێکهاتەکانی نەتەوەیی‌و ئایینی باشووری کوردستانەو لەم بارەوە لەهەرسێ قۆناغی نووسینەوەی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان‌و

هـەمواركردنی پێنجـەمی یاسـای پەرلـەمانی كوردسـتان- هـەمواركراو یاسـای پارێزگاكانی هەرێمی كوردستان لەپەرلەمانی كوردستان نەتەوەی ئەرمـەن وەكـو نەتەوەیـەك ناویـان هـاتووەو لـەراپۆرتی لیژنـەی یاسـایی پەرلـەمانی كوردسـتان ئیمزام نەكرد لەبـەر ئـەوەی كۆتـا بـۆ ئەرمـەن تەرخانـەكرابوو لـەژێر نـاوی خـۆم نوسـیم (لاریمـان هەیـە)و ئـەم نووسـینەم بەمەبەسـتی دەرخـستنی هەڵوێـستی پەرلەمانی كوردستانە پێشنیاز دەكەین لەبەر ئەوەی بەزمانی كـوردی نووسـراوە بكرێتە زمـانی ئەرمـەنی تـاكو زۆرتـرین كـەس بـزانن‌و رێكخراوەكـانی كۆمەڵگـەی مەدەنی (ئەرمەنی- كوردی) پەیوەندی‌و بەردەوامبوونی چ بەسەردانی یـەكتر یـا بـەئیمێڵ یـەكتر بەسـەربكەنەوەو هـەروەها رێكخـراوی دۆسـتایەتی (ئەرمـەنی- كـوردی) دابمـەزرێنرێ‌و ژمارەیـەكی كـوردیش لەئـەرمینیا دەژیـن كونـسوڵخانەی ئەرمینیاش لەباشووری كوردستان بكرێتـەوەو هێڵـی ئاسمـانی راسـتەوخۆ لـەنێو ئەرمینیاو كوردستان هەبێ‌و خۆزگەكان زۆرن‌و هیوادارین هێدی هێـدی جێبـەجێ بكـرێ‌و دووری نزیــك بكرێتــەوەو راســتیەكان بــەدەر بخــرێن‌و بەڵگــەكانیش بڵاوبكرێنەوە.

## پاشکۆی (١)

## یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان- عێراق
## ژمارە (١) ی ساڵی ١٩٩٢و هەموارکردنەکانی

ماددەی پازدە:

برگە (٣) لەماددەی سیو شەش هەمواردەکرێو، بەم شێوەی خوارەوە دەخوێندرێتەوە:

(٣-ئەگەر حزبێ لەناو کۆمەڵە حزبێکدا کە هەموویان بەناوی یەك نەتەوەوە رکابەری دەکەن (تورکمان، کلدان، ئاشووری، ئەرمەنی، عەرەب) مام ناوەندی (معدل) هەڵبژاردنی بەدەست نەهێنا، ئەوە لەم بارەدا کام حزب لەحزبەکانی ئەو نەتەوەیە زۆرترین دەنگی هێنابێ، کورسیەکی دەدرێتێ).

ماددەی سی و شەشەم: (دووبارە)

یەکەم: پێنج کورسی تەرخان دەکرێ بۆ (کلدان سریان ئاشووری) کە پاڵێوراوانی ئەو پێکهاتانە کێبرکیی لەسەر دەکەن.

دووەم: پێنج کورسی تەرخان دەکرێ بۆ تورکمان کە پاڵێوراوانی ئەو پێکهاتەیە کێبرکێی لەسەر دەکەن.

سێیەم: یەك کورسی تەرخان دەکرێ بۆ ئەرمەن کە پاڵێوراوانی ئەو پێکهاتەیە کێبرکێی لەسەر دەکەن.

چوارەم: دەنگدەرانی ئەو پێکهاتانەی باسکران پاڵێوراوای پێکهاتەکە هەڵدەبژێرن.

## پاشکۆی (٢)

## یاسای پارێزگاکان‌و یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنەکانی پارێزگاکان‌و قەزاو ناحیەکان لەهەرێمی کوردستان– عێراق

## ژ (٤)ی ساڵی ٢٠٠٩

ماددەی سی‌و دووەم (دووبارە):

یەکەم: لەئەنجومەنی پارێزگای دهۆك دوو کورسی تەرخان دەکرێت بۆ کلدان سریان ئاشووری‌و پالێوراوانی خۆیان کێبڕکێیی لەسەر دەکەن.

دووەم: لەئەنجومەنی پارێزگای دهۆك یەك کورسی تەرخان دەکرێت بۆ پێکهاتەی ئەرمەن‌و پالێوراوانی خۆیان کێبڕکێیی لەسەر دەکەن.

سێیەم: لەئەنجومەنی پارێزگای سلێمانی یەك کورسی تەرخان دەکرێت بۆ کلدان سریان ئاشووری‌و پالێوراوانی خۆیان کێبڕکێیی لەسەر دەکەن.

چوارەم: لەئەنجومەنی پارێزگای هەولێر دوو کورسی بۆ کلدان سریان ئاشووری‌و سێ کورسی بۆ تورکمان تەرخان دەکرێت‌و پالێوراوانی پێکهاتەکانی خۆیان کێبڕکێیی لەسەر دەکەن.

پێنجەم: دەنگدەرانی هەر پێکهاتەیەك پالێوراوانی پێکهاتەی خۆیان هەڵدەبژێرن.

## پاشکۆی ژمارە (۳)

## کۆتای ئەرمەنیەکان (۲۰۰۹/۲/۱۲) لەپەرلەمانی کوردستان

چەند ساڵێکە بەچڕو پڕی بەدوای سەرچاوە لەبارەی نەتەوە هەرەشەلێکراوەکان دەگەڕێمو لەبارەی ئەمازیغییەکانی باکووری ئەفریقیا پڕۆژەی کتێبێکم لەبەردەستدایە، لەبەر ئەوەی وێکچوونێکی زۆر لەنێوان نەتەوەی کوردو ئەمازیغ هەیە، چونکە هەردوو سەرکردەی موسڵمان کە ڕۆڵێکی یەکجار مەزنیان لەبڵاوکردنەوەی موسڵمانیەتی هەبووە (سەلاحەددینی ئەیوبی-کوردەو تاریق کوڕی زیادیش ئەمازیغیە). هەردوو نەتەوەش لەزۆرینەی ئەو وڵاتانەی پێوەی لکێنراون نکۆڵی لەبوونیان دەکەنو ناوەکانی (کوردیو ئەمازیغی) یان گۆڕیوە بۆناوی نەتەوەی حوکمڕانو تاکو ناونانی مناڵانیشیان بەناوی نەتەوەکەیان قەدەغەیە. هێندە داخ لەدڵن لەبەرامبەریان، بۆیە چەکی کیماویشیان دژیان بەکارهێناوە، بەڵام لەبارەی ئەرمەنیەکان چەند هۆکارێك پاڵی پێوەنام کە زۆرترو بەپەرۆشتر لەم بوارەدا بایەخیان پێبدەم چونکە ئەم نەتەوەیە لە هەرشوێنێکی دونیادا ژمارەیان هەرچەندبێ ئەوا زمانی نەتەوایەتیان لەبیر ناکەنو قسەی پێدەکەنو ناوی مناڵەکانیشیان بەناوی ئەرمەن ناودەنێنو جگە لەوڵاتی ئەرمینیا ڕەوەندیان لەهەر ولاتێکدا هەبێ، جێپەنجەی هەڵوێستو تایبەتمەندیی ناسنامەیان پاراستووەو عەودالی کێشەی نەتەوەکەیانو توانیویانە تاکو ئەم نووسینە لە (۲۰) بیست وڵاتو ڕێکخراوەی نێودەوڵەتیدا جینۆسایدی ئەرمەنیەکان (۱۹۱۵- ۱۹۱۸) لەیاساو بڕیاری وڵاتانو ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکاندا دەربچوێنن و لەکوردستانیش هەر دوای ڕاپەڕینی ۱۹۹۱ەوە خوێندن بۆ نەتەوەکان بەزمانی زگماکیان دابین کراوەو چەندان پۆستو پلەو

پایەیان لە دەزگاکانی حکومەتی کوردستاندا هەیە.

وپێشتریش لەیاسای وەزارەتی رۆشنبیری‌و پەروەردەشدا ئەوا مافی رۆشنبیری‌و پەروەردەو فێرکردن دابین کراوەو کە لیژنەی پشتیوانی پەرلەمانی کوردستان بۆ فراکسیۆنی هاوپەیمانی کوردستان _٢٠٠٥) بەشداریان لە نووسینەوەی دەستووری عێراق کرد لەوێش شاندی کوردستان داکۆکی لەمافی نەتەوەکانی کوردستان دەکردو توانی ناوی هەموویان لەدەستووری کۆماری عێراقدا جێگیرو تۆمار بکات‌و ئەمساڵ کە باس لەپرۆژەی هەموارکردنی چوارەمی یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان کراو کۆتاشی بۆ نەتەوەکانی دیکە تورکمان‌و کلدان سریان ئاشووری دانراو ناوی ئەرمەنیەکان نەهات، بۆیە بەندە لەراپۆرتی لیژنەی یاسایی لەتەك ناوی خۆم نووسیم (لاریمان هەیە) کە پرسیاریان کرد بۆچ گوتم لەبەر ئەوەی کۆتا نەدراوە بە ئەرمەنیەکان لە گفتوگۆی دوو قۆڵی‌و سێ قۆڵی دووپاتم دەکردەوەو لەدانیشتنی تایبەتمەند بۆ هەموارکردنی چوارەمی یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان کە ماددەی دەیەم خوێنرایەوە، دەستم بەرز کردەوە بۆ ئەوەی قسە بکەم‌و کە نۆرەم هات گوتم: (ئەو برگەیەی کە خوێندرایەوە. ناوی ئەرمەن لەبیرکراوە، ئەرمەن نەتەوەیەکی تایبەت‌و زمانی تایبەتی خۆی هەیە، سەقافەو شتەکانی جیاوازە، لەگەڵ ئەوانی تر، زۆر پێویستە لێرەدا ناویان بێت، من پشت ئەستوورم بەوەی کەوا لایەنی دەستووری ولایەنی یاسایی باس ئەکەم، ئێمە بڕیارێکمان لەپەرلەمانی کوردستان دەرکردووە، بەژمارە (٢٦) لە (٢٠٠٢/١١/١٧) لەوێ پێکهاتەکان ئەرمەنیشی تێدایە، ئەوە خاڵی یەکەم: لەهەموارکردنی سێیەمی پەرلەمانی کوردستان برگە یەکمان هەیە، کە کام حزب لەحزبەکانی ئەو نەتەوەیە، زۆرترین دەنگی هێنا کورسیەکی ئەدرێتێ، ئەرمەن کورسیەکی دراوەتێ، بەڵام ئێستا ئێمە پەشیمان ببینەوەو کورسی

نەدەینیَو ناوی نەهێنین ئەوە نابێت، لەقانونی تالْ لەماددەی نۆ کاك فرسەت لەهەمووماں باشتر ئەزانێ کە ئێمە دواتر لەدەستووری عێراقی بەشداریمان کرد، ناوی ئەرمەن لەدەستووری عێراقیدا هەیە، لەماددەی چوارەم بەسەراحەت دێت، لێرەدا لابراوە، لەدەستووری عێراقی دان بەهەموویدا دەنێت، من کەباسی ئەوە ئەکەم لە ۱۹۹۲و ۲۰۰٤ دان بەهەموو بڕیارو قانونەکانی پەرلەمانی کوردستان دەندرێت، ئێمە کە بڕیارمانداوە ئێستا پەشیمان ببینەوە، ئەوە ناکرێت، لەپرۆژەی دەستووری ئێستاشمان ناوی ئەرمەن هاتووە، بۆیە مافێکی دەستووریو یاساییە، دەبێ ناوی ئەرمەن بێت، ئەگەر هاتو لەبیرکرا، واتە مافەکانی دەستووریو یاساییان پێشێل دەکرێت، زۆر سوپاس).

دواتر هەستم کرد کەدەبێ جەختی لەسەر بکەمەوە لە (نقطة النظام) هەمدیسان دەبێ ناویان تۆماربکرێو کۆتایان بدرێتی، چونکە باس لەوە دەکرا ژمارەیان چەندە، چونکە کۆتا ژمارەی پێویست نییە، بەڵکو مافێکی ڕەوایە کە دەبێ کۆتایان هەبێو، هەروەها نابێ هەڵوێستی چەندین پەرلەمانتار لەیاد بکرێ، کە ئەوانیش داکۆکێکی ڕێكو پێکییان کردو بۆ دواجاریش پێشنیازەکە بەکۆی دەنگ بڕیاردرا کە کورسییەك لە کۆتا لەپەرلەمانی کوردستان بۆ خولی سێیەمی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان بۆ ئەرمەنیەکان دابین بکرێت لە (۲۰۰۹/۲/۱۲) برگەکە بەم جۆرە لەیاساکە دەنگی بۆدرا: (سێیەم: یەك کورسی تەرخان دەکرێ بۆ ئەرمەن کە پاڵێوراوانی ئەم پێکهاتە کێبرکێی لەسەر دەکەن). ئەمەش ڕاستو دروستی پێکەوەژیانو لێبوردەیی نەتەوەکان لەکوردستان دەگەیەنێو لەتەك تورکمانو کلدان سریان ئاشووریدا واتە یازدە کورسی بۆ نەتەوەکان بەکۆتا تەرخان کرا، کە ئەمەش مافێکی دەستووریو یاسایی پێکهاتەکانی گەلی کوردستانە.

پاشکۆی ژمارە (٤)

بۆ/ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان- عێراق

بابەت/ راپۆرتی لیژنەی یاسایی

لیژنەی یاسایی بەیانی رۆژی (٢٠٠٩/٢/٨) بەرامبەر ١٩ی رێبەندانی ٢٧٠٨ی کوردی کۆبۆوە بۆ گفتوگۆ لەسەر پرۆژە یاسای هەموارکردنی چوارەمی یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان- عێراق ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٩٢ی هەموارکراو کە لەلایەن ژمارەی یاسایی لەئەندامانی پەرلەمان پێشکەش کراوە، دوای خوێندنەوەی یەکەمی لەدانیشتنی ژمارە (١٢)ی پەرلەمان لە (٢٠٠٨/١١/٤) دوای تاوتوێکردنو راگۆڕینەوە، لیژنەکەمان راپۆرتو راسپاردەکانی سەبارەت بەپرۆژەکە بەم جۆرەی خوارەوە پێشکەش دەکات بەمەبەستی پەلەکردن لەئەنجامدانی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان پێش کۆتایی خولی ئێستای:-

لیژنە پشتگیری لەپرۆژەکە بەشێوەیەکی گشتی دەکاتو پێشنیاز دەکات تەنها هەندێ گۆڕانکاری لەهەندێ لەم برگەو ماددانەی خوارەوە بکرێت:-

برگەی ٢ لەماددەی ٢١.

برگەی ١ لەماددەی ٢٢.

ماددەکانی ٤٦، ٤٩، ٥٠.

هەردوو برگەی (١، ٥) لەماددەی ٥٦.

زێدەکردنی دوو برگە بۆ ماددە ١٨ لەسێیەم هەموارکردنی یاساکە.

زێدەکردنی دوو ماددە بۆ سەر پرۆژەکە.

چونکە هەموارکردنەکانی تری پرۆژەکە جگە لە لەدارشتنەوە، چ گۆرانکاریەکی جەوهەری نەدەپێکا بەدەر لە:-

١- کەمکردنەوەی تەمەنی ئەندامی پەرلەمان لە ٣٠ ساڵ بۆ ٢٥ ساڵ.

٢- زێدەکردنی کۆتای نوێنەرایەتی ژنان لەپەرلەمان لە ٢٥٪ بۆ٣٠٪.

٣- تەرخانکردنی پێنج کورسی بۆ کلدانو ئاشووریو سریان.

٤- تەرخانکردنی پێنج کورسی بۆ تورکمان.

تکایە بفەرموون بۆ ئەو گۆڕانکاریەی لەپڕۆژەکەمان کردووە هاوپێچی ڕاپۆرتەکەمانە بکرێتە ئەساسی گفتوگۆو ڕادەربڕین لەبارەیەوە.

لەگەڵ ڕێزماندا...

| | | |
|---|---|---|
| عبالکریم هەمەوەند | دادوەر/ عەونی بەزاز | شێروان حەیدەری |
| بڕیاردەری لیژنەی یاسایی | جێگری سەرۆکی لیژنەی یاسایی | سەرۆکی لیژنەی یاسایی |
| خلیل ابراهیم محمد | طارق جامباز | کریم بحری برادۆست |
| ئەندام | ئەندام | ئەندام |

**لاریمان هەیە**

| | | |
|---|---|---|
| محمد صالح اسماعیل | دلێر محمد شریف | قادر سعید (زانا) |
| ئەندام | ئەندام | ئەندام |
| سەردار هەرکی | | د. رۆژان دزەیی |
| ئەندام | | ئەندام |

## پاشکۆی (٥)

**سەرلەبەیانی ١٤/٤/٢٠٠٨ کاك هەردی جاسم لەفەرەنساوە ئەم ئیمێلەی بۆم ناردم کە ئەمە دەقەکەیەتی:**

١- ئەو وڵاتو پەرلەمانانەی دانییان (اعتراف) بەجینۆسایدی ئەرمەنەکانەوە ناوە ئەمانەن:-

(ئۆرگـوای، ئەنجومـەنی نوێنەرایـەتی قـوبرس، ئەنجومـەنی نوێنـەرانی وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پەرلەمانی ڕوس، پەرلـەمانی یونـان، سـێنای بـەلجیکا، پەرلـەمانی لوبنـان، فاتیکـان، پەرلـەمانی فەرەنـسی، ئەنجومـەنی نەتـەوەیی سوێس، ئەرجەنتین، هۆڵەندا، سلۆڤاکیا، کەنەدا، پۆلۆنیا.

٢- جینۆسـایدی ئەرمەنـەکان لەلایـەن چـەند دەزگایـەکی نێودەوڵـەتیو هەرێمیشەوە دانپێدراوە وەك جینۆساید.

(دادگـای هەمیـشەیی گـەلان، نەتـەوە یـەکگرتووەکان، پەرلـەمانی ئـەوروپی، ئەنجومەنی ئەوروپا.

هاوکـات ئـەڵمانیا چارەسـەرنامەیەکی پێـشکەش کـردووە بەسـەرکۆنەکردنی کۆمـەڵکوژی ئەرمەنـەکان وەلا بـەبێی بـەکارهێنانی زاراوەی جینۆسـاید. هەنـدێ وڵاتی دیش ڕەتی ئەوەیان کردۆتـەوە کـە کۆمـەڵکوژی ئەرمەنـەکان بەجینۆسـاید ناوبەرن یان دانپێدابنێن لەوانـەش بریتانیـا، دەوڵـەتی ئیـسرائل، بـەڵام پیـاوانی پایـەبڵنگۆی ئـاینی جولەکـەکان کۆمـەڵکوژی ئەرمـەنیان بەجینۆسـاید ناوزەندکردووە.

پەراوێز:

١. لە ٢٠٠٨/٤/١٤ لەپەرلەمانی کوردستان بڕیاری ژ٣ ولەهەمان مێژووش پەرلەمانی عێراق بڕیاری ژ ٢٦ لەبارەی بەجینۆساید ناساندنی گەلی کورد دەرچواندووە.

٢. ئەم بابەتە لەنەورۆزی ٢٠١٢– ٢٧١٢ی کوردی نووسراوە.

سەرچاوەکان

١– مافی پێکهاتە نەتەوەیی‌و ئاینییەکان کوردستان خوێندن بەزمانی تورکمانی‌و سریانی‌و ئەرمەنی لەوەزارەتی پەروەردەی حکومەتی کوردستان، پارێزەر طارق جامباز. لەگۆڤاری K٢١ جووت ژمارەی (١٠–١١) بڵاوکراوەتەوەو دواتر لەشێوە کتێبێك بەزمانی تورکی لەتورکیا بەهەزاران دانەی لێ چاپو بڵاوکراوەتەوەو هەروەها کراوەتە زمانی عەرەبی‌و بەنیازیشین بکرێتە زمانی فارسی.

٢– بەراوردێك لەنێوان نیو ملیۆن ئەرمەنی لەفەرەنساو نیو ملیۆن کورد لەئەڵمانیادا، پارێزەر کارزان طارق جامباز. لەرۆژنامەی هزری یاسایی ژ ٢٠٠٧/٦ بڵاوکراوەتەوە.

٣– پرۆژەی دەستووری هەرێم کوردستان– عێراق، پەرلەمانی کوردستان– عێراق لە ٢٠٠٩/٩/٢٤ پەسەندی کرد، چەندین ماددەی بۆ مافی نەتەوەکان تەرخانکردووە.

٤– قۆناغەکانی نووسینەوەی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان– عێراق‌و مافی نەتەوەکان لەهەرێمی کوردستان– عێراق، پارێزەر/ طارق جامباز، لە گۆڤاری داد ژ(٢) ٢٠١٢ بڵاوکراوەتەوە.

# گەردەلوول و قەیرانی درامای کوردی

حەیدەر عەبدولڕەحمان

راستە کە ئامانجی بنەڕەتیم لەو هەڵسەنگاندنە ئەوەیە کە لە نێو ئەو هەموو بارانە رەخنە توندو تیژانەی شەقامی شارەکانی کوردستان ئاراستەی زنجیرە درامای گەردەلوولییان کرد، هەڵسەنگاندنێکی هێوری بابەتییانە بۆ ئەنجامە گشتییەکانی ئەو زنجیرەیە بکەین کە میدیای کوردی تا رادەیەك جۆرێك لە بێدەنگی نواند لە ئاستیدا،، یا روونتر بڵێین پەراوێز خرا، کە دیارە پەراوێز خستنیش چمکێکی روونە لە چمکەکانی رەخنە ، دەرهێنەر خۆشی وەك بە شەکانی رابووردوو پاش کۆتایی هاتنی ساردو سڕی زنجیرەکە هیچ کۆڕێکی تەلەفزیۆنی بۆ نەبەست و خۆی لە هەمبەر روو بە روو بوونەوەی بینەر حەشار دا، بەڵکو مەبەستیشمانە کە لە پێو دانگی ئەو زنجیرەیەدا کە دوا زنجیرەی نمایش کراوی کوردی بوو، لە لایەن یەکێك لە هونەرمەندە پێشەنگەکانی درامای کوردی کاری دەرهێنانی بۆ کرابوو، دەکرێ ئەو زنجیرەیە وەك نموونەیەك بۆ ئاستی درامای کوردی بخەینە ژێر تیشکی توێژینەوە و هەندێ ئەنجامی دروست لەو کەشو هەوا پڕ لە تەموو مژەی ئەمڕۆی درامای کوردی وەربگرین . .کە زۆر لە ئێمە پێشبینی نەگەتیفانەی بۆ دەکات .

درامای کوردی بە گشتی لە هەلو مەرجێکی نا سەقامگیردا دەژیت، تا ئێستاکەش هیچ لەو هەوڵو تەقەللایانەی لەو بەینەدا لە لایەن زۆر لە دەرهێنەرە

دراماکارەکانی ئێمە نراون بە ئاراستەی رزگار بوون لەو قەیرانەو گەڕانەوەی متمانە بۆ بینەری کورد، ئەنجامێکییان نەبووە، بەڵکو بینەری کوردییان زێتر دووچاری بێ ئومێدی کردووە، لەو بۆشاییەشدا بینەر لە ڕێگەی زنجیرە دۆبلاج کراوەکاندا بە دوای ئەلتەرناتیفدا دەگەڕێت . . کە دیارە ئەو ئەلتەرناتیفەش چ ئاکامێکی زیان بەخش بۆ بینەری کورد بە تایبەتی و بۆ هونەری درامای کوردی بە گشتی دروست دەکات .. بینەری کورد زۆر بە پەرۆشەوە لە چاوەڕوانی ئەو چەند زنجیرانە بووە کە لەو ماوەیەدا پێشکەش کران و بودجەی زەبەللاحییان بۆ تەرخان کرا، کەچی هیچ لەو ئەزموونانە نەیانتوانی تەنیا وێنەیەکی جوان لە خەیاڵی بینەردا بە جێ بیلێن یا شتێ لەو هاوکێشە نا سەقامگیرە بگۆڕن .

گەردەلوول لە هەمان هەلو مەرجی قاتو قڕی ئەواندا هەڵی کرد، ئەگەرچی بینەر ئومێدێکی زۆرتری بە گەردەلوول هەبوو، بە هۆی ئەو ئەزموونە دوورو درێژەی دەرهێنەر هەیبوو لە بواری دراماداو لە سێ زنجیرەدا و لە گەڵ دەیان لیدوانی دەرهێنەرو ئارامی بینەر تا کۆتایی زنجیرەکە، کەچی لە ئەنجامدا بینەری کورد دووچاری هەمان هەناسە ساردی بۆوە کە لە بەرهەمەکانی تردا روو بە رووی بۆوە ..بە گشتی ئەو چەند ئەزموونە درامییە ئەوەیان دەرخست کە کێشەی درامای کوردی، کێشەی پشتگیری کردن و پارە نیە، چونکە بودجەی زۆر لەوان ژمارەی کەم هاوتا بوونە لە مێژووی درامای کوردی دا، بەڵکو کێشە بنەڕەتییەکان کێشەی ئەزموونی لاوازی دەرهێنەرەکان و ون بوونی خواستی داهێنانە لای ئەوان.

## باگ راوندێکی دەرهێنەر

لە بەراییدا بەر لەوەی بخزێینە نێو گەردەلوول و هەر هەڵسەنگاندنێکی رەخنەییانەو بابەتیانەی لە دەرهەقدا ئەنجام بدەین دەبێ بزانین دەرهێنەر کێیەو چ ئەزموونێکی هەبووە لە بواری درامای کوردی و لەو تەمەنە هونەرییەی خۆشیدا لە کوێ دا شکستی هێناوەو لە کوێ دا سەرکەوتوو بووە، بۆ ئەوەی بتوانین یەکەم : ئاستی توانست و هونەری ئەو لە هەر بەرهەمێکدا دیاری بکەین، دووهەم بۆ ئەوەی بزانین لە بەر تیشکی ئەزموونەکانی رابووردووی دەرهێنەر چ زێدە کارییەکی کردووە لە رووی هونەری دراما دا، بۆیە دەبێ لە بەراییدا ئەوە بڵێین کە تەمەنی هونەریی جەلیل زەنگەنە زێتر لە نیو سەدە دەبێت، لەو تەمەنە هونەرییەدا جەلیل زەنگەنە بەرهەمێکی زۆری هەبووە و بە چوار شێوە کارە هونەرییەکانی ئەنجام داوە ، لە دەستپێکدا وەك نووسەرێك بۆ کاری رادیۆیی و کاری شانۆیی چەندین تێکستی نوسیووە ،بۆ یەکەم جار دەقی ( برسیەتی ) پاشان وەك ئەکتەرێك هاوشان لە گەڵ هونەرمەندانی شاری کەرکوك جیهاد دڵپاك، سەلمان فایەق، فازڵ جاف، عەلی کەریم کاری نواندنی کردووە و لە چەندین بەرهەمی درامیشدا لە شاری کەرکووك وەك ئەکتەر بەشدار بووە .

دواتریش جەلیل زەنگەنە لە هەرسێ باڵی شانۆو دراما و سینەما دا بەردەوام بوو . لەو کاروانە هونەرییەشدا چەندین بەرهەمی هەبووە، یا خود بەشداری تێدا کردووە، وەك دەرهێنەری سینەماو درامای تەلەفزیۆنی و شانۆیی ،لەوانە هاوارێکی تاساو، مانگی ئاوابوو، شیرین و فەرهاد درامای ژیان ، کەژاوەی مردن، نووسینی زنجیرە درامای ژاڵە لە دەرهێنانی ناسر حەسەن .

جەلیل زەنگەنە لە ناوەڕاستی نەوەدەکاندا رووی کردۆتە سینەماش و لەو بوارەدا دوو فیلمی سکرینی بە ئەنجام گەیاندووە، خولە پیزە و مامە ریشە .

## تێکست و سیناریۆ

لە بەر ئەوەی دراما پێکهاتەیەکی هونەریی هەمە رەنگە، هەمیشە پێویستی بەوە هەیە بە شێوەیەکی تەریبی بچێتە پێشەوە و بە یەك ریتم کار بکەن ، هەر یەکەو لەوانیش تایبەتمەندی خۆیانیان هەیە و پێداویستییان بە جۆرێك لە پسپۆری هەیە، لە رووی بەهای هونەریی و زەرورەت و بایەخەوە هیچیان لەوی تریان کەمتر نین . هەرکات یەکێك لەو پێکهاتانە لاواز بوون ئەوە ئەندامێکی زیندوو لە جەستەی درامادا ئیفلیج دەکەن .

سیناریۆو تێکست کە پێکهاتەیەکی بنەڕەتی درامایەو زەمینەیەکە بۆ دارشتنی تەواوی پێکهاتەکانی تر، لەوانەش ئامانجی دراماکە، دیالۆگ، روداو، گرێ، ململانێ، کەسایەتییەکان و چەندینی تر هەر هەموویان رەگو ریشەکانییان لە سەر دراما داکوتاوە، بۆیە هەر شلو شۆقییەك لە سیناریۆو تێکست دا هەبێت، ئەوە پێکهاتە هونەرییەکان دەکەونە ژێر هەڕەشەی داهێزران و روخان.

لە گەردەلوولدا هێلێکی درامی نیە کە سەربوردەیەك، چیرۆکێك، داستانێك بگێرێتەوە، بۆ ئەوەی بینەر لە پەنای رووداوەکانیدا بە چەند توخمێکەوە پەیوەست بێت، ئەو پەیوەست بوونەی نێوان توخمەکان و بینەر چەندین ئامانج دەپێکێنێ لەوانە : ململانێ ی درامی کە وا دەکات بینەر لە نێوان هەردوکییاندا ببێت بە بەشێك لە و توخمەو هەمیشە بە پەرۆشی گەیشتن بە ئاکامەکانی ئەو ململانێیەوە بێت، لە گەردەلوولدا ململانێ ی لاوەکی هەیە لە نێوان زوڵم و لە نێوان عەدالەتی دۆز، لە نێوان شەڕو لە نێوان خێر، لە نێوان ترسنۆکی و لە نێوان ئازایەتی بەڵام ئەو ململانێیانە ململانێیەکی درێژ خایەن نین لە دەستپێکی زنجیرەکەوە تا کۆتایی بەڵکو زوو دەپوکێنەوە و لە بار دەچن، بۆیەهەمیشە

بینەر وا هەست دەکات کە ململانێیکە ململانێیەکی تاک لایەنەیە کە ئەویش بریتیە لە زوڵم و ستەمکاری و سەرکوت کردنەوە بەرامبەر بە خۆ راگری .بۆیە هەست دەکەیت کە ریتمی ململانێکە لە سەر یەك تەوەر دەڕوا و لە شێوەشدا وەك یەکن . ئەو وەك یەکە لە دیمەنەکانی گوللە باران کردن، ئەشکەنجەو ئازار دان لە زیندانەکاندا، ئەوەندە خۆیان دووبارە کردۆتەوە لە هەر سی بەشدا وای لێهاتووە دیمەنەکان بسوێن و نەتوانن توخمێکی وروژاندن لای بینەر دروست بکەن . بەڵکو بینەر ئەوەندە دیمەنەکانی لە بەرچاو تێپەڕیووە، وای لێهاتووە کە وەك دیمەنیکی دروست کراو رووداوەکان ببینی و نەکەوێتە ژێر هیچ تەوژمێکی دەروونیی .

جەلیل زەنگەنە لەو کۆکتیلە رووداوە لە یەك چوانەی دروستی کردوون تەنها پشتی بە وێنە بەستووە، وێنەش کاتێك دەتوانێت کاریگەری خۆی بە سەر درامادا بسەپێنی کە بۆ خزمەتی بیرۆکەیەك یا ئامانجیك تەوزیف کرا، بۆیە چەند ئەوەندەی وێنە و ئامرازە تەکنیکییەکانی وێنە روون و بە هێزو ورد بن ، ئەگەر لە نێو پرۆسەیەکی فیکری دا بەرجەستە نەبوون، ئەوە وێنە وەزیفەکانی خۆی لە دەست دەدات، نەك هەر وێنە بگرە هەموو کەرەستەکانی تری هونەری و جبەخانە سەربازی و چەك و تەقەمەنییەکانیش هەموو لە بار دەچن . وەك ئەوانەی جەلیل زەنگەنە لە باری بردوون .

دووهەمییان : توخمی وروژاندن هەمیشە لە گەشەسەندن و بەرەو پێشڤچوونی ململانێکانەوە دروست دەبێت، هەر لاوازی ئەو توخمەی ململانێیە وای کردووە کە چێژ لای بینەر ون بێت لە رووی رووداوەکان، کاریگەر بوون بە

کەسایەتییەکان و زۆری تر . ون بوونی گرێ لە سیناریۆدا کرۆکی بنەڕەتی لە دەست دانی چێژە لای بینەر

رەنگە جۆرێك لە جیاوازی هەبێت لە نێوان هەر سێ بەش لە رووی ئەو توخمە درامیانەوە بە تایبەت لە بەشی یەکەمدا سیناریۆ نووس هەوڵی ئەوەی داوە کورتە چیرۆك لە ناو دیمەنەکاندا دروست بکات، بەلأم دواتر لە هەردوو بەشی دوو و سێ دا ئەو چیرۆکە درامایانە بەرەو لاواز بوون دەچن .

جەلیل زەنگەنە لەو سێ بەشەدا دووچاری جۆرێك لە نەرگزییەت هاتووە کاتێ ویستوویەتی زۆرینەی ئەرکە هونەرییەکانی وەك نووسین، سیناریۆ، دەرهێنان، نواندن بە خۆی ببەخشێ و قورساییەك لە خۆی بار بکات، کە لە ژێریدا بینەر هەست بە ماندوو بوونی جەلیل و بە ماندوو بوونی خۆشی بکات، بەر لە هەموو شتێك ئەو پانتاییە جوگرافی و مێژوویی‌ەی بۆ رووداوەکانی زنجیرەکەی نەخشە کێشاوە،کە گوایە هەر هەموو کوردستانی باشوور بگرێتەوە، بەمەش کۆنترۆڵی دەسەلأتی هونەری خۆی لە دەست داوە و دووچاری جۆرێك لە سەرەوژێر بوونی هاوکێشە مێژووییەکان بۆتەوە، لە بەر ئەو هۆیانە :

١.ئەو بۆ نووسینەوەی رووداوی هەموو ناوچەکان پشتی بە شارەزایی خۆی بەستووە، کە بە پیی هەموو لۆژیکێك ئەو شارەزایی لە رووداوەکانی هەموو ئەو ناوچانە نەبووە کە کەوتونەتە سنووری دراماکەی ئەو، بۆیە جەلیل ئەگەر بڕیاری ئەو پەلو پۆ هاوێشتنەی دابوو، دەبوا زێتر بە نێو روداو کەسایەتی و سەربوردە قارەمانیەتییەکانی ئەو ناوچانە داچووبایەوە، یاخود ئەگەر خۆی دەسەلأتی بە سەر ئەو رووبەرە بەر فرەوانە نەدەشکا ئەوە دەیتوانی پشت بە کەسانێکی پسپۆر ببەستێ بۆ نووسینەوەی سیناریۆکە .

٢.دەرهێنەر نەیتوانییووە هاوسەنگی لە نێوان ئەو ناوچانەدا دروست بکات و موجامەلەی بۆ هەندێ ناوچە کردووە، غەدری لە هەندێکی دیکەیان کردووە لە سەر حیسابی کۆمەڵێ بەرژەوەندی تایبەتی و سیاسی و ناوچەگەری .

٣. لە بەشی یەکەم و دووەمدا و لە ژێر فشاری ئەو بارانە رەخنانەی هەبوون، جەلیل دانی بە نا هاوسەنگی ناوچەکان نا، بەڵام بەڵێنی ئەوەی بە بینەردا کە لە ئەلقەکانی دوایی بەشی سێیەم ئەو نا هاوسەنگیە راست دەبێتەوەو داوای ئارامی لە بینەر کرد . کەچی بەشی سێیەمیش تەواو بوو کەچی جەلیل نەیتوانی ئەو بۆشاییە گەورەیە لە زنجیرەکەیدا پڕ کاتەوە، لە کۆتاییدا زنجیرەکە دووچاری ئیفلیج بوون هات .

٤. دەرهێنەر نەیتوانی ئەمانەتی هونەری وەك هونەرمەندێکی نەتەوەیی بپارێزێ، بەڵکو ئەو هەقیقەتەی بینەر بە چاوی خۆی بینی لە جیاواز پیکردنی ناوچەکان بەرهەمەکەی خستە نێو بازنەیەکی تەسکی حزبایەتی و ناوچەگەرییەتی ئەوتۆ، کە زۆر لە بینەرانی خۆی لە دەست بدات، لە هەمان کاتدا بینەر لەوە دڵنیابوو کە جەلیل کەوتۆتە ژێر فشارێکی سیاسی و بەرهەمەکەشی کردۆتە کارت بۆ لێدانی هەندێ ناوچە و بزر کردنی خەبات و بەرخودانیان لەو زەمەنە دیاری کراوەدا .

٥. دەرهێنەر دەیتوانی زۆر بە شێوەیەکی ئاسایی سنووری زنجیرە دراماکەی خۆی دیاری بکات، ئەو کات ئەو هاوسەنگیەی لە دەست دەرنەدەچوو، لە هەمان کاتیشدا دەسەڵاتی هونەریشی بەهیز تر دەبوو بەڵام خوێندنەوەی بینەر بۆ ئەو پەرش و بڵاویە ئەوەیە کە وەك نەخشەیەك جەلیل مەبەستێکی دیاری کراوی هەبووە بۆ ئەو پەلو پۆ هاوێژیە، کە هەرگیز نەلە قازانجی بەرهەمەکەو نە لە قازانجی دەرهێنەرو نە لە قازانجی بەرژەوەندی گشتیش دابووە .

## ون بوونی پاڵەوان

لە بەر ئەوەی لە هەر سێ بەشدا هێڵی درامی نیە و زنجیرەکە هزرێکی دیاری کراو بە خۆیەوە هەڵناگرێت بۆیە پاڵەوانە سەرەکییەکان لە زنجیرەکەدا ونن، دەرهێنەر نەیتوانییووە کەسایەتی بۆ کاراکتەرەکانی خۆی دروست بکات، بەڵکو هەموویانی لاوازو پەرپووت نیشان داوە، ئەو دەیتوانی کەسایەتییەکانی وەك دلشاد، هەڵۆ، مامۆستا جەلال، یا هەر کاراکتەرێکی دیکە زێتر گەشە پێبدا بۆ ئەوەی بیکات بە تەوەری سەرەکی لە نێو پاڵەوانەکاندا، هەر بۆ نموونە وەرن ببینن چۆن مستەفا عەقاد کەسایەتی بەهێز بۆ عومەر موختار دروست دەکات و چ شکۆمەندییەك بە باڵای دەبڕێ، ئەو عومەر موختاری وەك جەنگاوەرێکی بە هێزو پاڵەوانێکی خەیاڵی نیشان نەداوە، بەڵکو کەسایەتییەکی بە هێزی بۆ دروست کردووە وەك پیاوێکی شۆڕشگێڕ لە فیکرو خاوەن بیرو باوەر لە ئاین و نیشتمان، لە رێگەی ترس و خرۆشی ئەو جەنەراڵانەی لێی دەترسن و ئەوانەی شەرمی لێ دەکەن بەرامبەری بوەستن و ئەوانەی چۆك دەدەن و سڵاوی سەربازی لێ دەکەن عومەر موختاری گەورە کردووە، دواتریش گەورەتری دەکات کاتێ بەزەردەخەنەیەك بە رووی ئەوەی نوێ کە هەڵگری پەیامی عومەر موختارن بەرەو پیری قەنارە دەچیت، من ناتوانم بەراورد لە نێوان ئەو دوو دەرهێنەرە بکەم، بەڵام مەبەستم لە دروست کردنی کەسایەتی و دروست کردنی پالەوانە لە گەردەلوول، کە تا ئێستاش بینەرانی نازانن کێ پاڵەوان بوو ؟ رەنگە جەلیل بڵێ خەڵك پاڵەوان بوو، پێشمەرگە پاڵەوان بوو، بەڵام ئەگەر پیشمەرگە ئەوەبێ کە لە زنجیرەکە بیندرا کاری تەنها شایی کردن بێت بە دوا شەدەو مۆدیلی جلو بەرگ و سەرو سمێڵ بۆیاغ کراوی و گۆرانی گوتن و پلاو خواردن، ئەو قەت ئەو هەموو شۆڕشە دروست نەدەبوو، قەتیش ئەو ئازادییە نەدەهاتە کایەوە کە ئێستا تێیدا

دەژین پێ دەچێت جەلیل ئەو ئاشنایەتیەی نەبووە لە ژیانی پێشمەرگە و نەیتوانیبێ لە ناو ژیانی پڕ لە چیرۆك و داستانی پێشمەرگەدا دراما دروست کات و پێشمەرگەمان وەك کەسێکی خۆ راگرو گیان فیدا کار نیشان بدات ..راستە لە هەندێ دیمەندا شەڕی چەکداری هەیە، رزگار محەمەد توانستێکی چاکی نیشان داوە لە رووی بە کارهێنانی تەقەمەنییەوە، بەڵام شەڕەکان تەنها بە ئامانجی نمایش کردنە نەك تەوزیف کردن لە بەرگێکی درامیدا .. بینەر ئاواتی ئەوەی دەخواست شەڕەکان هەر تەنها بۆ نمایش کردنێکی هونەری نەبن بەڵکو بە شێوەیەکی درامی بۆ بە دەست هێنانی ئامانجێك بونایە .

جەلیل زەنگەنە زیتر لەوەندە خۆی خستۆتە نێو تۆڕی بەرپرسیاریەتی کاتێ کۆمەڵێ کەسایەتی ناسراوی کوردی، لە بواری سیاسەت و هونەرو ئەدەب و رۆشنبیریی بە زۆر ئاخنیوەتە ناو بەرهەمەکەی، چەشنی سەیدا سالح یوسفی، عەلی هەژار و هێمن موکریانی، شەمال سائیب، کاردۆ گەلالی، محەمەد جەزا و هەندێکی تر، کە تییدا نەك هەر لە ئەنجامی پەلە پروزێ کردن و ناشارەزایی لە سەر ژیانیان و چرنۆك لێگرتنیان غەدرێکی زۆری لە کەسایەتی ئەوان کردووە، بەڵکو بەداخەوە دەڵێم کە لە بری ئەوەی رێزیان لێ بنێت و گەورەیان کات، بەڵکو سوکایەتی پێ کردوون، هەر یەکێ لەو کەسایەتیانە لەوە گەورەترن کە زنجیرە درامییەکیان بۆ بکرێت و سالانێك ئامادە باشییان بۆ بکرێت، ئینجا کاریکی درامییان بۆ ئەنجام بدرێت، ئەو سەرپێیی و چرنۆك گرتنە هەر تەنها لەو کەسایەتیە گەورانەی کورد نیە، بەڵکو لە هەموو پێکهاتەکانی دیکەی دراماکەدا دیارە، من هەرگیز ناتوانم وەلامی ئەو پرسیارە بدەمەوە کە بۆچی جەلیل زەنگەنە دوای ئەو تەمەنە دوورو درێژە ئاوا بە دەستی خۆی هونەری خۆی سووك و رەزیل دەکات، کە پێم وایە جەلیل ئەگەر لە لایەن هەندێکەوە دەستی

بۆ خرابێتە سەر شانی ئەوە گەورەتر لەوەی لە دەست دا، کە ئەویش متمانەی بینەرەکانییەتی کە ئەو لەو تەمەنە دوورو درێژە هونەرییەی خۆیدا زۆر بە سەختی و زەحمەتی دروستی کردن . رەنگە بۆ جەلیل ئاستەم بێت دوای ئەو شکستە گەورەیە و بەو تەمەنەی ئێستای جاریکی دیکە ئەو هەلە برەخسێتەوە ئەو متمانە بگێرێتەوە .

لە دەستپێکدا دەرهێنەر نەخشەی بۆ ئەوە نەکێشابوو کە زنجیرەکە سێ بەش بێت بەلأم لێکەوتنەوەی گەلێك بۆشایی گەورەو سرنج و رەخنەی زۆرێك لە خەڵکی پاڵی بە جەلیل زەنگەوە نا بۆ ئەوەی بەشەکانی تریش بکاتەوە، بەشی یەکەمی زنجیرەکەی کە ٢٥ ئەلقە بوو وەك دەرهێنەر لە لێدوانێکیدا بۆ رۆژنامەی شەرقل ئەوسەت داویەتی دەڵێت ئەو بەشە باس لە رووداوەکانی کۆتایی ساڵانی ١٩٧٦ دەکات، بەشی دووهەمیشی کە ٢٥ ئەلقەیە رووداوەکانی دوای ساڵانی ١٩٧٧تا کۆتاییەکانی ١٩٧٨ دەگرێتەوە ، دواتریش بەشی سێەم دەگرێتەوە ، کە ٦٠ ئەلقە لە ئامێز دەگرێت .

بێگومان هەر یەك لە بەشەکانی گەردەلوول ئاستێکی دیاری کراویان هەبووە، کە رەنگە بینەر بە گەڕانەوەیەکی سەرپێیی بۆ هەر سێ ئەو بەشانە دەتوانێ بە ئاسانی ئەنجامەکانی دەستگیر بێت، هەر بۆ نموونەش لە بەشی یەکەمدا دەرهێنەر جەلیل زەنگەنە بە شێوەیەکی باشتر خۆی بۆ پرۆسە هونەرییەکە ئامادە کردو بەشێکی زۆر باشیش لە هونەرمەندانی شاری سلێمانی بەشدارییان تێدا کرد، ئەو بەشە لەو هەلو مەجەی تێیدا نمایش کرا، لە شێوەو ناوەرۆکدا هەنگاوێکی نوێ بوو لە درامای کوردی دا، بە تایبەت لە روی وێنە گرتن و مۆنتاژو موزیك و لە رووی نواندن و هونەری تەقەمەنی و ئارایشت و هونەرەکانی تر . ویڕای هەندێ گرفت و کەموو کوڕی کە لە هەر بەرهەمێکی تردا

بەدی دەکرێت . بە تایبەت لە رووی بەجێ هێشتنی هەندێ بۆشایی . ئەو سەرنج و تێروانینای لەو بەشە دا هەبوون هانی دەرهێنەرییان دا کە پەنا بۆ بەشی دووهەم بەرێت . لە بەشی دووهەمدا جەلیل نەیتوانی هاوسەنگی خۆی وەك پێویست بپارێزێت و دووچاری ئاستەنگیکی هونەری بۆوە، ئەوەبوو هەندێ لە ئەکتەرەکان بە هۆی ئەو ئەزموونەی لە بەشی یەکەمدا لە گەڵ دەرهێنەر بە دەستییان هێنابوو پاشەکشەیان لە بەرهەمەکەدا کردو بڕیاریاندا لە بەشی دووهەمدا بە شداری نەکەن، بۆیە دەرهێنەر ناچاری ئەوەبوو ئەلتەرناتیفی لاوازییان بۆ بدۆزێتەوە .لەو بەشەدا دەرهێنەر روو بە رووی رەخنەیەکی زۆری سەر شەقام بۆوە، کە دەرهێنەر لە هەمبەرییاندا پاساوێکی ئەوتۆی نەبوو بۆ خۆ دەرباز کردن لێیان تەنها ئەوەندە نەبێت بەڵێن بە بینەر بدات کە ئەو کەموو کورییانەی هەن لە بەشی سێیەمدا چارەسەر دەکرێن .. لە بەشی سێیەمدا دەرهێنەر بەوهیوایە بڕیاری دا کە ئەو بەشە بکات بە ٦٠ ئەلقە بۆ ئەوەی لە رووی جوگرافی و مێژووەوە سەراپای کوردستان لە ئامێز بگرێت، لە هەمان کاتیشدا بەو ژمارەیە پشتگیرییەکی باشی دارایی بەرکەوێت . بەڵام بە هۆی نەبوونی کاتی پێویست و خۆ ئامادە نەکردنی و ئەو گرفتانەی هاتنە پێشەوە، بە تایبەت بە هۆی تێکچوونی باری تەندروستی دەرهێنەرو هاتنە پێشەوەی هەندێ کۆسپ و تەگەرەی دارایی و دەرهێنەر ناچاری ئەوە بوو بە هەموو کەم و کورییەکانەوە بەرهەمەکە بە ئەنجام بگەیەنێت، هەر ئەو پەلە پروزێ و خۆ ئامادە نەکردنە بوو وای کرد کە پەخشی ئەو بەشە بۆ ماوەیەك لە کەناڵی کورد سات بوەستێت ، گوایە وەك دەرهێنەر رای گەیاندبوو بە هۆی دروست بوونی هەڵەی هونەری بووە لە رووی مۆنتاژەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە بەشی سێیەمدا دەرهێنەر نەیتوانییوە وەك پێویست چاودێری مۆنتاژی بەرهەمەکە

بکات و دووچاری جۆرێك لە سەر لێ شێوان بووە بە تایبەت لە رووی مێژووی رووداوەکان .

دروست بوونی ئەو هەموو کەمو کورِیانە لە بەشی سێیەمدا دەنگی نارەزایی بینەری لە هەموو کوردستاندا بەرز کردەوە و میدیاکان داوای راگرتنی زنجیرەکەیان دەکرد، بەڵام بۆ ئەوەی زنجیرەکە نەرِوخێت کە لە» بەرژەوەندی هەندێ کەس و لایەن نەبوو، جارێکی دیکە پەخشی ئەو بەشە بە خۆی و هەموو گرفتە جۆراو جۆرەکانی بەردەوام بوو تا کۆتایی .بەڵام بەردەوام بوونەکە نەیتوانی پشتی شکاوی زنجیرەکە راست کاتەوەو چاوەرِوانی بینەر تا دوا چرکە بۆ ئەو خواستانەی لە زنجیرەکەی دەویست هەر بەبێ هودەیی مایەوە .

## ستایل

بمانەوێت و نەمانەوێت جەلیل زەنگەنە یەکێکە لە پێشەنگەکانی درامای کوردی، شوێن پەنجەو مۆرکی جەلیلیش لە مێژووی درامای کوردی دا دیارە، ئەگەرچی جەلیل دەرهێنەرێکی ئەکادیمی و پسپۆر نەبووە لە بواری هونەریی درامادا و هونەرمەندێك بووە هەمیشە بە پێی زەمەن و هەلو مەرجی پێویست کاری جۆراو جۆری هونەریی ئەنجام داوە، ئەو لە رێگەی ئەزموونی هونەریی خۆیەوە توانییوویەتی ببێتە هونەرمەندێکی دەست رەنگین، لە پاڵ ئەوەی کە خەیاڵ و توانستێکی تۆکمەی هەیە لە بواری هونەری درامادا، وێرِای هەموو ئەوانەش جەلیل توانییوویەتی لە گۆرِەپانەکە دانەبرِێت و لە زەمەن تەنگەتاوەکانیشدا حزوری هەبێت، بۆشایی گۆرِەپانەکەو قەیرانی دەرهینەری پسپۆری درامیش وای کردووە، هێندەی دیکە، جەلیل بێنێتە پێشەوە.

ئەوەی جەلیل زەنگەنە لە گەڵ دەرهێنەرە دراما کارەکانی دیکە جودا بکاتەوە ئەوەیە کە جەلیل توانییویەتی ستایلێکی تایبەت بە خۆی دروست بکات ، کە تێیدا بە پلەی یەکەم پشت بە وێنەو گرتەی پڕ لە گوزارشت دەبەستێت، ریتمێکی خێرای هەیە، کە بوار بۆ بینەر نارەخسێنێ دووچاری خاوبوونەوە بێت، ئەمە وای کردووە کە هەندێ لە دەرهێنەرانی ئێمە لەوانەش ناسر حەسەن – لە کەرکوک ٤و و دەرهێنەر نەجم هۆگر – لە رابووندا هەوڵیان دەدا لاسایی ستایلەکەی جەلیل زەنگەنە بکەنەوە، بەڵام لە ئەنجامی ئەو لاسایی کردنەوەیەدا ناسر حەسەن لە زنجیرە درامای کەرکووک ٤ باجێکی گەورەی دا .

## وێنە گرتن

کرۆکی بنەڕەتی ئەو سیما جوانەی بە گەردەلوولەوە دیارە وێنە گرتنە کە هەندێ جار دەبێتە فاکتەری سەرەکی بۆ سەرکەوتنی بەرهەمێك، وێنەگر سالار عەبدوڵلا نەك هەر تەنها روو بە رووی گەلیك ئاستەنگ و هەڵویستی سەخت و دژوار بۆتەوە بۆ تۆمار کردنی زنجیرە دراماییێکی دوورو درێژ، بەڵکو لەوە گرنگتر ئەوەیە کە توانییوویەتی لەو تاقیکردنەوە سەختەدا ئاستی توانست و داهێنانی خۆی رابگرێت، بینەر لە هەڵبژاردنی گرتەی جوان و بزووتنەوەی کامێرادا هەست بەوە دەکات کە کامیرا دەسەلاتێکی زۆری گوزارشت کردنی هەیە بۆ بەرجەستە کردنی دیمەنەکان، کە رەنگە هێزو دەسەڵاتی کامێرا لەو گوزارشت کردنەدا لە هێزی دیالۆگ بەهێز تر بێت، بۆیە کامێرا لە هەندێ دیمەندا وامان لێ دەکات کە پیویستیمان بە قسە نەبێت، بۆیە وای دەبینم کە وێنەگر لە چوارچیوەی ئەرکی هونەری خۆی بە بالآیێکی بەرزەوە دەبینم بە دەر لە پێکهاتەکانی تر .

جەلیل زەنگەنە پتر ئارەزووی چوونە دەرەوەی کامێرا دەکات لە نێو چوار دیواردا، لە سەرەتاکانی دەست پێکردنیشی لە گەڵ سەلمان فایەق بۆ یەکەمجار لە مێژووی درامای کوردی دا لە مەرەزە کامێرایان بردە دەرەوەی ستۆدیۆ . یەکێك لە ستایلەکانی کار کردنی ئەوەیە کە زۆر بایەخ بە شوێن و کات دەدات . بێ ئەوەی هەندێ هەلو مەرجی سەخت و دژوار لە بەرچاو بگرێت بۆ کاری هونەری . بۆیە بینەر درکی بە ماندوو بوونی جەلیل کردووە لە گواستنەوەی بەردەوامی شوێنی وێنە گرتن و هەلسوو کەوت کردنی لە گەڵ کات لە نێوان شەوو رۆژو وەرزی وێنە گرتندا جەلیل هەر تەنها دەرهێنەرێکی خاوەن ئەزموون نیە، بەڵکو پێش ئەوە سیناریۆ نووسێکە کە توانییوویەتی لە هونەرەکەی خۆیدا فانتازیاو وشەو وێنە بە یەکەوە لە هونەرێکا کۆ کاتەوە، هەرسێ ئەو هونەرەش بۆ دەرهێنەری درامی سێ توخمی بنەڕەت و کاریگەرن لە پێکهاتەی دراماداا . رەنگە کۆبوونەوەی ئەو سێ توخمە لای جەلیل وای کردبێت کە ببێتە یاریدە دەرێکی بە هێز بۆ وێنە گرو فاکتەرێکیش بۆ ئەوەی ئەزموونی جەلیل لە درامادا قوڵ بێتەوە .

## مۆنتاژ

کاری مۆنتاژ لە هەر سێ بەشەکەدا ئاستێکی رێژەییان هەیە، بە گشتی لە بەشی یەکەمدا ورد تر هەلسوو کەوت لە گەڵ هاوسەنگ بوونی دیمەنەکان کراوە، هەوڵ دراوە پارێزگاری لە ریتمی وینە و دیمەنەکاندا بکرێت، بە تایبەت لە رووی رادەست کردنی رووداوەکان لەو دیمەنانەی کە دەتوانن چێژ لای بینەر بە جێ بیێڵن دەرهێنەر لە سێ تەوەردا مۆنتاژی کارەکەی خۆی کردووە، بەشی یەکەمیان رێکخستنەکانی ناوخۆیە کە قورساییەکی زۆری خراوەتە سەر بە

تایبەت لە زانکۆو گرتوو خانەکاندا، دوو هەمیان: چوونە ناو کۆمەڵگایە کە چینی گشتی گەل دەگەیەنن لە رێگەی دەرخستنی باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری خێزانی کورد، سێیەمیان چوونە ناو شۆڕش ودێهاتەکان و ژیانی پیشمەرگەیە .

جەلیل بە شێوازی رۆمانسیانە کاریگەرە بە تایبەت لە کەشو هەوای زانکۆو لە نێو کۆمەڵگادا، لە بەرەکانی شەڕیشدا ئەکشن بەکاردینێ بە پێی پێویستی دیمەنەکان، بۆ ئەو رووداوانەی لە ناوەوەن حەز بە دەرخستنی دیمەنە شارستانییەکان دەکات بەتایبەت بەرجەستە کردنی کەشو هەوای سروشتی زانکۆو پرسی قوتابی و خوێندکار کە ئەو لە هەر سێ بەشدا گەڕاوەتەوە سەریان .

بەو مەبەستەی یەکێك لە بنەماکانی دروست بوونی شۆڕش نەوەی نوێیە کە چینی زانکۆ بنچینەکەیەتی لە رێکخستنەکانی ناو شاردا، هەروەها نیشاندانی هوشیاریی کۆمەڵگا بەرجەستە دەکەن، هەوڵ دەدات هەندێ جار لەو نێوەندەدا پرسە نەتەوەیی و خۆشەویستییەکان ئاوێتەی یەکتر بکات، بەڵام لەو بوارەدا هەناسەی کورتە و دەسەلاتی ئەوەی نابێت، لە سۆنگەی خۆشەویستییەوە هزری نیشتمانی و نەتەوەیی بە زمانی دراما بەرجەستە بکات، بەڵکو پەیوەندییەکان بە شێوەیەکی روو کەشی و نیوە چڵی بە جێ دێڵێ . یا وا دەکات خۆشەویستی ئەو چمکە مرۆییە پیرۆزو نەمرە نەبەخشێت، کە پێویستە لە درامادا لە خۆی جوانتر بکرێت و وەزیفەی خۆشەویستیش گەورەتر بکرێت .

## ئەکتەرەکانی گەردەلوول

جەلیل زەنگەنە یەکێکە لەو دەرهێنەرانەی کە توانای دروست کردنی ئەکتەری هەیە، ئەو ئەکتەرە تازانەش کە بۆ یەکەم جار وەك روخساری نوێ لە

بەرهەمەکانی ئەو دا بەشدار بوونە زۆریان بوونەتە خاوەن ناوداریەتێکی زۆر لە کوردستاندا، لە چەشنی شوان عەتوف، بەیان عوسمان، دێرین عومەر، رێبوار هەورامی،کوێستان خوسرەوی، پشتیوان نوری، هەندێ ئەکتەریش بە هۆی بەشداری بوونییان لە گەردەلوولدا توانییان توانستی خۆیان زێتر دەربخەن و لە چەشنی موەفەق عارف، سەلام فەرەج، هادی ئەحمەد، حسێن زارین.. بەلام ئەکتەرانی وەك جیهاد دلپاك و عەلی کەریم دەکرا زێتر دەرفەتییان بۆ بڕەخسێ، چونکە توانستی ئەوان لەوەندە زێترە کە بینیمان و ئەوان لە بەرهەمەکانی پێشتر بە شێوەیەکی بالاتر دەرکەوتن بە تایبەت لە زنجیرە درامای ژاڵە . بۆیە پێم وایە گەردەلوول بۆ ئەو دوو ئەکتەرە شتێکی زێتری نەخستە سەر بەرهەمەکانی پێشوویان . .

ئەو دەرفەتە زێتر بۆ حەمە عەلی خان و عەبدولی حەمە جوان زێتر رەخسا بۆ ئەوەی لەو کەسایەتیانەی پێیان سپێردرابوو هەندێ نوێکاری جوان بەرجەستە بکەن.

ئەکتەرە کۆمێدییەکانی گەردەلوول هەناسەیەکیان بە گەردەلوول بەخشیبوو، بە تایبەت هادی ئەحمەد کە لە پەنای گەردەلوولەوە وەك ئەکتەریکی بە توانا بوونی خۆی سەلماند.

لە هەڵبژاردنی ئەکتەرە ئافرەتەکان جەلیل زەنگەنە بایەخێکی تایبەتی داوە بە روخسار، بە شێوەیەك کە لە هەندێ حالەتدا روخساری لە توانستی هونەری بە گرنگتر زانیووە، ئەو روخسارانە گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە لە درامادا، وەك ئەو تەکنیکە لە دراما کۆرییەکان و ئوسترالی و ئەرجەنتینی و ئێرانییەکانیشدا باوەو روخساری جوان زۆر جاران شوێنی کاریگەری خۆی بە سەر راکێشانی بینەردا بە جێ دێڵێ .

# ئایا مێژوو زانستە؟

نوسینی : ئارام مەجید عەلی

ناسینی مێژوو وەك زانستێك لەگەڵ بوونی مرۆڤایەتیدا هەیەو تائێستاش هەر لەگەڵیەتی و بگرە تا دوا ڕۆژیش بەردەوامە لەگەڵی، وەگفتو گۆ و بۆچوونێکی زۆر دێتە ئاراوە کاتێك سنوورێکی زانستی بۆ پێناسەی مێژوو دادەنرێت،تەنانەت بەئامانج گەیشتن لەم بابەتەدا هەروا کارێکی ئاسان نیە و پێوستی بەتوەژینەوەیەکی ورد و زانستی مێژووی هەیە،چونکە هەندێك بەزانستی زانستەکان ناوی دەبەن و هەندێکی دیکە بەدایکی زانستەکانی دیکە ناوی دەبەن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پرسیارە چەندین وەڵامی جۆراو جۆر و لێك جودای هەیە، تەنانەت ئەوانەشی لەزانست بوونی مێژوو دەکۆڵنەوە بۆ ئەوەی بزانن تاچەند ئەم مەسەلەیە بابەتیە هێشتا هەر لەسەر پرسیاری بێوچان بەردەوامن و دەپرسن:ئایا هاوشێوەی لەشێوازەکاندا ڕێ دەدات لەنێوان مێژوو سەرانسەری زانستەکاندا مێژوو بەزانست دابنرێت؟ ئایا مێژوو تاچەند لەبواری زانست نزیك بووەتەوە یان دوور کەوتوەتەوە؟بۆ چوونە نێو باسەکەوە چەندین برسیاری جۆراو جۆر خۆی قیت دەکاتەوە وەك: ئایا مێژوو زانستە؟ ئەگەر مێژوو زانستە بنەماوپێکهاتەکانی مێژوو چیە؟ئایا مێژوو وەك زانستەکانی کیمیاوبیرکاری و فیزیا و زانستە ئەزموونیەکانی دیکە زانستە؟ئایا مێژوو تەنها تۆمارکردنی ڕووداوەکانی ڕابردووە؟ئایامێژوو هونەرە یان ئەدەبە یان هەواڵەیان چیرۆکە؟ئایا

مێژوو ڕێساو یاسای زانستی هەیە؟ئایا مێژوو زانستێکی سەربەخۆیە یان لقێکی زانستەکانی دیکەیە؟ئایا مێژوو هاوشێوەی زانستەکانی ترە؟ئایا دەتونرێت پێگەیەك بۆ مێژوو دانرێت لەنێو زانستەکانی تردا؟ ئەم پرسیارانەو چەندینی تر بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی مێشکی بیرمەندان و فەیلەسوفان و تەنانەت نوسەران و مێژوونوسان و لێکۆڵەرەوانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە، وەڵامی ئەم پرسیارانەش بەلای هەر یەکەیانەوە جیاوازی هەیە و تەنانەت هەندێکیان سوکایەتی بەمێژوو دەکەن و لەقاڵبی نەك زانستی بەڵکو مێژوویش دەری دەکەن بەقسەی پڕوپوچ ناوی دەبەن و هەندێکی دیکە ناواقیعی ناوی دەبەن، بۆ وەڵامدانەوەی تەواوی ئەم برسیارەی سەرەوەمان کە ئایا مێژوو زانستە؟ سەرەتا واباشترەپێناسەیەکی کورتی هەردوو چەمکی زانست و مێژوو بکەین و دواتر زانستی بوون یان نازانستی بوونی مێژوو بخەینە بەر نەشتەری بیرمەندان و توێژەرەوانی ئەم بوارەوە.

سەرەتا لەزانستەوە دەست پێ دەکەین،زۆرێك لەلێکۆڵەرەوان زانستیان بەپلەیەك کورت کردوەتەوە بەسەر زانستە سروشتیەکان و زانستە ڕێکوپێکەکان،بەوەی کەبریتیە لە(کۆمەڵێك ڕاستی و دیاردەی ڕێکخراوی لەیەك چوو لەسەر دەزگایەکی گشتی یان یاساو ڕێسایەکی گشتی کەبەهۆیەوە بتوانرێت پێشبینی دەربارەی ڕووداوەکان یان دیاردە لەیەك چووەکان بکرێت لەباروودۆخە لەیەك چووە ناسراوەکاندا لەسەر ئەو یاسایانەوە) ئەگەر بەم شێوەیە چەمکی زانست کورت بکەینەوە ئەوا ناتوانین مێژووی تێدا جێگە بکەینەوە و بەزانستی دابنێین، بەلام هەندێك لێکۆڵەر زانستیان بەپێناسەیەکی فراوانتر ناساندوە بەوەی کە( کۆمەڵێك ڕاستی ڕێکوپێك کەدەتوانرێ بەهۆی پرۆگرامێکی تایبەتەوە

لەگەڕان و پشکنین و تێبینی کردن بگەین بە دەرهێنانی چەند ڕێسایەك کەبڕیار دەدات بەسەر ئەو شتەی کە لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە.

لەفەرهەنگی ئۆکسفۆرد بەم شێوەیە پێناسەی زانست دەکات و دەڵێت: ئەو لقەی لێکۆڵینەوەیە کەپێوەندی بەقاڵبێکی یەکگرتووی حەقیقەتە نەگۆڕە جۆربەجۆرەکانەوە هەیە و قانونی گشتی حوکمی دەکات ڕێگەو بەرنامەی بڕواپێکراوی تێدایە بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتە تازەکان لەچوار چێوەی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا.لەلایەکی دیکەش لۆرد ئەکتن بەم شێوەیە پێناسەی زانست دەکات و دەڵێت: زانست بریتیە لە کۆبوونەوەی کۆمەڵێ گەورە ڕووداوی هاوشێوە، لەم کۆبونەوەیەدا یەکەیەکی گشتی بەشێوەی پرەنسیپ یا بەشێوەی قانون پەیدا دەبێت، کەبەهۆیەوە دەتوانین لەهەلومەرجێکی دیاری کراودا پێشبینی ڕووداوی هاوشێوەی ئەو ڕووداوانەی پێ بکەین، بێگومان ئەگەر هەر مەعریفەیەك ئەم پێناسانەی بەسەردا پەیڕەو بکرێت یان هاوشێوەی ئەم پێناسانەی بەسەردا بچەسپێت ئەوە زانستە ئەگەر وەهاش نەبوو زانست نیە.

مێژوو لای زۆرێك ڕێز و پیرۆزی هەیە ئەوانە لایان وایە مێژوو هەموو شتێك و زانستی زانستەکانە و هەموو زانستەکانیش تەنها دیاردەیەکی مێووین. هەر سەبارەت بەمێژوو هەندێك دەڵێن مێژوو نەك هەر زانستە بەڵکو کۆگایەکی زانستی و ئەکادیمیە کەرەستەکانی گشت زانستەکانی مرۆڤایەتی لەخۆ گرتووە و هەموو زانستێك بەشێکە لە(هیسترۆلۆژی) واتە زانستی مێژوو، کەواتە مێژوو دایکی هەموو زانستەکانە. هەروەها مێژوونوسی ناوداری کورد دکتۆر کەمال مەزهەر دەڵێت: هیچ گومان لەوەدا نەماوە کە مێژوو زانستێکی گەورەو بەکەڵکە، بەڵکو بەبێ سێ و دوو دەتوانین ناوی بنێین (زانستی زانستەکان) و ڕاستیەکەشی مێژوو زانستی زانستەکانە، بەهەمان شێوە ئاماژەش بەوە دەکات و دەڵێت:

مێژوو یەکێکە لەزانستە هەرە گەورەکانی ژیان و زانستێکی مرۆییە، فەیلەسوفە گەورەکانی ڕێبازی مادی سەدەی نۆزدە دەیان گوت تەنها یەك زانست هەیە ئەویش زانستی مێژووە کەبریتیە لە دووبەش ئەوانیش مێژووی ئادەمیزاد و مێژووی سروشتن،مەبەست لەیەکەمیان ئەو لقانەی زانستە کەئادەمیزاد بۆخۆی کەرەستەیانە وەك(مێژوو،ئابووری،کۆمەلایەتی..)، هەرچی دووەمیانە بریتیە لەو زانستانەی کەرەستەیان لەناو خودی سروشت خویدا یە وەك( کیمیا،فیزیا، بایەلۆجا..) لەلایەکی دیکە هەندیکی دیکەش دەڵێن:مێژوو دەتوانێت ببێت بەزانست بەو پێوە دانگەی کەبریتیە لەکۆمەڵێك زانیاری ڕێك وپێك و بەرنامەیەکی زانستی پەیڕەو دەکات ڕەخنەی پاك و ورد دەگرێت.هەر لەوبارەی زانست بوونی مێژوو فەیلەسوفی بەریتانی کیرو دەڵێت: مێژوو زانستە، لەهەمان کاتدا ئەوەشی ڕاگەیاند کە مێژوو وەك زانستی ئامێرەکان و عەدەسەکان و رووەکەکان زانستێکی برواپێکراو نیە.بەلام لەڕووی ئەنجام و شێوازەکانیەوە ڕێژەیەکی زۆری لەو زانستانە وەرگرتوەلەبەر ئەوە دەتوانین دریغی لێنەکەین و بەزانستی ناوببەین، مێژوونوسی فەرەنسی فۆستێل دی کۆلانگ دەڵێت: مێژوو زانستە وەك زانستەکانی دیکە حەقیقەتی ڕووداوەکان نیشان دەدات و پاشان دەڵێت: ڕێگەی مێژوو هەرهەمان ڕێگەی زانستەکانی دیکەیەو فەرقیان نیە،

جۆرج ماکولی ترڤیلیان دەڵێت: مێژوو لەسنورێکی دیاری کراودا کەکاری وردبینی و گەڕانە دەکات زانست، بۆ دەڵێت: مێژوو زانستە زۆر و کەمی پێ ناوێت بەهەمان شێوەش مێژوونووسی ئینگلیز بیوری(١٨٦١–١٩٢٧)دەڵێت: نەکەم و نەزۆر مێژوو تەنها زانستە.وەکەسایەتیەکی وەك ئیبن خەلدون دەڵێت: مێژوو لەڕواڵەتدا هەواڵە دەربارەی ڕۆژگارو ڕووداوەپێشوەکان،لەناوەرۆکدا ڕوانین و وردبونەوەو لێکۆڵینەوەیە بۆ تەوەرەکان و پرنسیپەکان وە زانستە بەچۆنیەتی

ڕووداوەکان و هۆکارە قوڵەکانیان. نامانەوێت زۆر درێژدادڕی بکەین لەسەر بیناسەی زانست و دەمانەوێت هەندێك پێناسەو ڕاوبۆچوون لەسەر چەمکی نازانستی مێژوو بخەینە ڕوو، ئەوەی ڕێگە لەوە دەگرێت کە مێژوو بەزانست دانەنرێت ئەوەیە کەڕێساو قانونەکانی زانستەکانی دیکە پەیڕەو ناکات و ڕاوبۆچونیش بەبەردەوامی دەربارەی سروشتی مێژوو هەر جیاواز بووە.

فەیلەسوفانی سروشت ئەوانەی دژ بەوە وەستان و دەڵێن مێژوو زانست نیە و دەڵێن مادەی مێژوو لەمادەکانی زانست جیاوازە چونکە مێژوو مادەیەکی ناجێگیرە سنووری بۆ نیە.نمونەیەکیش بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەش ئەوەیە لەهەرشوێنێکدا دوو هایدرۆجین و یەك ئۆکسجین لەیەك بدەین ئەوا ئاو دروست دەبێت بەڵام ئەم ڕووداوە بۆمێژوو جیاوازەو ناتوانین بەو شێوەیە سەیری بکەین چونکە کەرەستەیان جیاوازە،هەروەها هەمووومان ئەوەش دەزانین کەلەیاسای زانستی بیرکاریدا(١+١=٢)ئەمە پاش چەند هەزارساڵی تریش هەر ئەو ئەنجامە دەکات،بەڵام ناتوانین ئەم ڕێسا زانستیە بەسەر مێژوودا پراکتیك بکەین چونکە کەرەستەی مێژوو گیاندار و خاوەن هەست و هۆشە و گەلێك هۆکار کاری تێدەکەن. هەندێکی دیکە دەڵێن ئێمە باوەڕمان بەوە نیە مێژوو بەزانست دابنرێت چونکە وادەزانین لەنێوان خودی مێژوو و زانستەکانی تردا جیاوازی زۆر هەیە تا ئەوپەڕی نەگونجاندن.تەنانەت ولیام ستانلی جیفرونز دەڵێت : هیچ مانای نیە مێژوو بەزانستی تەواو دابنێین، لێرەوە لەم بۆچوونەی ئەمەوە ئەشێت مێژوو زانست بێت بەڵام زانستێکی ناتەواوبێت. بەهەمان شێوەش هۆنشۆ دەڵێت: مێژوو زانستە بەڵام زانستی تاقیکردنەوە و ئەزمون نیەبەڵکو زانستی ڕەخنەو ڕاستکردنەوەیە.هەندێکی دیکە دەڵێن : مێژوو بەزانست دانانرێت چونکە مێژوو ناچێتە ژێر ئەو قانونەوە کە زانستەکانی دیکە دەچنە ژێرباری و پەیڕەوی

دەکەن و تاکەتاکەی حەقیقەتی مێژوو ئەو حەقیقەتە نیە کەلە زانستەکانی سروشتدا هەیە،پۆڵ ڤاین دەڵێت: مێژوو نابێت بەزانست،هەندێکی دیکەش لەگەڵ ئاماژەدان بەنازانستی بوونی مێژوو لەوەدەرچوون و سوکایەتی بەمێژوو دەکەن، تەنانەت هنری بیران بەناسکی لوتفەوە گاڵتە بەو مێژوونوسانە دەکات کەدەیانەوێت کارەکانیان بەکارێکی زانستی دابنێن،بەهەمان شێوەش زانایی ئینگلیز یفوتز(١٨٣٥-١٨٨٢) خاوەن کتێبی بنچینەکانی زانست دەڵێت: شورەییە بیر لە مێژوو بکەینەوە و بڵێین زانستە بەمانا ڕاستەقینەکە، کەسایەتیەکی وەهنری فۆرد دەڵێت : مێژوو قسەی هەلەق و بەلەقە.هەندێکی دیکەش دەڵێن: مێژوو نەبۆ زانست و نە بۆکارێکی دیکە دەشێت کەواتە هیچ نییە! تەنانەت کەسایەتیەکی وەك هیگل دەڵێت: ئەوەی مرۆڤ لەمێژووەوە فێری دەبێت ئەوەیە کەهیچی لێوە فێرنابێت. لەکاتێکدا هەندێك لێکۆلەر دەڵێن مێژوو پەند و عیبرەتە و وانەیەکە بۆ ژیان، باشە دەپرسین ئەگەر بابەتێك زانست بێت چۆن مرۆڤ هیچی لێوە فێرنابێت.فەیلەسوفی ئەڵمانی نیچە ئەوەی ڕاگیاند کە مێژوو مردووە، لەبەرامبەر ئەم جۆرە بۆچونانەدا کەسایەتیەکی وەك کولینکود دەڵێت: مانای مێژوو لەوەدایە کە ئەو ڕابردووەی باسی لێوە دەکات ڕابردوویەکی مردوو نیەبەڵکو ڕابردوویەکە بەمانایەك لەماناکان لەئێستادا دەژی.

بەڵام ئەوەی شایەنی باس بێت هەموو ئەم وتانە مێژوو لەوە بێبەش ناکەن کەمافی خۆیەتی بەزانست دابنرێت، بەڵێ مێژوو زانستی تاقیکردنەوە و ئەزمونی واقیع نیە، بەڵام زانستی ئەنجامی ڕەخنەیەو زانستی لێپێچینەوەی ئەو بەڵگانەیە کە ڕووداوەکانی ڕابردووی تێدا نووسراوەتەوە، لەڕاستیدا ئەگەر مێژوو تەنها گەڕان بێت بۆ تۆمارکردن و نووسینەوەی ڕووداوەکان بەشێوەی چیرۆك و ئەدەب و پەخشان و ڕۆمان وە ڕاگەیاندنێك بێت وەك هەواڵ یان چیرۆك بێت نەك

سەلماندن ئەوا بێگومان دەتوانین بڵێین مێژوو زانست نیەو ناچێت خانەی زانستەوە.وەکاتێك بەزانست دادەنرێت بەشێوەی توێژینەوەی زانستی لێکۆڵینەوە لەڕووداوەکان و هۆکار و ئەنجامەکانی بکات و بیخاتە بەر باس و لێکۆلینەی وردی ئەکادیمی و زانستی مەنهەجێکی زانستیانەی بەسەردا پەیرەو بکات دوور لەهەموو سۆزی و وەلا بون بۆ هیچ لایەك هەڵسەنگاندن و شرۆڤەی بۆ بکات،هاوکات لەگەڵ زانستی بوون یان نەبوونی مێژوودا دەتوانرێت بوترێت: مێژوو زانستە بەڵام لەچوارچێوەی زانستە مرۆییەکاندا نەك لەچوارچێوەی زانستە ئەزموونی و تەجریبیەکاندا هەرچەندە زۆر کەس بەدرێژایی قۆناغ و سەردەمە مێژوویەکان نکوڵیان لەتیۆری زانستی بوونی مێژوو کردووە.هەروەها دەتوانین بڵێین مێژوو بریتیە لەو(کێشانە) ڕاستکراوەی هەردەبێت لەتایەکدا دابنرێت کەبەرامبەرەکەی (تای زانستەکان) بێت.لەڕاستیدا چەندێك ڕووداو و پەیامی ڕووداوەکان و ئامانجی ڕووداوەکان زانستی بوونی مێژوو دەسەلمێنن، بگرە زۆر لەوە زیاتر زانستی بوونی مێژوو دەکەوێتە ئەستۆی لێهاتووی و بەتوانای مێژوونوس کەچەند کەسێکی ڕاستگۆ و بیلایەنە و زانستیانە ڕووداوەکان شرۆڤە دەکات بەپشت بەستن بەبەڵگەکان و ڕێکەوتەکان، چونکە ئەگەر بێت و مێژوو خاڵیی بێت لەپشت بەستن بەڕێبازی زانستی وبەڵگە و دیکۆمێنت و ڕێکەوتی ڕووداو و شوێن و کات ئەوا ئەوە دەچێتە خانەی چیرۆك و بەخشان و بیرەوەری و مێژویی و زانستی بوونی مێژوویی لەدەست دەدات و تەنها وەك مێژووی تۆمارکردنی ڕووداوەکان دەردەکەوێت.

## سەرچاوەکان

١. پ.د. موحسین محەمەد حوسێن:سروشتی مەعریفەو فەلسەفەی مێژوو،چاپی یەکەم،٢٠١١

٢. د.کەمال مەزهەر:مێژوو،چاپی دووەم،٢٠٠٧

٣. سەلام عەبدولکەریم: دەربارەی فەلسەفەی مێژوو...زانستی مێژوو،چاپی یەکەم،٢٠٠٩

٤. عوسمان عەلی عەلاف:بەهای مێژوو،چاپی یەکەم،٢٠٠٦

٥. د.محمد فەتحی عوسمان:دەروازیەك بۆ مێژووی ئیسلام، و:ڕەسوڵ بەختیار،چاپی یەکەم،٢٠١٢.

# پــەیوەندی کورد و ئەرمەن و بێتاوانی کورد لەجینۆسایدی ئەرمەن

نوسینی: م. ئارام مەجید شەمێرانی

## پێشەکی

کورد و ئەرمــەن دوو نەتــەوەی خــاوەن خــاك و مێــژوو و کــەلتورو فەرهــەنگی خۆیــانن و لــەخاکێکی نزیــك و هاوســنورو پێگەیــەکی جوگرافیــدا دەژین،ئەمــەش بــەحوکمی لێــك نزیکــی و هاوســنوری و نزیکیــان لــە دوو دەولّــەتی(عوسمــانی- ئێرانی(فارس) بۆخۆیان دووژمن و بۆ ئەم دوو نەتەوەیە دۆست، دووچاری گــەلێك مــالّوێرانی و نەهامــەتی و تراژیــدیا و جینۆســایدکردن بــوون بــەهۆی هێــرش و شالآوەکانیان بۆ سەر خاکی یــەکتر ئــەمانیش لەونێوەنــدەدا دووچــاری هــەزارەها نەهامەتی و مەرگەساتی هاتن,

ئەم دوو نەتەوەیە سەرەتایان لەپەیوەنــدی زۆر بــاش بــوو پێکــەوە بەئاشــتی برایەتی دەژیان تەنانەت ئەرمەنەکان لەزۆر ناوچەی خۆیاندا بەباشی فێری زمــانی کوردی بوبوون و پەیوەندی بازرگانی و هاتوچــۆکردن لەنێوانیانــدا بــەردەوام بــوو بــەلاّم دەولّــەتی عوسمــانی چــاوی بــەم دوو نەتــەوە دراوســێیەدا نــەدەهات و بەبەردەوامی لەهەولّی سڕینەوەی ڕەگەزی کورد و ئەرمەندا بوون هــەموو پــلان و هەولێکی لەو پێناوەدا بەکاردەهێنا، هەربەهۆی ئــەو مــالّوێرانی کاولکاریــەی ئــەم دەولّەتە بەسەریاندا هێناوبووی ئەم دوو نەتەوە مەزلّومە چەوساوە زولّم لێکــراوە

دەوڵـەتی عوسمـای تورکیـان بـەدوژمنی سەرسـەختی هـەردوولا نـاودەبرد و مێژوونوسای هەردوونەتەوەکەش شاهیدی ئەم ڕاستیە بەڵگەنەویستەن.

ئەگەر بەوردی لاپەرەکانی مێژووی ئەم دوونەتەوەیە هەڵدرێتەوە هـەردوولایان لە (ئازار و ناخۆشی و ڕەشەکوژی و زیـانی مـادی و مەعنـەوی) هاوبەشـن، بـەلاّم ئەگەر ئەرمەن لەو قوناغەدا خاکیـان دابەشـکرابێت بـەدوو بەشـەوە ئـەوا ئێمـەی کوردی بێکەس خاکمان دابەشکراوە بۆ چواربەش بەسـەر چـواردەوڵەتی دوژمنـی سەرسەختی کـوردا هـەزارەها نەهامەتیـشمان بەدەسـت ئەوانـەوە چەشـتوە،ئەو کارەساتەی بەسەر ئەم دوو نەتەوەدا هاتووە بەشێکی گرنگی لەرووپـەری مێـژوو بۆخۆی تۆمارکردوە و شەرمەزاریەکی باشی بەبەرپرسانی کارەساتەکانی ئەم دوو نەتـەوە بەخـشیوە بەتایبـەت دەوڵـەتی عوسمـانی و ئیتیحادوتـەرەقی تـورکی وســەرانی ئــەو ڕێکخــراوە نامرۆڤانەیــە وەك(ئــەنوەر و جــەمال و تەلعــەت پاشـا)کەبەسێکوچـکەی دیکتـاتۆری ناسـرابوون، ئـەوان تـەنیا مەبەسـتیان لـەناوبردنی ئـەم دوو نەتەوەیـە نـەبوو بەتـەنیا بـەڵکو لەگـەڵ ئەوەشـدا خاکیـان دابەشکردن و ڕایان گواستن و سەروماڵیان وێـران کـردن لەڕاسـتیدا نمونـەی ئـەم کارە قیزەون و نامرۆڤانە لەمێژوودا کەمە.

ئەم توێژینەوەیە خستنە ڕووی ئەو پرسیار و ڕاستیە بەڵگـە نەویـستەیە کـەوا کێ بەرپرسیارە لەکوشتاری ئەرمەن؟وەلاّمی ئەم پرسیارەش دەمێك بوو خولیای مـن بـوو کـەوەلاّمی بدەمـەوە بەپـشت بەسـتن بـەڕای مێژوونوسـانی بێلایـەن و ڕاستەقینە، چونکە هەنـدێك مێـژوونوس و نوسـەر بەکـەمی و بچڕبـچڕی باسـیان کـردوە نـەیان وێـراوە وەك ئـەرکی سەرشـانیان خۆیـان لەقـەرەی ئەوبابەتـە هەستیارە بدەن و بیخەنەڕوو ئەمەش بەهۆی ترسنۆکی خۆیان یـان داردەسـتیان بـۆ ئـەو دەوڵەتـەی ئـەوکارەی کـردوە وەهەندێکیـشیان بێویژدانانـەو بێگوێدانـە

بەهای مرۆڤایەتی پشتگیریان لەدەوڵەتی عوسمای سوڵتانەکانی کردوە بۆ بەدەست هێنانی مەرامەگڵاوەکانیان،بەلام بەخوێندنەوەی ئەم بابەتە ئەو ڕاستیە بۆ خوێنەری کورد ڕوون دەبێتەوە کەوا تورکی فاشی و سوڵتانی عوسمانی سێکوچکەی دیکتاتۆری ئیتیحادوتەرەقی خاوەن بڕیارو هێزوسوپا بەرپرسیاری ئەو قەتلوعامەن بەسەر ئەم دوو نەتەوەیەدا هاتووە،وەجێبەجێ نەکردنی بڕیاری ئەوانیش مەرگی بەدواوە دەهات.

هەندێك دەڵێن کورد تاوانبارە بەلام دەپرسم ئەی بۆچی ئەرمەنەکان لەدوایدا تۆڵەیان لەکورد نەکردەوە و یەك تاکی کوردیان لەسەر ئەوە لەکورد نەکوشت؟ وەك چۆن تۆڵەی خۆیان لەبەرپرسانی تاوانباری جینۆسایدکەرانی خۆیان کردوە لەکاتێکدا دوای جەنگی یەکەمی جیهانی هەڵهاتبوون و لەدەرەی دەوڵەتی هەڵوەشاوەی عوسمانی بوون بەلام خۆ کوردەکان (باکوری کوردستان) لەبەردەست و نزیکیان بوون تەنانەت یەك کەس لەکوردەکان وەك تۆڵە لەکورد نەکوژراوە، ئەمە ئەو ڕاستیەیە کە لەم توێژینەوەیەدا بۆت ڕوون دەبێتەوە.

م.ئارام مەجید شەمێرانی ٢٠١٣

## کوردەکان ئەرمەنیان پاراستوە، نەك جینۆسایدکردنی ئەرمەن

مەسەلەی جینۆسایدی ئەرمەن بابەتێکی گرنگ و هەستیار و زیندوە لەڕابردو و ئەمڕۆدا,لێرەو لەوێ زۆری لەسەرنوسراوەو زۆری لەسەر وتراوە دەربارەی کۆمەڵکوژی ئەرمەن و بەشداری کردنی کورد و ناوهێنانی لەوکارە کۆمەڵکوژ و قێزەونەدا, زۆر نوسەرو مێژوونوس بێ ئاگایانە لەڕابردوو و لە مێژوو بێشەرمانە کوردیان خستوەتە بۆتەی ئەوتاوانە ڕەشەدژە مرۆڤایەتیە,بێ ئەوەی ئاگاداری پەیوەندی و هاوکاری و دۆستایەتی ئەم دوو نەتەوەیە بن,چونکە ئەوانە بەچاویلکەی تورکی و ڕۆژئاوا خوێندنەوە بۆڕووداوەکان دەکەن لەکاتێکدا ڕۆژئاوا خۆی ئاگاداری کێشەکە بوە کەچی لەئاستیدا بێدەنگی نیشانداوە, ئەمەش بەهۆی بەرژەوەندی و سیاسەتی خۆیان بووە!! یان هەندێك کەس لەژێرسێبەری لایەنێکی توندڕەو دژە کورد و بەکرێگیراو ئەو کارانە دەکەن و دەنوسن و هەڵی دەواسن,چونکە قسە بێدەسەڵاتەوهەموو کەس پێی دەوێرێت و دەتوانێت باق و بریقی پێ بدات و بیرازێنێتەوە,

ئەوانە هەرگیز فێرنەبون بەچاوی واقعی و مێژووی ئاوڕ لەئارێشەو کێشەکان بدەنەوەو ڕاستیەکان وەك خۆی بگەیەنن و بینوسن کەوا کورد هەرلەسەرەتاوە دۆست و هاوکاری ئەرمەن بووە و ڕۆڵی بەرچاوی هەبوە لەپاراستن و رزگارکردنی ئەرمەنەکان و پاراستنیان لەدەست دووژمنە سەرسەختەکەی هەردوولا کەتورك دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسمنای بوون, ئەوانە هەرگیز زمانیان ڕاست نالێ و قەڵەمیان واقعی نانوسێت و چاویان بەرای نادات کورد ببینێت و دوژمنی سەرسەختی کوردن و کەسایەتیە ناودارەکانی کورد بەسوك سەیردەکەن ,لەکاتێکدا ئەگەر چاوێك بەنێو لاپەڕەکانی مێژوودا بگێڕین بۆمان دەردەکەوێت کەئەوانە چەند بەپەرۆش بوون بۆهاوکاری ئەرمەن و پاراستنیان لەو مەترسیانەی ڕووبەڕوویان بووەتەوە.

پەیوەندیەکی نزیك لەنێوان هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن هەبووە و ئەم پەیوەندیەش بەشێوەیەکی راستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەوڵەتی ماد،ئەوکاتەی کەدەوڵەتی میدیەکان بەهاوپەیمانی لەگەڵ دەوڵەتی کلدانیەکان(بابلی)توانیان ئیمپراتۆریەتی ئاشوری لەساڵی ٦١٢پ.ز بروخێنن و ئەوکات ئیدی ناوچەی ئەرمەنەکان دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی میرە ئەرمەنە خۆجێیەکان کە لەژێر دەسەڵاتی ناڕاستەوخۆی میدیەکان دەبران بەڕێوە ئەمەش خاڵێکی بەهێز بوو لەپەیوەندی کورد و ئەرمەن.

تەنانەت دوای ڕووخانی دەوڵەتی مادو لەناوبردنی دەسەڵاتی ماد لەلایەن کۆرشەوە،کۆرش ئیمپراتۆری ئەخمینی دادەمەزرێنێت و بەم شێوەیە کورد و ئەرمەن کەوتنە ژێر دەستی یەك فەرمانڕەوا، ئەمە بووە مایەی ئەوەی کە هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن پەیوەندیەکانیان خۆش بکەن لەپێناو دژایەتی دەسەڵاتی ئەخمینی زاڵ و نوێدا،ئەوەبوو ئەرمەنەکان پشتگیریان لەشۆڕی (فرۆرتیش)ی میدی کرد،فرۆرتیش هاوپەیمانی لەگەڵ ئەرداشیشی حاکمی ئەرمەنەکان بەست و توانی دەست بگرێت بەسەر هەندێك ناوچەی میدیاوە.

لەسەردەمی دەسەڵاتی ساسانیدا کاتێك ئەردەشیر زۆربەری ناوچەکانی کورد و ئەرمەنی خستە ژێر دەستی خۆیەوە بەڵام هەریەك لەکورد و ئەرمەن پێکەوە دژی شاپوری پاشای ساسانیەکان شۆڕشێکیان هەڵگیرساند بەڵام شاپور شۆڕشەکەی لەنێوبرد،دواتر رۆمەکان هاوکاری تیردادی پاشای ئەرمەنیان کرد بۆ گەڕانەوەی وڵاتەکەیان و کوردستانیش لەگەڵی،

دوای ئەوەی ئەرمینیا باوەڕ بەئاینی کریستیانی دێنێ بەڵام ئەمە نابێتە هۆی دروست بوونی کێشەی ئاینی لەنێوان هەردوو نەتەوە ئەوکات کوردەکان هەموویان زەردەشتی بوون مێژووش هیچ کێشەیەکمان بۆناگێڕێتەوە بەو هۆیەوە

یانە بەهۆکاری دیکە لەنێوان ئەم دوونەتەوەیە ڕوویدابێت.لەسەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامیشدا کە زۆربەری کوردەکان بڕوایان بەئاینی ئیسلام هێناو ئەرمەنەکانیش لەسـەر ئـاینی کریـستیانی مانـەوە پەیوەندیـەکانی نێوانیـان لـەهاوکاری و خۆشـگوزەرانی بـەو لاوە هیـچی دیکـەمان بـۆ ناگێڕنەوە،ئیـدی لـەو سـەردەمە بەدواوە چارەنووسی کـورد و ئەرمـەن بەیەکـەوە بەسـترایەوە بەتایبـەت لـەڕووی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و کەلتووریـەوە چـونکە لەسـنورێکی جـوگرافی نزیـك یەکـدابوون،کوردو ئەرمـەن بەیەکـەوە ڕووبـەڕووی هێرشـەکانی تـورك و تەتـەر و مەگۆلەکان بوونەوە پێکەوە چارەنوسیان بویە یەك چارەنووس کەبوونـە خـاوەن کوشتن و بڕین و کاولکـاری ئەمـە بووەتـە مایـەی ئـەوەی کـە هـەردووکیان ببنـە خاوەنی یەك چارەنووس و یەك هەست.

بەم شێوەیە پەیوەندیە باشەکانی کورد و ئەرمـەن بـەردەوام بـوو لەئاشـتی و پێکـەوەژیان و پەیوەنـدی برایانە،تادەگەینـە سـەدەی نـۆزدەیم و سـەردەمی بەدرخان پاشا و دامەزراندنی میرنشینەکەی.

سەرچاوەکان ئامازە بوەدەکەن کەبەدرخان پاشـا کـەهانی کوردەکـانی دەدا بـۆ ژن و ژنخـوازی لەگـەڵ ئەرمەنـەکان, وەڕۆژهەڵاتناسـی ئـەڵمانی(جوهـانس لیبـسیۆن)لەسـاڵی ١٨٤٨ بـاس لـەکوردو ئەرمـەن دەکـات و دەڵێـت:دۆسـتایەتی پەیوەنـدیان هێنـدە خۆشـبوو گەشـتبوە ئاسـتی ژن و ژنخوازی،جگـە لـەوەش ئەرمەنەکان لای میر بەدر خان ڕێز وپایـەیی تایبـەتیان هـەبوو تەنانـەت بەچاوی کورد سەیری دەکردن و بۆیە هەندێك لەمێژوونوسان دەڵێن: بەدرخان پێی وابـوە کورد و ئەرمەن یەك ڕەچەڵەکن، بەهۆی ئەو ڕێـزەوە وایکـرد هـەموو ئەرمەنـەکان بـچنە پاڵیـەوە ئـەویش پـشتیان پـێ ببەسـتێ و ببنـەجێی متمانـەی لەهـەموو کاروبارەکاندا وەك ڕاوێـژکار و فەرماندەی سـوپا ئەمـە لەکاتێکـدابوو تورکـەکان

لەهەموو ئەومافانەبێبەشیان کردبوون،وەکاتێك عوسمانیەکان هێرش دەکەنە سەر شۆڕشەکەی بەدرخان ئەرمەنەکان شان بەشانی بەدرخان ڕووبەڕووی عوسمانیەکان وەستان و لەهەڵوێستە باش و جوامێریەکانیان پەشیمان و پاشگەزنەبوونەوە، وەلەڕاپەڕینەکەی یەزدان شێریش هەمان هەڵوێستیان هەبوو،تەنانەت لەسەردەمی شێخ عوبەیدولای نەهری بەهۆی هاوکاریەکانیانەوە پەیوەندیەکی دیکەی بتەوی لەنێوان کورد و ئەرمەن دروستکرد

یان کەسایەتیەکی وەك (شێخ عوبەیدوڵلا) کەلەکۆنگرەی ساڵی ١٨٨٠دژی لێدانی ئەرمەنەکان بوو وەنەیارەکانی ئەو فیکرەی دەمکوت کرد کەبەکرێ گیراوی عوسمانیەکان بوون ئەمەیە ڕاستی مەسەلەکان،ئەرمەنەکان لەشۆڕشەکەی شێخیشدا بەشدابوون و هێندەی تر پەیوەندیەکانیان بەهێزوپتەوبوو،وەشێخ ئەوەی ڕاگەیاند کە ئێمەو ئەرمەن براین و بۆیە ئەوانیش پشتیوانیان بۆ دەربڕی،وە مێژوونسی ڕووسی (مینۆرسکی) کەلەو سەردەم ژیاوە و دەڵێت: هیچ کەس لەئەرمەنەکان لەبزووتنەوەکەی شێخ زیان و ئازاریان پێنەگەشتوە) ئەمەش ڕاستیەکی بەڵگە نەویستە جوابێکی باشە بۆ ناحەزانی کورد و ئەرمەن.

ئەوهاوکاریانە بەردەوامە تاسەردەمی (سوڵتان عەبدالحمید) و سوارەی حەمیدیە کەلەساڵی ١٨٩١بەفەرمانی سوڵتان پێك هێنرا لە (ئەلبان و چەرکەس و کورد)نەك بەتەنیا کورد، وەلەباسکردنی ژمارەی سوارەی حەمیدیدا زۆر نوسەر کەوتونەتە هەڵەوە دەڵێن: سوارەی حەمیدی هەمووی کوردبوون ئەمەش بەپشت بەستن بەسەرچاوە تورکەکان بووە،بەڵام ئەمە دوورە لەڕاستیەوە،ڕاستیەکەی ئەوەیە کەڕوبەرت ئۆلسن باسی کردوە کەدەڵێت: ژمارەی سەربازی سوارەی حەمیدی بریتی بوولە(٥٣)هەزار،وەمحەمەد ڕەسوڵ

هـاوار لەکتێبەکەیدا (کوردوبـاکوری کوردسـتان بـەرگی یەکـەم) نـاوی نوسـەرێك بەناوی(مروان المدور) دێنێت و دەڵێت: نوسەر ئاماژە بەوە دەکات کۆی ژمارەی کـورد لەسـوارەی حەمیـدی تـەنها(١٠)هەزارکەسـە نـەك هـەمووی کـورد بـووبن ,ئەمەش کەسانی ماستاو چی و بەرتیل خۆری وەك( ئاغاو دەرەبـەگی دژە کـورد و ئەرمەن) ئەمانەچەند زیانیان بەئەرمەن گەیاند زۆر لەوە زیاتر زیانیان بـەخودی کوردەکان کەیاندوە, ئەوانە تێیدا بەشدار بون لەپێناو دەستکەوتنی بەرژەوەندی خۆیان کاریـان دەکـرد, سـەرەڕای ئـەوەش دروشمـی خـودی سـوڵتان ئـەوە بـوو کە(تائەمە هۆکارێك بێت بۆکۆتای کێشەی ئەرمەن و جینۆسـایدکردنیان) هەرئـەو دروشمەش بوو دەسـەڵاتەکانی دواتـر درێـژەیان پێـداو لەسـەری ڕۆشـتن کردیـان بەشارێگە لەکوشتار و لەناوبردنی ئەرمەنەکان,

لەگەڵ ئەوەی سوارەی حەمیدی بەرهەمی عەقڵ و هزری سوڵتان بـوو بۆلـەناو بـردن و لێـدانی ئەرمـەن و کوردەکـان,بـەلام هـەمویان دژی ئەرمـەن نـەبون و ئەوکارانـەی سـوارەی حەمیـدی کردیـان لەڕەشـەکوژی ئەرمـەن هـەمویان کوردنەبوون و نابێت ئـەوەش لەسـەرکوردیش تۆماربکرێـت وەك ئـەوەی هەنـدێك کۆلکە نوسەر کردویانە,چونکە لەڕاستیدا ئەوە سوپایەکی سەربە حکومەت بـووە و فەرمانی حکومەتی جێ بەجێکردوە و نەیتوانیوە لەبڕیاری حکومەت دەرچـێت، ئەوانیش وەك هێـزی پـۆلیس و سـوپا وابـوون و هـیچ کـات نوێنـەری گـەلی کـورد نەبوون.

سـەرەڕای ئـەوەش کوردسـتان لەوسـەردەمەدا لـەنێوان دوو بـەرداش دا دابەشـکراوە بەشـی ڕۆژهـەڵات و بەشـی ڕۆژئـاوا,لەبەشـی ڕۆژئاواشـدا کەلەژێردەسەڵاتی عوسمانیدا بو هـەموویان بەشـدار نـەبون بەشـی باشـوری هـەر ئاگاداری ئەو مەسەلەیە نەبوون تەنانەت ئامادەش نـەبون یـەك سـەربازی خۆیـان

بنیبڕن بۆئەو کوشتارە,ئەوەی ئاگاداری ئەو کێشەیەبوو تەنیا کوردەکانی باکور بوون ئەوانیش وەك دانیشتوان بەشدار نەبوون بەڵکو هەندێك ئاغاو دەرەبەگ و کەسانی بەکرێگیراو بون و لەسەر ئاستی کاری تاکە کەسی بووە،بۆیە ناکرێت ئەمە نەتەوەیەکی پێتاوانبار بکرێت تاوانی ئەو کوشتارە بخرێتە ئەستۆی چونکە خاوەن بڕیار و هێز دەوڵەت بووە نەك کورد,

تەنانەت ناوهێنانی وشەی (کورد) یان (نەتەوەی کورد) یش لەڕووی زمانەوانیەوە ڕاست نیە,چونکە کەدەڵێن کورد واتە هەموو کرود بەشداربووە بەلاَم لەمێژوودا هەرگیز نەتەوەی کورد بەژن و منداڵەوە,بەگەورەو بچوکەوە تەنانەت لەسەر ئاستی میر و میرنشینەکان کورد دژی هیچ نەتەوەیەك نەبووە نەخوازە ئەرمەنیش کەپێکەوە گیرۆدەی دەستی دەوڵەتی عوسمانی بون و هاوئازارو هاوخەم بوون, بەلاَم دەکرێت بەناوی هەندێك ئاغاو دەرەبەگەوەناوبنرێت نەك نەتەوەی کورد,لەسەرەوە ئامـاژەم بەوەدا کەهەموو سوارەی حەمیدی لەوکوشتارە بەشدار نەبوون و هەندێك ئاغای کورد دژی ئەوکێشەیە بوون، بۆیە لێرەدا دەمەوێت بە بەڵگە ناوی هەموو ئەو کەسانە بخەمەڕوو کوردبون و کەلەناو سوارەی حەمیدی و دەرەوەی ئەو سوپایە بوون دژی ئەو کێشەیە بوون تەنانەت ئەرمەنەکانیشیان پاراستوەو ڕووبەڕوی دەوڵەت وەستاون بۆپاراستنیان، ئەو کەسانەی لەناو سوارەی حەمیدی بوون و ئەرمەنەکانیان لەکوشتن و لەناوبردن پاراست و دژی ئەرمەن نەبون وەك (متیع الله) کەلەناوچەی مۆکس و (بەدرخان بەگ)لەمەرگەوەڕ و قائیم قام (حاجی خان)لە نوردز,ئەمەو جگە لەوەش کەسایەتیەکی وەك (زوهیرئاغایان)یەکێك بوە لەو ئاغایانەی کەدژی سوپای عوسمانی وەستاوە بۆپاراستنی ئەرمەنەکان,تەنانەت ئەرمەنەکانی گوندی(خاتسۆ)باس لەوکاتە دەکەن کە

عوسمانیەکان هێرشیان کردوەتە سەریان بۆ کوشتن و ڕاگواستنیان چۆن خەڵکی تیرەی (محمد ئاغا)بەرگریان لێدەکەن و دەست دەدەنە چەکەکانیان و سنگ لەسوپای عوسمانی دەگرن ڕێگەیان پێنادەن بیانگوازنەوە ە تخونیان بکەون،ئەوەش ئاشکرادەکەن کە چۆن کوردەکان نانە ڕەقەیان لەگەڵ ئەرمەنەکان پارچەدەکردن و کەلوپەلەکانی خۆیان بۆ ئەرمەنەکان دەفرۆشت و دەیان دا بەنان بۆ ئەرمەنەکان ئەمە هەڵویستی کوردە.

جگە لەوانەش کوردەکانی ناوچەی (دەرسیم)یش زیاترلە{٥٠}هەزار ئەرمەنی ئاوارەیان لەکوشتن پاراست و ڕزگاریان کردن،وەکەسایەتیەکی کوردی وەك (ئیبراهیم پاشای میللی) کەپلەی میری میرانی هەبوو زیاتر لە {١٠}هەزار ئەرمەنی لەکوشتن پاراست،تەنانەت ئیبراهیم پاشا کاروانی ئەرمەنەکانی دەکرینەوەو ئازادی دەکردن ئەمە لەو شوێنانەی کەلەژێردەسەلاتی ئیبراهیم پاشادا نەبوون،بەلاَم ئەوشوێنانەی کەلەژێر دەستی ئەودابوون هیچ جۆرە ئازارێکیان پێ نەگەشتبوو.

سەرەڕای ئەوەش هەڵویستی ڕۆژنامەی کوردستانیش کەبۆ ئەوکات زمان حاڵی نەتەوەی کورد بوو دڵسۆزانە هانی کوردانی دەدا کەدژی سوڵتان بن و دوور بن لەکوشتاری ئەرمەنەکان،بۆیە لەبواری پەیوەندی کورد و ئەرمەندا ڕۆژنامەی کوردستان وەك و یەکەم ڕۆژنامەی کوردی و ڕۆژنامەکانی تری کوردی ڕۆڵی باشیان لە بتەوکردنی پەیوەندیەکان و بەدرۆخستنەوەی ڕاگەیاندنە شاخدارەکانی تورك و ناحەزانی بینی و ڕێگەیان لەچاندنی تۆوی دوژمنکاری گرت و کە تورکەکان هەوڵیان بۆ دەدا لەنێوان کورد و ئەرمەن کەلێنێك بۆ لەیەك دوورکەوتنەوەیان دروست بکەن بۆیە ڕۆژنامەی کوردستان هەر لەسەرەتای دەرچونیەوە لەلایەن ئەرمەنەکانەوە زۆربەگەرمی پێشوازی لێکرا و تەنانەت

بەشداریان تێدادەکرد بەوتارنوسین و بلاوکردنەوەی ڕۆژنامەکە بەناوچەکانی دەرەوە،لەزۆربەی ژمارەکانی ڕۆژنامەکەدا وتاری باشی تێدابوو ئامارەی بەخاڵە هاوبەشەکانی کوردو ئەرمەن دەکردەوە ئاماژەی بەوەدابوو سەرکەوتنی کورد و ئەرمەن لەهاوکاری و خەباتیاندایە،تەنانەت لەژمارە (١٤)ی ڕۆژنامەکەدا وتارێکی(مەلاسالح)لەجەزیرە بلاوکردوەتەوە کەتێیدا نیگەرانی خۆی بۆ ئەو دۆخە دەربڕیەوە کەستەم لەکورد و ئەرمەن کراوە و دەڵێت:(لەسوچێکی ئەم دونیایەدا خەڵك بەکردنەوەی خوێندنگە و ئاوەدانکردنەوە و پرۆژەی خزمەتگوزاریەوە خەریکە کەچی لای ئێمە سوڵتانەکان بەکاری لەناوبردن و کاولکاری کورد و ئەرمەنەکانەوە خەریکن و هانی هەردوولایان دەدەن تابەگژیەکدا بچنەوە،بەلام ئەوەی سوڵتانەکان مەبەستیانە هەرگیز نایەتەدی)

لەڕاستیدا ئەوەی لەمێشکی تورکاندا بوو پلانی بۆ دانرابو سڕینەوەو لەناو بردنی نەتەوەی ئەرمەن بوو،لەمێژوودا کورد نەخشەی بۆلەناو بردنی هیچ نەتەوەیەکی غەیرەدین و غەیرە خۆی دانەناوە و هەرچی ڕوویدابێت دەستی دەرەکی بوەوتوانیویانە بەچەند بەکرێگیراوێك ئەوکارانە بکەن وەك جاشەکانی لای خۆمان کە دەستیان لەئەنفالی کوردانىدا هەبوو دواتر وەك بەرزەکی بانانە بۆی دەرچوون!! تورکیش ئێستا دەیەوێ دەستی تاوانی ڕەشی خۆی بەسەر کوردی بێتاواندا بسرێ،

بەلام دەکرێت بۆ مێژوو ئەوەبوترێت هەمیشە کوردەکان هاوسۆزی ئەرمەنەکان بوون و لەهەرشوێنێك بۆیان کرابێت یارمەتی ئەرمەنەکانیان داوە و ئەوانیان پاراستوە و حەواندویانەوتەوە و لەدەست تورکەکان ڕزگاریان کردوون،ئەرمەنەکانیش لەهەموو شوێنێك دۆستی کوردیان هەبووە،بەگشتی ئەمە ڕەوشی ئەوکاتە بوو لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم و لەمیانی جەنگی یەکەمی

جیهانیش،لەزۆر شوێن کوردەکان دەستی یارمەتی و هاوکاریان بۆ ئەرمەنەکان درێژ دەکرد و لەهەندێك شوێنیش بەکرداری بەشداریان لەبزووتنەوەکەیان و بەرگری کردنیان دەکرد بۆ ئەوەی سنورێك بۆ کۆمەڵکوژیەکەیان دابنرێت ئەم حاڵەتەش بەتایبەت لەدەرسیم ڕوویدا.

### پەیوەندی کورد و ئەرمەن لەسەرتای سەدەی بیستەمەوە تاجەنگی یەکەمی جیاهانی

هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن وەك یەك ڕووبەڕووی زوڵم و ستەمەم و تاوانی کۆمەڵکوژی دەوڵەتی عوسمانی تورك بونەوە هەردوولا دەمێك بوو بەدەست ئەو ئازارەوە دەیانناڵاند هەم خۆیان وەك جەستە هەم خاکەکەشیان ڕووبەڕووی قوربانیدان و کاولکاری بوونەوە.

قوربانیدان و چەوساندنەوەی هاوبەشی کورد و ئەرمەن و خەباتی سیاسی و چەکداری هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن دژی چەوساندنەوەی سوڵتانە عوسمانیەکان لەسەرەتای سەدەی بیستەم ڕۆڵێکی باشی گێڕا بۆ لەیەك نزیکبوونەی زیاتری سەرکردەی هەردوو نەتەوە،دواتر ئەم پەیوەندیە ساسیانە ڕەنگیدایەوە بۆ سەر ڕەوشی کۆمەڵایەتی و پەیوەندی هەمەلایەنەی هەردوو گەلی خەباتگێر،بەهۆی هاوبەشی و لەیەك چونیان لەڕووی چەوسانەوەوە بێبەش بوون لەمافی نەتەوایەتی یان زۆربەی جار هەماهەنگ بوون لەمەینەت و ڕووبەڕووبونەوەی زوڵم و ستەمی عوسمانیەکان هاوکاربوون لەیارمەتیداندا تەواوکاری یەك بوون تەنانەت کوردەکان بۆ پاراستنی ئەرمەنەکان قوربانیشیان داوە.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەهۆی پەیوەندی شاندی هەردوولا لەڕووبەڕووبونەوەی پلانەکانی عوسمانیدا ئەم دوونەتەوەیە یەك ڕیز و یەك

هەڵوێست بوون ئەمەش لەچاپەمەنی و بڵاوکراوەکـانی کـورد و ئەرمـەنی ڕەنگـی دابویەوە و کورد و ئەرمەن خۆیان پشت و پەنای یەك بوون و هاوکـاری یـەکتریان دەکرد دژی ئەو ستەمەی لەهەردوو لا دەکرا.

تەنانەت لەساڵی ۱۹۰۲شدا تورکەکان ویستیان ئەرمەنەکانی ناوچـەی ساسـۆن دەرکـەن و ئـەوانیش ڕاپـەڕین, کوردەکـانیش وەك وەفایـەك بـۆ ئەرمەنـەکانی دراوسێیان لەو ڕاپەڕینەدا بەنهێنی و بەئاشکرا یارمەتی ئەرمەنـە ڕاپـەڕیوەکانیان دا, هەرئەمەش بـوو وای لەقۆنسوڵی بـەریتانیا کـرد لەئـەرزە ڕۆم کەلەنامەیـەکی ڕۆژی ۱٦تشرینی یەکەمی ۱۹۰۳بنوسـێت ( لـەم چـەندمانگەی دوایـدا دیاردەیـەك سەرنج ڕادەکێشێت ئەویش مەسـەلەی پەیوەنـدی کـوردو ئەرمەنـە و کوردەکـان یارمەتی ئەرمەنەکان دەدەن) تەنانەت یەریتانیەکانیش چاویان بەم دۆستایەتیەدا نەدەهات, بەهەمان شێوەش لەسەردەمی هاتنە سەرکاری تورکەلاوەکان لەساڵی ۱۹۰۸کـورد و ئەرمـەن دۆسـت و هاوکـاری یـەك بـوون و هەرلـەو سەردەمەشـدا ڕیکخراوی (کورد تعـاون ترقـی جمعیتـی)بەسـەرۆکایەتی شـێخ عبـدالقادر نـەهری دامەزرا کەیـەکێك لەئامانجـەکانی بـەهێزکردنی پەیوەنـدی کـورد و ئەرمـەن بـوو, ئەمەهەڵوێستی کوردە نەك کوشـتاری ئەرمـەن,وە خـەباتی سیاسـی و چـەکداری کـورد و ئەرمــەن دژی چەوسـاندنەوەی سـوڵتانە عوسمانیـەکان لەسـەرەتای سەدەی بیستەم ڕۆڵێکی باشی گرنگی گێڕا بۆ سەر پەیوەندیەکانی ئەم دوو گەلـە شۆرش گێڕەبەهۆی هاوبەشی لەیەك چوونیان لـەڕووی چەوسـاندنەوە و بێبـەش بـوون لـەمافی نەتەوایـەتی یـان زۆر جـار هەماهـەنگ بـوون لەمینـەت و ڕووبەڕووبوونەوەی زوڵم زۆری،لەو قۆناغەدا کۆمەڵانی کورد و ئەرمەنی بانگەوازی یەك ڕیزیان بۆ یەك دەکرد،

تەنانەت کەتورکە لاوەکان پێشتر بەڵێنیان بەهەردوو نەتەوە دابوو لەو بەڵێنەی خۆیان پاشگەزبونەوە ئەمەش سیاسەتێکە لای زۆر دەوڵەتی داگیر کەری کورد و ئەرمەنەکان درێژەی هەبوە,بۆیە دژی هەردوو نەتەوە بونەوەو,لێرەدا تورکەکان ئەرمەنەکانیان بەلەمپەر دەزانی بۆ جێ بەجێکردنی فکرەو هزری پانتورانیزمیان کەگەشتن بوو بەناوچەکان (ئازەربایجان و تورکمانستان)و دروست کردنی دەوڵەتی تورانی تورك, بۆیە ساڵی ۱۹۰۹جارێکی تر ماڵوێرانیان هێنایەوە بەسەر ئەرمەنی زوڵم لێکراودا,

هەر لەو قۆناغە بەدواوە چەند کەسایەتیەکی تری کورد وەك (حەسەن بەدرخان و عبدالرزاق بەدرخان) ڕۆڵێکی بەرچاویان بینی لەپتەوکردنی پەیوەندی کوردو ئەرمەن,لەڕاستیدا ئەمە هەڵوێستی ناودارانی کوردە کەچی ناحەزانی کورد، کورد بەومەسەلەیە تاوانباردەکەن بێ بەڵگە,نزیك بوونەوەی سەرکردەکانی کورد و ئەرمەن دەسەڵاتدارانی ئەستانەی بیزارکردبوو چونکە ئەوان پیلانیان بۆ بەگژ یەکدابردنی کورد و ئەرمەن دادەڕشت کەچی کارەکان بەئاوەژووی مەرامەکانیان هاتن هەردەم هەوڵیان دەدا کورد بەگژ ئەرمەندا بدەن، بەلأم ئەم دوونەتەوەیە سوور بوون لەسەر هاوکاری یەکدی.

تەنانەت(مەلاسەلیم) داوای هاوکاری و کۆمەکی لەئەرمەنەکان کردو پاشتر کە ڕاپەڕینێکی بەرپاکرد کوردو ئەرمەن جارێکی تر دۆست و هاوکاری یەك بون و بۆپاراستنی یەکتر هەوڵیان دەدا, هەر لەو بارەیەوە ڕۆژنامەی ئەرمەنی بەناوی (هوریزۆن) لەژمارە ٧٤ی ڕۆژی ١٩١٤/٤/١٠ دەنوسێت :(کوردەکان بەوپەڕی ڕێزو دۆستایەتی لەگەڵ ئەرمەنەکان هەڵسوکەوت دەکەن) ئەمەش بەڕادەیەك ڕازی نەدەبوون نان بەخۆڕایی لەئەرمەنەکان وەرگرن کەبەڕەزامەندی خۆیان پێیان دەدان،تەنها لەکاتی پێویست بۆ خۆگەرم کردنەوە سوتەمەنیان لێوەردەگرتن

چونکە ئەو ڕۆژگارانە زۆر سارد بوون و ئەمەش ئەرمەنەکانی خۆشحاڵ دەکرد کاتێك دەبونە مایەی گەرمکردنەوەی ئەوان(کوردەکان) ئەمە شایەتی دانی خودی ئەرمەنەکانە بە بەڵگەوە,ئیتر ئەوانەی باسی کورد دەکەن لەکوشتاری ئەرمەن تەنیا فیشەك بەتاریکیەوە دەنێن,.

بەڵام ناحەزانی هەردولا حەزیان بەئاژاوەو قسەی بێ بەڵگەیە و دەیانەوێت بۆ مەبەستی سیاسی خۆیان کورد لەو مەسەلەیەدا تاوانبار بکەن، تەنانەت تورکەکان پروپگەندەیان لەسەر کورد و ئەرمەن بڵاو دەکردەوە دەیان وت کوردەکان لەجیاتی ئەوەی داوای مافی خۆیان بکەن هێرش دەکەنە سەر ئەرمەنەکان بەڵام ئەم هەوڵانە بەفیڕۆچوون,وەك چۆن تورکەکان لەهاوکاری کوردەکان بۆ ئەرمەنەکان دڵگران بوون بەهەمان شێوەش لەهاوکاری ئەرمەنەکان بۆ کوردەکان دڵگران بوون، ئەمەش بەوەی ئەو هاوکاریەی ئەرمەنەکان دەسەڵاتدارانی تورکی خستبووە دڵەڕاوکێ و نارەحەتیەوە چونکە هەوڵەکانیان بەدرێژایی ڕۆژگارەکە شکستیان هێنابوو پیلانەکەیان سەری نەگرتبوو کەبتوانن کورد و ئەرمەن بەگژیەکدا بدەن،بۆیە ولی تورکی لەموش کە(ئیحسان پاشا)بوو داوای لەئەرمەنەکان کرد چەك لەدژی کوردەکان هەڵگرن،بەم داوایەی والی ئەرمەنەکان لەڕوو دامان هیچ چارەیەکیان نەما چونکە بەرەتکردنەوەی دووچاری سزا و ڕاوەدوتان دەبونەوە بەقبوڵکردنیشی دوژمنایەتی دەکەوتە نێوان کورد و ئەرمەنەکانەوە ئەمەش ڕێگە و بژاردەیەکی سەخت بوو بۆ ئەرمەنەکان،بەڵام کەسایەتی ئەرمەنی(کارۆساسۆنی)وتی:ئەرمەنەکان زۆر باش لەم داوایە دەگەن بۆیە ژیرانە ڕووبەڕووی ئەم هەڵوێستە بوونەوە،ئەوەبوو بەڕووکەش و بەزارەکی پشتیوانی خۆیان بۆ والی دەربڕی لەژێرەوەش لەم پلانەیان کوردەکانیان ئاگادارکردەوە و پێیان ڕاگەیاندن کەتورکەکان خەیاڵیان خاوە.ئەو ڕۆژە بەچاوی

خۆیـان ببیـنن کـە کـورد و ئەرمـەن ڕووبـەڕووی یـەکتر ببنەوە،ئەرمەنـەکان کوردەکانیان ئاگادارکردەوە کە هـەرگیز ئامـادەنین چەکەکانیان بەرامبـەر کـورد ئاراسـتە بکـەن.لەراسـتیدا تورکـەکان بـێ گوێدانـە هـیچ بنەمایـەکی مرۆڤایـەتی ئامادەبوون هەموو پیلان و ڕێگەیەك بگرنەبەر بۆ بەگژیەکدادانی کـورد و ئەرمـەن و نەمانی هاوکاری نێوانیان تەنانەت تورکەکان کەوتنە گرتنی هاولاتیـانی سـڤیلی ئەرمـەنی بۆنونـە (هـاگوپ) هـاولاتی ئەرمـەنیان گـرت چـونکە بەگـەنم هاوکـاری خێزانی خەباتگێڕی کوردەکانی کردبوو،هەروەها(نەخشۆ) کەهاولاتیەکی ئەرمەنی بوو دەسگیرکرا بەهۆی هاوکاری و یارمەتیـدانی ڕاپەڕیوەکانـەوە جگـە لەوانـەش تورکەکان ڕۆژنامەی (ئەرتاماران)ی ئەرمەنیان داخست بـەبیانوی ئـەوەی هـەواڵی ڕاپـەڕینی کوردەکـانی بلاوکـردەوە ئەمـەش لەگـەڵ سیاسـەتی تورکـەکان نەدەگونجا.

سەرە ڕای هەموو ئەوانە کەچی خۆشبەختانە ئەمڕۆ لای ئەرمەنەکانیش ئـەوە ساغ بوەتەوە کە کورد دەستی لەو کوشـتارو کێشەیەدا نـەبوە تەنانـەت مێـژوو نوسی ئەرمەنی (ئارشاك سا فرستیان) لەکتێبی کـوردو کوردسـتانەکەی ئـەوەی ئاشکرا کردوە کە:(خودی تورکەکان هەمووتاوانێکی لێـك کـەوتنی هـەردوو گـەلی برای کوردو ئەرمەنیان لەئەستۆدایە نـەك کورردەکـان) ئەمـەش بەڵگەیـەکی تـری خـودی مێـژوو نوسـی ئەرمەنەکانـەو دیـرۆك نوسـەکانیان شـایەتی لەسەردەدەن،لەڕاسـتیدا پـێم وایـە هێنـدەی نوسـەران و مێژوونوسـان باسـی ئەوەیان کردوە کەکورد بەشـدارە لەکوشـتاری ئەرمـەن و کۆمـەڵکوژی ئەرمـەن و تاوانبارکردنیان بەکوشتاری ئەرمەن هەرگیز باسـی ئـەوەیان نـەکردوە کـە کـورد چەندێك ئەرمەنی پاراستوە و لەمردن رزگاری کردوون,خۆشبەختانە دەتوانین بـۆ مێژوو ئەوە بڵێین نیوەی ئەرمەنەکانی ئەمڕۆ نەوەی ئـەو ئەرمەنانـەن کوردەکـان

لەمردن ڕزگاریان کردوون و پاراستونیان. جگە لەوەش خودی ئەرمەنەکان زۆر لەگەڵ کوردەکان بەختەورن پێکەوە ژیاون ئەم بەختەوەریەی ئەوانیش بۆ بێتاوانی کوردەکان دەگەڕێتەوە لەجینۆسایدکردنی ئەرمەنەکان. تەنانەت ئەرمەنەکان لەگەڵ کوردەکان زۆر بەختەوەر بوون هەر لەوبارەیەوە میجەری بەریتانی (ك.سۆن)جوگرافیناسی شاهانە لەلەندەن لەموحازەرەیەکدا ئاماژەی بەوەکردبوو دەڵێت:(دوور نیە هەر یەکە لەئێمە بیرۆکەیەکی شاشی لەسەر ئەوە هەبێت کە کوردەکان لەکۆمەڵکوژی ئەرمەنەکان بەرپرسیاربن،بەڵام کەم کەس لەئێمە ئەوە دەزانێت کەبەر لەجەنگی یەکەمی جیهانی ئەو کریستیانە(ئەرمەنەکان) لەناچە کوردیەکان دەژیان گەلێك بەختەوەربوون.

## ئەرمەنەکان لەژێر بڕیاری سەرانی سیکوچکەی دیکیتاتۆریەت دووچاری جینۆسایدکردن بوون

لەم بەشەدا دیسان دەمەوێت زیاترلەوەی کەپێوستە بچمەنێو بابەتەگرنگەکانی مێژووی پەیوەندیەکانی کورد و ئەرمەن و دورخستنەوەی کوردلەکوشتارو کۆمەڵکوژی ئەرمەن و نیشاندانی مێژووی ڕاست و دروستی کورد بەشێوەیەکی شەفاف و بەڵگەنەویست و لادانی ئەو پەردە ڕەشەنامۆیەی کەبەدەستی لەخوێن هەڵکێشراوی تورکی ئەرمەن کوژ و دژە ویژدان لەسەر ڕووی سپی مێژووی کورد,

لەڕاستیدا ئەم کارە هەر وائاسان نیە چونکە زۆر لەنوسەرەکان بەبێ بەڵگەوبەشێوازێکی نامەنتقی خۆیان بەو بابەتەوە هەڵواسیوە و کانیاوی ڕاستیەکانیان بەبەردی ڕش و نەگریسی خۆیان پرکردوەتەوە و خۆیان بەسۆپەر مێژوو نووس ناو زەند کردوە,بۆیە ئەمەش هەوڵ و ماندو بونی زۆری دەوێ و

وەئـەرکی سەرشـانی نوسـەرو مێـژوونوس و ڕۆشـنبیرە بەوییژدانـەکانی هـەردوو نەتەوەی برای کورد و ئەرمەنە کار بۆ خستنەڕووی ڕاستیەکان بکەن،

لێـرەوە دەمـەوێت ئاشـناتان کـەم بەبەشـی دووەمـی ڕاسـتی و بەڵگـەکان, کەلەماوەی جەنگی جیهانی یەکەم کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتی و نەتـەوەکانی جیهـان توشی کارەسات و مـاڵوێرانی بـوون,بـەڵام ئـەوەی گرنگـە مەسـەلەی پاراسـتنی ئەرمەنەکانە لەلایەن کوردە خۆنەویست و قارەمـان و دڵسۆزەکانەوە کەلـەکاتی تەنگانـەو گەرمـەی شـەڕدا ئەرمـەنی برایـان لەیادنەچـووە، وەلـەو پێناوەشـدا ئامـادەی قوربـانی دان بـوون لـەپێناو پاراسـتنیان, ئەمەیـە ڕاسـتی مەسـەلەکان کەبەدەستی ناحەزان و بەناو مێژوونوسان شێوێنراوە,

زۆربەی زلهێزەکان لەساڵانی جەنگدا لەهەوڵی سـەرنج ڕاکێـشانی نەتـەوەکانی ناو دەوڵـەتی عوسمـانی بـون بـەبیانوی جۆراو جـۆر بۆمەبەسـت و بەرژەوەنـدی گـڵاوی خۆیـان,وەلەهـەمان کاتیـشدا سیاسـەتێکی نادیاریـان بەرامبـەر هـەردوو نەتەوەکە هەبوو,لەهەوڵی بەگژیەکدادانی کورد و ئەرمەن بـون ئەمـەش لەسـنورو چوارچێوەی دەولەتی عوسمانیدا بۆزیاتر شێواندنی بارودۆخەکـەو تاوانبـارکردنی نەتەوەی کورد, ئەوەی گرنگە بۆمێـژوو ئـەوە بـوترێ لەسـاڵانی جـەنگی یەکەمـد دەوڵـــەتی عوسمـــانی لەژێرفـــەرمان و سیاســـەتی سێکوچـــکەی دیکتـــاتۆری ئیتحادوتەرەقی بووکە(جەمال پاشـاو ئەنوەرپاشـاو تەلعـەت پاشـا)بـوون ئەمانـە خـاوەن دەسـەڵات و خـاوەن بڕیـاربوون تـەواوی فەرمانـەکان لەلایـەن ئەوانـەوە دەردەچـوو,ئەمانــە باوەڕیــان بەپێکــەوە ژیــانی نەتــەوەکانی نــاو دەوڵــەت نەبوولەهەوڵی پاکتاو کردنیان بوون,بۆیە لەو ماوەیەدا ئیتیحادیەکان کوشـتارێکی ترسـناکیان لـەکورد و ئەرمـەن کـرد ئەمـەش گوزارشـتێك بـوو لەماهیـەت و فراوانخـوازی و ڕەگەزپەرسـتی بزووتنـەوەی تـورانیزم, چـونکە ئـەوان باوەڕیـان

بەهـەردوو نەخـشەی پـانتورکیزم و پـانتورانیزم بـوو,ئامـانج لەنەخـشەی یەکـەم بەتورك کردنی هەموومیللەتی غـەیرە تـورك بووکەزۆربـەی دانیـشتوانی دەوڵـەتی پێك دەهێنا,

وەئامـانج لەنەخـشەی دووەم کۆکردنــەوەی هــەموو میللــەتی تــورانی بــوو لەچوارچـێوەی دەوڵــەتێکی تــورکی فــراوان کەلەبــەغازی بــسفۆرەوە دەســتی پێدەکردو دەگەشتە ئاسیای ناوەڕاست,بەڵام لەبەرامبەر ئەمەدا گـەلی ئەرمـەنیان بەلەمپەرو ڕێگر دەزانی بۆ گەشتن بەو خەونەیان,چـونکە بەپێگـە جوگرافیەکـەی تورکانی ئامۆزای تورانیەکانی دانیشتوانی ئازەربایجانی ڕوسیاوتورکستانیان جیـا دەکردەوە,وەلەو پێناوەشدا هـەمو ڕێگەوشـێوازێکی نامرۆڤانـەو کوشـت و بڕیـان دەگرتەبەر,

ئەمەلەلایەك و لەلایەکی تر سیاسەتیەکی تریان بەکار دەهێنا ئەویش هەسـتی ئـاینی بووئەمـەش بۆبزوانـدنی هەسـتی ئـاینی کـورد بـوو,بـەڵام لەهـەمان کاتـدا ئیتیحادیەکان عەلمانی بـون و باوەڕیـان بـەئاین نـەبوو ,لەلایـەکی تـر لـەو ئـان و ساتەدا سوڵتان بەناو خۆی بـەپارێزەر و خەلیفـەی ئیـسلام دەزانـی و بانگـەوازی ئـاینی دەکـرد بۆنەتــەوەکانی نـاو دەوڵـەت, بـەڵام لەهــەمان کاتیـشدا لەگـەڵ ئەڵمانیای غەیرە ئیسلام دەستی تێکەڵ کردبوو ئەمەسیاسەتی سوڵتان بـوو دژی ئەرمەنی مەسیحی کەچی دۆسـت و هاوپـەیانی ئـەڵمانی مەسـیحیش بـوو ئەمەیـە سیاسەتی چەواشەکاری سوڵتان بـەناو خەلیفـە,لەڕاسـتیدا ئەمـە دوورە لـەواقعی ئیسلام,

لەگـەڵ ئەوەشـدا هەنـدێك کـەس وای بـۆ دەچـن کـەکورد بـەهۆی سیاسـەتی کوێرانەی ئاینی دژی ئەرەمەنەکان بوە, بەڵام ڕاستی مەسەلەکە ئەوەیە بەدرێژی مێژوو تائەمرۆش کورد کێشەی ئاینی لەگەڵ هیچ نەتەوەیەك نەبوە و بـوونی ئـەو

هەمووە ئاین و ئاینزایە لەکوردستان و پێکەوەژیان لەگەڵیاندا ڕاستیەکی بەڵگە نەویستە,سوڵتان و سەرانی تورك لەم سیاسەتەیان زیرەك بوون کەوتنە فەتوادەرکردن,بۆیە هەرلەسەرەتای شەڕەوە دیسان تورکەکان کۆمەڵکوژی و ماڵوێرانیەکی تریان بەسەر ئەرمەنەکاندا هێنایەوە,تەنانەت لەڕۆژی ٢٤/٤/١٩١٥فەتوایەکیان دەرکرد کەلەسەر کورد و تورك پێویستە غەزای ئەرمەن کوشتن دەست پێبکەن و لەمایسی هەمان ساڵدا حکومەت فەرمانی دەرکرد ئەرمەنەکان لەسەر سنوردەربکەن لەو سەرو بەندەدا (ئەنوەرپاشا) سودی لەو هەل و بارودۆخە وەرگرت تا بەوتەی خۆی (مەسەلەی ئەرمەن بۆهەتاهەتای لەتورکیادا چارەسەربکات و ئەو کێشەیەش بنەبڕبکات)کەئەویش ڕەشەکوژی ئەرمەنەکان بوو بەشێوەیەك هیچ ئاسەواریان نەمێنێ ئەمەش بەڵگەیەکە کەخودی ئەنوەرپاشا خاوەن بڕیارە کەیەکێکە لەسێکوچکەی دیکتاتۆریەت نەك کوردەکان,

لەماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا دەوڵەتی عوسمانی توشی چەندین شکستی یەك لەدوای یەك بویەوەلەبەرەکانی شەڕدا,بۆیە هەریەك لەئەنوەر پاشاو تەلعەت پاشا هەوڵیان دەدا تاوان و تاوانبار و هۆکاری ئەو شکستەیان بدۆزنەوە وەکەسیش لەو ڕۆژەدا وەك ئەرمەن بۆ ئەو مەسەلەیە دەستی نەدەدا بۆیە ئەنوەر بڕیاریدا تەواوی ئەرمەنەکانی تورکیا لەناو بەرێ بەوشێوەیە کوشتارێکی دروستکرد تاوانەکانی( سوڵتان عبدالحمید) لەو بارەیەوە هیچ نەبوو! !سەرە ڕای ئەوەش هەستا بە بەردان و ئازاد کردنی زیندانیەکان و مەرجی ئازاد بونیانی کردبوو بە کوشتنی ئەرمەن و لەناو بردنیان,لەلایەکی تر بۆ تاوانبارکردن و سوککردنی کورد هەستا پیاوکوژ و تاوانبارەکانی خۆیان جل و بەرگی کوردی لەبەردەکردن و دەیان ناردنە سەر ئەرمەنەکان بەجۆرێك کەبەشێوەیەکی

وەحشی گەری و دڕندانە قەتڵ و عامی ئەرمەنیان دەکرد و لەهەموو لایەك بڵاویان دەکردەوە کەوا کوردەکان پەلاماری ئەرمەنەکانیان داوە و کوشتاریان لێکردوون,بەوشێوەیە ناوی کوردی بێتاوانیان زڕاندوە ئەمەیە سیاسەتی شەیتانی تورك و تاوانی نێومێژووی ڕەشیان,ئەمەیە تێکدانی ڕاستیە مێژووییەکان و هەندێك لەمێژوونوسەکان دیماگۆجیانە(ساویلکە) شوێن ئەو سیاسەتە شومە کەوتوون کە دوورە لەڕاستیەوە لەوەوە خوێندنەوە بۆ کورد و مێژووەکەی دەکات, جگە لەو سیاسەتە نارەوایانە سەرانی تورك بۆلەناو بردنی ئەرمەن چەندین بڕیار و بروسکەی جۆراو جۆریان دەردەکرد لەوانەش بەنمونە بروسکەیەکی (تەلعەت پاشا)یە دەینێرێت بۆ حاکمی حەلەب و دەڵێت(بەرلە ئێستا پێتان ڕاگەیەنراوە کەوا بەپێی فەرمانی جەمعیەت بڕیار دراوە کەبەیەکجاری ئەو ئەرمەنانە لەناو ببرێت کەلەتورکیا دەژین,ئەوانەی دژی ئەم بڕیارەن ناتوانن لەسەرکاری خۆیان بمێنن,هەرچەندە ئەو هەنگاوانە توند و تیژین بەڵام بەهیچ شێوەیەك گوێ مەدەنە تەمەن و ژن و پیاو و ویژدان)ئەمەناوەڕۆکی سیاسەتی تورکەو تەنانەت دژی ویژدانیشن!!

لەئەنجامی ئە سیاسەتەی تورك کەبەپێی ڕاپۆرتێکی ئینگلیز لەتشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٦ناردبوی بۆ پەرلەمانی وڵاتەکەی نوسرابوو(لە دوو ملیۆن ئەرمەنی دانیشتوی تورکیا ١/٣یان کوژراون و ١/٣یان ئاوارەو دەربەدەر بوون),تەنانەت ڕۆژنامە نوسی ڕووسی لەو بارەیەوە دەنوسێت(لەشاری وان نەکەسی زیندووی تیا ماوە نەخانووی بەپێچوە ماوە,لەشاری بەتلیس لە١٨هەزار ئەرمەنی تەنیا ٣٠٠تا٤٠٠ ژن و منداڵ ڕزگاریان بوو,وەلەشاری موش و ئەو سێ گوندەی دەورو بەری کە ٢٥هەزار ئەرمەنی لێدەژیا پاش ڕەشەکوژیەکان تاکەکەسێکی لێدەرنەچوو!!) ئەمەیە سیاسەتی جینۆساید و پاکتاوی ڕەگەزی

تـــورك کەبـــەو کارانـــەیان لاپـــەڕەکانی مێـــژووی خۆیـــان پـــێ ڕەش و شەرمەزارکرد,لەڕاستیدا لەمپەڕ بۆ ئەو پەڕی مێژووی کورد بگەڕێ سیاسەت و کارێکی هاوشێوە و قێزەونی وا بەدی ناکەی ئیدی کامەیە کوشتاری ئەرمەن بەدەستی کوردی بێ دەوڵەت و بێ کیانی سیاسی و خاك دابەشکراو,

وەلەبروسکەیەکی تری وەزیری ناوخۆ (تەلعەت پاشا) دەڵێت(ئەرمەنەکانی ولایەتی ڕۆژهەلآت بەنهێنی بکوژن)کەچی خۆشیان ئەو ڕاستیانە باش دەزانن, بەلآم تائەمڕۆش سەرانی تورك دانی پێدا نانێن و تورکی لێ بێبەری دەکەن,لەگەلێ ئەو هەموو ماڵوێرانی و ڕەشەکوژیەی سەرانی تورك و دەوڵەتی عوسمانی بەسەر نەتەوەی ئەرمەنیان دا هێنا کەچی پاکانە بۆخۆیان دەکەن و تاوانی ئەوکوشتارانە دەخەنەئەستۆی کورد,ئەمەش بۆئەوەی پەردەی ڕەش و تاریك بەسەر بەسەر کوردەکان بدەن و بەچەتەو ڕێگر لەقەڵەمیان بدەن,لەلایەکی ترئابڕووی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد بەرن و لەکەداری بکەن,وەلەلایەکی تریش ئەمە بەهانەیەکیش بێت کەپەلاماری کوردەکانی پێبدەن,تەنانەت (تەلعەت پاشا)پاکانە بۆخۆی دەکات و تاوانی کوشتارەکە دەخاتەئەستۆی خودی ئەرمەنەکان چونکە یامەتی ڕوسیایان داوە و دەڵێت: کلێسەکانیان جگە لەچەك و تەقەمەنی هیچی تری تیانەبوە,بەلآم ئەی تاوانی ڕاگوێزان و کورد کوشتن دەخاتە ئەستۆی کێ! لەکاتێکدا هاوئاین و هاو مەزهەبی خۆیان بون,بەلآم پەتی درۆ کورتەو مێژوو حاکمێکی بەویژدانەو تاوانباران لەمەحکەمەی مێژوو ڕزگاریان نابێت و مێژوو ڕەحم بەکەس ناکات,

جگە لەوەش (جەمال پاشا) تاوانی کوشتارەکە دەخاتە ئەستۆی ڕوسەکان چونکە هانی ئەرمەنیان داوە دژی تورکەکان,ئەمانەبڕووبیانوی پوچن و ناکاتە ئەوەی نەتەوەیەك بەژن و منداڵەوە جینۆسایدکەیت خۆئەوانە نەلەبەرەی

شەڕدابون و نەلەناو سوپای ڕوس ئەمە واقعی مێژووە,بەلاّم ئەی مالّوێرانی و ڕاگواستنی کوردەکان چی؟! سەرە ڕای ئەوەی ئیتیحادیەکان ئەو کارەساتەیان بەسەر ئەرمەن هێنا بڕیاریان دا ئەوەی بەئەرمەنیان کردوە بەکوردیشی بکەن,

بۆیە دەستیان کرد بەڕاگواستن و ئاوارەکردنی کوردەکان ئەمەش بەمەرجێك ژمارەی ئەو کوردە ئاوارانە لەهەر شارێکی تورکدا ژمارەیان لە٥٪ زیاتر نەبێت لەڕاستیدا ئەمە سیاسەتی تەتریك و تواندنەوەی کوردە لەبۆتەی نەتەوەی تورکدا, لەئەنجامی ئەوەدا نزیکەی ٥٠٠کورد گیانیان لەدەست داو ٧٠٠هەزارکوردیش بەرەو ڕۆژئاوای ئەنادۆلّ ڕاگوێزران ئەمانە بەدەم ڕێگەو برسیەتی و ماندویەتی و سەختی ڕێگا لەناو چون و بەشێکی تریان پێش ئەوەی بگەنە شوێنی دیاری کراو کوشتنیان,هەرلەو بارەیەوە (د.عبدالعزیزیامولّکی) دەنوسێت:(تابڕانەوەی شەڕی یەکەمی جیهانی زیاتر لە٧٠٠هەزار کوردی تورکیا مردن و لەناو بران)ئەمانە ڕاستی سیایەتی تورکەو چاویان بەرای نادات ڕاستیەکان ببینن,

سەرباری ئەوەی کوردەکان وەك ئەرمەنەکان توشی کارەسات و مالّوێرانی سیاسەتی ڕەگەزپەرستی تورك بون ,بەلاّم لەو قۆناغەشداو لەگەرمەی شەڕیشد برا ئەرمەنەکانیان لەیاد نەکردوە بەپێی توانا یارمەتی ئەرمەنیان داوە تەنانەت ئەو ئەرمەنانەی لەڕێگەی دیرۆزەوە پەنایان بردوەتە بەر کوردە یەزیدیەکان ئەوانیش پاراستونیان و نەیان هێشتوە تورکەکان سزایان بدەن و لەناویان بەرن,

لەلایەکی تر (عبدالعزیز یامولّکی)دەنوسێت:(بێگومان ئەو ئەرمەنانەی لەئەنادۆلّ مابونەوە لەشمشێری تورکان ڕزگاریان بوو بەبێ خۆهەلّکێشان سێ لەچواریان ئەوانە بون کورد ڕزگاری کردبوون یان شاردبونیەوە) بەهەمان شێوە (د.بلەج شێرکۆ) دەنوسێت (خۆشبەختانە ئەمڕۆ لەکۆڕەکاندا ساغ بوەتەوە

کەلەساڵانی جەنگی گشتیدا و لەکاتی کوشتاری ئەرمەندا کوردەکان بەوەی داڵدەی ٥٠هەزار ئەرمەنیان داوە و نەیان هێشتوە دەستی تورکانیان پێ بگات کارێکی دۆستانەو بێ وێنەیان ئەنجام داوە بەتایبەت خودی ئەرمەنەکان دان بەو ڕاستیەدا دەنێن) وەلەساڵی ١٩١٥دا کەسایەتیەکی وەك (ئەحمەدبەگ) بویە سایەو پەنای ئەرمەنەکان و گەلێکی لەمردن رزگارکرد,وەلەنامەیەکی تایبەتیدا ئەرمەنەکانی گوندی (خاتسۆ)باسی ئەوەیان کردوە کەچۆن کوردەکانی هۆزی (محمدئاغا)بەرەنگاری سەرباز و جەندرمەی میری بونەتەوە ڕێگەیان نەداوە ئەرمەنەکان بگوازرێنەوە ,هەرلەونامەیەدا نوسراوە هۆزەکە خۆیان بەدەست برسێتیەوە دەیان ناڵاند کەچی دواپارچەنانیان لەگەڵ ئەرمەنەکان دەکرد بەدوو بەشەوە و یارمەتیان دەدان,

لێرەشدا دەمەوێت بەڵگەیەکی ڕاست و دروستی ئەرمەنەکان بهێنمەوە کەیەکێك لەپیاوە ئاینیەکانی ئەرمەن بەناوی (گریگۆریۆس پەلاکیان) بەهەمان شێوە داکۆکی زۆری کردوە لەکورد و دەیسەلمێنێت کەکورد ڕۆڵی نەبوە لەکارەسات و کوشتاری ئەرمەنەکان نمونەش دێنێتەوە لەکتێبەکەیدا بەناوی (ئەرمەنەکان و کۆمەڵکوژی و تاراوگە)باس لەو ڕوداوە دەکات لەنزیك ئەنقەرە ڕویداوە و دەڵێت: کوردی لێ نەبووە,

بەمەش نەك نوسەرو مێژوونوسە ئەرمەنیەکان بەڵکو پیاوە ئاینیەکانیشیان بێتاوانی کورد لەکوشتاری ئەرمەندا دەسەلمێنن و تەواوی کوشتار وماڵوێرانیەکانی ئەرمەن دەخەنەئەستۆی تورك و سەرانی ئیتیحادیەکان بۆیە دەبێت بەرپرسیاریەتی مێژوویی بخرێتە سەر تورك نەك کوردەکان,چونکە ئەوان ویستویان دەستی بەخوێن سوربوی ئەرمەن کوژی خۆیان بەسەر نەتەوەی کورد بسون لەگەڵ ئەوەشدا هەرئەوان خاوەن دەوڵەت و دامودەزگاوسوپاوهێز و

بڕیاربوون نەك كوردی بەشمەینەت و بێماڵوحاڵ و بێ سوپا وبێ دەسەڵات.لەڕاستیدا ئەمە سیمای هەموو دەسەڵاتێكی خوێنمژە بۆ پەردەپۆشكردنی كارە قێزەونەكانی خۆی تەواوی كارەخرەپەكانی خۆی دەخاتە ئەستۆی نەتەوە ژێردەستەكانی خۆی بۆ بێتاوانی خۆی

## سەردەمی تۆڵەی ئەرمەن و لەناوبردنی جینۆسایدكەرانیان

زۆرگرنگە لێرەدا ئەوە بۆ مێژووبخرێتە ڕوو یان ئەكرێت وەك بەڵگەیەكی گرنگ و وەك جوابێكی پۆڵاین و كۆنكرێتی بەكاربهێنرێت,كەدەڵێم پۆڵاین چونكە هەتائێستا زۆر كەس و لایەن و زۆر مێژوونوس و زۆر فەریكە نوسەر پێیان وایە كورد جینۆسایدی ئەرمەنی كردوە و كوردیان بەوناوەوە ناساندوە یان بۆهەرمەبەستێك بێت ڕاستیەكانیان شاردوەتەوە ,بەلآم وەك دەڵێن ڕاستی لەنێوئاگریشدابێت ناسوتێ,جگەلەوەش ئەمەسەردەمێكە دەتونین بەئاشكراو بێ ترس ڕاستیەمێژووییەكان وەك خۆی بوترێ و بنوسرێت, لێرەدا سەیر نیە ئەمە بوترێ چونكە لای مێژوونوسی ڕاستگۆ و بەویژدان گەردیلەو وردیلە ڕاستیەكان ون نابن لەبەرئەوە ئەوانە ڕۆحیەتی مێژووی و نوسینی مێژووییان هەیە بەچاوی واقعی بۆ ڕوداوەكان دەچن وخوێندنەوەی بۆدەكەن, زۆر پێم خۆشبوو منیش ئەم ڕاستیە بڵێم چونكە دەمێكە سەلماندنی ئەم ڕاستیە ئاواتی منەو دەمێك بوو لەمێشكمدا دەهات و دەچوو,بەلآم سوپاس بۆخودا پاش ئەوەی توێژینەوەیەكم لەسەركرد گەشتمە ڕاستیەكان,منیش حەزدەكەم ئەو ڕاستیانە وەك خۆی باس كەم بۆئەوەی بتوانین هەمیشە دەمكوتی ناحەزانی كوردی پێ بدەینەوە و شەرمەزاریان كەین,

ئەمڕۆش ئێمە نەدەوڵەت و نەکیانێکی سیاسی زۆر بەهێزمان هەیە تابتوانین بەهێز یان بەفشاردروستکردن ئەو گومانانە لەنێو بەرین,بەلاّم ئەوەی مایەی خۆشحاڵیمانە ئەمڕۆ چەکی دەستی ئێمەی کورد تەنیا قەڵەمی دەستمانە بۆیە دەتوانین زۆر ڕاشکاوانە و بێ ترس تەواوی خلّتەو بوختان و گومانە پیسەکان لەسەر مێژووی خۆمان لابەرین و مێژوویەکی بێ هەڵەو پەڵە تۆمار بکەین,وەپێویستە جوابی تەواوی بەناو مێژوونوس ونوسەرە گومان چیەکان بدەینەوە و بڵێین: گەر ئێوە بێ بەڵگە کورد بەجینۆسایدکردنی ئەرمەن ناو دەبەن؟ ئەی بۆچی ئەرمەنەکان تۆڵەی ئەو جینۆسایدەیان لەکورد نەکردەوە و نەهاتن چەندکەسایەتیەکی ناوداری کورد لەنێوبەرن؟ خۆ ئەوان تۆڵەی خۆیان لەجینۆسایدکەرانیان کردەوە و حەقی مەعنەوی خۆیان کردەوە و ئەوەی کردبویانە ئامانج بۆتۆڵە لەنێویان برد چ لەدەرەوە و چ لەناوەوە, خۆئەوانە تورك بون و دوڵەتیان هەبوو,بەلاّم کوردی بێ دوڵەت و دابەشکراو زۆر نزیکن لەئەرمەن وەدەیان توانی بەئاسانی لەکوردەکان بکوژن بەو ناوەی کەئێوە دەڵێن جینۆسایدکردن,بەلاّم دەڵێم ئەی بۆکورد و بەرپرسانی کوردیان تیرۆر نەکرد؟بۆتۆڵەیان لەکورد نەکردەوەو؟ ئەمەڕاستیەکانە چونکە کورد بێ بەری بوە لەکوشتاری ئەرمەن و جینۆسایدکردنیان وەك لەبەشەکانی پێشوو تر ڕونمان کردەوە,

لێرەوە دەمەوێ ئەوە بڵێم ئەرمەنەکان وێڕای کوژرانی سەدان هەزار ئەرمەن و ئاوارەو ڕاگواستنیان بەلاّم هەوڵیاندا تۆڵەی خۆیان بکەنەوە و ڕووی جینۆسایدکەرانیان ڕەشکەن و بیان خەنەنێو زبڵدانی ڕەشی مێژوو ,بۆهەتاهەتای مرۆڤایەتی قێزیان لێبکاتەوە نەفرەتیان لێبکەن و شەرمەزاری نێولاپەڕەکانی مێژوویان کەن,وەك پێشینان دەڵێن {قەرز کۆن دەبێت و نافەتێت}

جینۆسـایدکەرانی ئەرمـەنیش بـاجی ئـەو قـەرزەیان دەدەن وەك دواتـر ڕوون دەبێتەوە, دوبەدوای تـەواو بـونی جـەنگ سـەردەمێك هاتـە ئاراوە دەتـوانم ئـەو حەقـە بـەخۆم بـدەم و بەسـەردەمی{تۆڵەسـەندنەوەی ئەرمەنـەکان}ناوزەنـدی بکەم, ئەوە بوو دوای کۆتایی هاتنی کۆمەڵکوژی و ڕوخانی ئیمپراتۆری عوسمانی و هەڵهاتبی سەرانی سێکۆچکەی دیکتاتۆریەت و دامەزراندنی کۆماری تورکیا,

ئەو ئەرمەنانەی کەلەگۆشەو کـەناری دنیـادا پـەرت و بـڵاو بوبونەوەبەدەست تورکان,بەتایبـەت ئـەو ئەرمەنانـەی لەمـەرگی مسۆگەر ڕزگاریـان بوبـوو کەوتنـە هەوڵی تۆڵە سەندنەوە لەو کەس و بەرپرمانەی کەلەکوشـتار و جینۆسـایدکردنی ئەرمەندا دەستیان هەبوو لـەناویان بـردن و تیرۆریـان کـردن, هەرلـەو واقیعەشـدا ئـەرکی تۆڵـە سـەندنەوە کەوتەئەسـتۆی خـودی نیـشتمان پـەروەرانی ئەرمـەن کەلەسالآنی{١٩٢٠_١٩٣١}بەوپەڕی فیداکاری و قارەمـانی چاونەترسـی سـەرانی حکومەتی خوێن ڕێژی ئاژاوەکێڕی ئیتیحادی تورکی فاشستیان تیرۆرکرد,

بۆیــە لــەناو ئەوانــەش ســەرۆك وەزیرانــی ئازەربایجــان بــوو لەســاڵی ١٩٢٠بەدەســتی (ئــارام یــەرگانیان)تیرۆرکراوهەرلەهــەمان ســاڵدا(عــەباس بیگــۆف)لەکوشــتاری ئەرمەنــدا پێگــەی پلــەدووی هــەبوو بەدەســتی (یــەرگان)تیرۆرکـرا,دوای ئــەوەش کەسـێکی ترکەدەسـتی تۆڵـەی پێگەشـت شەرمەزاری نێومێژوو بـوو (تەلعـەت پاشـا)بـوو کەلەکۆمەڵکوژیەکـەدا پلـە یـەکی هەبو هەمووئەو فەرمانانەی ئەودەریدەکردن بۆکۆمەڵکوژی ئەرمەن هێشتا مـاون, دوابەدوای ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانی تەلعەت ڕۆشتە بـەرلین و لەوێـدا بـەنهێنی دەژیا ئەمیش دەستی تۆڵەی پێگەشت و بەدەست کەسایەتیەکی ئەرمەنی تـیرۆر کـرا بـەناوی(سـوغوفۆن تـەهلیریان)کەئـەویش لەسـەردەمی کۆمەڵکوژیەکـەدا برینداربوبوو,تـەهلیریان دەڵێـت(کاتێـك بـەهۆش خـۆم هاتمـەوە چـەند هـەنگاوێك

لەولامەوەبوك و دایك و براو خوشكەكانم لەخوێندا نقوم بوبون)وە خۆیشی بەزەحمەتێكی زۆر لەگۆرستانی بێگۆری ئەرمەن رزگاری بوبوو,دواتر بەجلی توركی و بەناوی نەخوازراو دەژیا بەلآم پاشماوەك گەشتە ئەلمان ولەوێدا بەدوای جینۆسایدكەرانی ئەرمەندا دەگەرا و بەتایبەتیش تەلعەت كەلەوێ بوو,پاش دۆزینەوەی مالەكەی و لەرۆژی ٢١/ئاداری١٩٢١گەشتە تەلعەت و دەلێت:بەناوی خۆی بانگم كردوكاتێ ئاورێ لێدامەوەو پێم وت (گۆرهەلكەنی پیس دواساتی تەمەنت هاتوە)هەرلەوێدا تیرۆری كردو تۆلەی مەعنەوی خۆی كردەوەو دوابەدوای ئەوە خۆی تەسلیمی دادگاكردو دواتر دادگای لەسەركراو لەداگا پرسیار لەتەهلیریان كرا كەبكوژی تەلعەت بوو:ئایا ئەوانەی ئەرمەنیان كوشت و تەقەیان لێكردن كورد بون؟ ئەویش دەلێت: نەخێر, پاشان لێی دەپرسن:جلەكانیان كوردی بوو؟ پێیان دەلێت:نەخێر, لەراستیدا ئەمەش ئەوە دەردەخات كەدادگا ویستویەتی بەهەرشێوەیەك بێت مەسەلەكەو كۆمەلكوژیەكە لەسەركورد ئیسپات بكات بەلآم وەلآم دانەوەكەی تەهلیریان بەنەخێر بەلگەیەكی باشە لەبێتاوان دەرچونی كورد لەو مەسەلەیەدا وە بێبەری بەەنی كورد لەو كۆمەلكوژیدا,

سەرەرای ئەوانەش یەكێكی ترلەجەلادەكانی كۆمەلكوژی ئەرمەن كەدەستی تۆلەی پێگەشت (سەعیدحیلمی پاشا)بوو ئەمەیەكێك بوولەهاوكارە نزیكەكانی تەلعەت پاشا كە هەلهاتبوو بۆ ئیتالیا و لەرۆما دەژیا ئەمەبەدەست لاوێكی راكردوی ئەرمەنی بەناوی (ئەرشاویز شیرگیان)تیرۆركرا كەلەتوركیاوە رۆشت بۆ ئیتالیا و بەدوای ئەوداگەراو لەرۆژی ٦ی كانونی یەكەمی ١٩٢١ دۆزییەوە تیرۆری كرد, جگەلەوەش شۆرشگێرانی ئەرمەن حوكمی كوشتنیان بۆ (د.بەهائەدین پاشا)دەركرد كەرۆلێكی گەورەی هەبوو لەكوشتاری ئەرمەنەكاندا ئەوە بو

لەساڵی ١٩٢٢لە ئیربیلی بەهەمان شێوەی ئەوانیش تیرۆرکرا,وەدواتریش کەسێکی تر کەتۆڵەیان لێکردەوە و لەناویان بردئەویش {ئەنوەرپاشا}ی وەزیری جەنگ و پێشەوای خەیاڵی تورکیای مەزن کەیەکێك بوو لەونەژاد پەرستانەی تورکیای لاو بۆدروست کردنی تورکیای مەزن لەگەڵ کۆمەلێك سەرباز سەردانی تورکستانی کرد تائەو ناوچەیەش بکاتە بەشێك لەقەڵەمڕەوی عوسمانی و(تورکیای مەزن) بەلام خۆشبەختانە پێش ئەوەی نەخشە خەیاڵیەکەی جێ بەجێ بکات دەستی تۆڵە یەخەی گرت و دوو ئەرمەنی قارەمان بەناوەکانی(پەترۆس تربۆغوسیان و ئەرتاش گورگیان)تیرۆریان کردو ڕەوانەی دۆزەخی هەتاهەتاییان کرد,یەکێکی تر لەو کەسانەی کەدەستی تۆڵەی پێگەشت (بەهبودخان جوانشیر)ی وەزیری ناوخۆی ئازەربایجان بوو کەلەکۆمەڵکوژی ئەرمەندا دەستی بالآی هەبوو لە١٩یتەمموزی ١٩٢١ لەئەستەمبوڵ بەدەستی (میساك تورلاکیان)تیرۆرکرا,کاری ئەرمەنکوژی تەلعەت و ئەنوەر و جەمال پاشا وای لەکەسایەتیەکی وەك (لۆردبرایس)کردکە بە(پیاو کوژی بێشەرم) ناویان ببات,بۆیە حەقی خۆی بوو ئەمانە تۆڵەیان لێبکرێتەوە چونکە ئەوانە بەلەناوبردنی ئەرمەن و سڕینەوەیان قەناعەتیان دەکرد و دڵیان ئاوی دەخواردەوە.

لەڕاستیدا کوژرانی ئەو ناپاك و خوێن ڕێژو ڕەگەزپەرستانە بەدەستی ئەرمەنەکان هەرچەندە ناکاتە تۆڵەسەندنەوەی تەواوی ئەرمەنەکان و سارێژبونی برینەکانیان, بەلام ئەوەی گرنگە ئەوان بەدەستی خۆیان تۆڵەیان لەناحەزو خوێن ڕێژانیان کردەوەو شەرمەزاری نێو مێژوو و کۆمەڵگەلی مرۆڤایەتیان کردن و ڕەوانەی نێو زبڵدانی مێژوویان کردن,ئەمەش هەر هیچ نەبێت تاڕادەیەکی باش خەمەکانی سەرشانی ئەرمەنی سوك و سارێژ کرد,ئەمەش چارەنوسی هەموو

مرۆڤێکی دیکتاتۆر زاڵمی نێو مێژووی مرۆڤایەتیەو وەك وتراوە پەتی زوڵم و ستەم لەئەستوریدا دەبچڕێت, لەڕاستیدا ئەمە وەلامی ئەو هەموو پرسیارانەیە کەدەڵێن کێ بەرپرسیارە لەکوشتاری ئەرمەن؟یان کوردەکان بەرپرسیار بون لەکوشتاری ئەرمەن؟ بەلام ئەی بۆچی ئەرمەنەکان و پارتی داشناکی ئەرمەنی تۆڵەیان لەکورد نەکردەوە و چەند ناودارێکی کوردیان لەناو نەبرد و تیرۆریان نەکرد وەك ئەنوەر و تەلعەت و جەمال......؟!!! بەلام لەڕاستیدا تیری ژەهراوی ئەم جۆرە پرسیارانەی ئەوان هەرگیز ناتوانێت پەیوەندی دۆستانەی کورد و ئەرمەن و خۆری ڕوناکی نێوانیان کۆتای پێ بهێنێت,وەلەهەمووشی گرنگتر دوابەدوای جەنگی یەکەم قۆناغێکی نوێتر لەپەیوەندی کورد و ئەرمەن دەست پێدەکات, ئەمەش خاڵێکی زۆر گرنگ و پڕبایەخە چونکە ئەگەر کورد دەستی هەبوایە لەکوشتاری ئەرمەنەن ئەوا ئەرمەنەکان هەرگیز ئامادەنەدەبون پەیمانی دۆستایەتیان لەگەڵ ببەستن و دەستی برایەتی بخەنە نێودەستی کورد و درێژە بەکاروانی پەیوەندیەکانیان بدەن,

## ڕۆڵی شەریف پاشالەبەهێزکردنەوەی پەیوەندی کورد و ئەرمەن وسیاسەتی تورکیای کەمالی لەهەمبەر ئەو دوو نەتەوەیە

دوابەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی و سەرکەوتنی هاوپەیمانان و کۆتای هاتنی جەنگ بەپێی ئاگربەستی {مۆدرۆس}لەرۆژی ٣٠\١٠\١٩١٩هاوپەیمانان بەڵێنیان بەهەموو گەلە ژێردەستەکانی دەوڵەتی عوسمانی دا کەڕزگاریان دەکەن و داهاتویان دیاری دەکەن و لەزوڵم وزۆری عوسمانیەکان ڕزگاریان دەکەن ,هەرلەو سەروبەندەدا {ولسن}ی سەرۆکی ئەمریکا ڕایگەیاند کەپێویستە هەموو گەلانی ژێردەستەی دەوڵەتی عوسمانی{ مافی چارەی خۆنوسین }وەرگرن,لەناو

ئەوانەشدا هەردوو گەلی کورد و ئەرمەنی ستەم دیدەی دەستی تورك, ئەم گەلانەش زۆردڵخۆش بوون بەو بڕیارە,بۆیە بۆباشترکردنی ئەو بارودۆخەگەشتن بەمەبەستەکانی خۆیان بڕیاردرا بەبەستنی کۆنگرەیەك ئەوە بوو لەڕۆژی ١٨\١\١٩١٩کۆنگرەی{ئاشتی} لەپاریس بەسترا ئەوەش بەسەرپەرشتی وڵاتانی سەرکەوتوو لەسەروو هەموشیانەوە{ ولسنی} سەرۆکی ئەمریکا و {کلیمەنسۆ}ی سەرۆك وەزیانی فەرەنسا و {لویدجۆرج}ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا,سەرە ڕای ئەوەش نزیکەی {١٧} وەفد بەشداریان تێدا کرد,ئەوەی گرنگە لێرەدا بوترێ ئەوەیە لەم کۆنگرەیەدا هێندە بەرژەوەندی زلهێزەکان ڕەچاوکرا هێندە گرنگی بەلایەنەکانی ترنەدرا....!!

لەو سەروەختەشدا گەلانی ژێردەستەی ناوچەکەش بەهیوای بەدەست هێنانی ئازادی و مافی چارەی خۆنوسین و پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆبوون,بۆیە شەڕی یەکەمی جیهانی و شکستی دەوڵەتی عوسمانی هەلێکی گونجاوی بۆ ڕزگاربونی نەتەوە ژێردەستەکانی ئەو ئیمپراتۆرە هێنایە ئاراوە لەسەروو هەموشیانەوە هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەنی ژێردەستە کەدروستبونی دەوڵەت ئاواتی هەمیشەی و لەمێژینەیان بوو, لەو کۆنگرەیەدا دوشانی ئەرمەنی بەشداربوون کەبریتی بوون یەکێکیان بەسەرۆکایەتی(ئاوادیس ئاوهانیان)ی نوێنەری پارتی تاشناق و کۆماری ئەرمەنی بوو کەدوای کشانەوەی روسیا سەربەخۆیی ڕاگەیاندبوو،شاندی دووەمیان بەسەرۆکایەتی (بوغس نۆبارپاشا)بوو نوێنەرایەتی ئەرمینیای ڕۆژئاوای دەکرد واتە ئەو پارچە ئەرمینیایەی دەکەوتەنێو خاکی تورکیاوە.

ئەوەبوو لەوبارودۆخەدا ڕۆشنبیران و خاوەن ڕاکان و پیاوماقولان و چەندین کۆمەڵەی کوردی هەولی بەستنی ئەو کۆنگرەیان بیست {شەریف پاشا}یان

وەك نوێنەری خۆیان هەڵبژارد بۆبەشداریکردن و بەدەست هێنانی مافە ڕەواکانی کورد,ئەوەی شایانی هەڵوەستە لەسەرکردنە لەوسەردەمەدا کورد دەوڵەتێکی نەبوو تابەڕەسمی بەشداری بکات لەو کۆنگرەیەدا,لەوکاتەشدا شەریف پاشا لەپاریس بوو داوای لێکرا بکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ بەرپرسانی کۆنگرە بۆسەندنەوەی مافی کورد و بەهێزکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەرمەن, ئەوەبوو شەریف پاشا وەك سیاستمەدارێك خۆی گەیاندە کۆمەڵەکانی ئەرمەن بۆگفتوگۆلەگەڵیاندا بۆلابردنی ئەو ناکۆکیەی کەناحەزان بۆیان هەڵواسیبوون,لەڕاستیدا بۆچارەسەرکردنی کێشەوئاریشەدەسکردەکانی دوژمن، پێشووتر شەریف پاشا لەگەڵ{بوغزنۆبارپاشا}ی سەرۆکی وەفدی ئەرمەن لەکانونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨لەپاریس پەیمانێکیان مۆرکرد ئەمەش زیاتر بۆ ئەوە بوو تارێگەبگرن لەدەست تێوەردانی لایەنەکانی تر لەکێشە بەدرۆ هەڵواسراوەکان و زیاتر زەقنەکردنەوەی ئەوکێشانە,

لەلایەکی تر بۆ لەناوبردنی ئەو هەوڵەی درابوو بۆ دروستکردنی دەوڵەتی ئەرمەنی لەسەرخاکی کوردستان بەهاوکاری زلهێزەکان و وەباسیش لەوە کرابوو کەتورکەکان ڕۆڵی خراپیان بینیبوو لەئاڵۆزکردنی پەیەوەندیەکانی کورد و ئەرمەن و قەلاچۆکردن و لەناوبردنی هەریەك لەکورد و ئەرمەن,بۆیە هەرلەو سەردەمەشدا سەرۆکی وەفدی ئەرمەن{ بوغزنۆبارپاشا}لەمانگی تەمموزی ساڵی ١٩١٨ئەوەی ڕاگیاندبوو کە{سوڵتان عبدالحمید} و تورك بەرپرسیارن لەکوشت و بڕەکانی ئەرمەن ئەمەلەلایەك و لەلایەکی تریش لەکۆنگرەی ئاشتی دا دیسان تورکەکان هەوڵی ئەوەیان دەدا نێوانی کورد و ئەرمەن تێك بدەنەوە و بیاندەن بەگژیەکدا و لەهەمان کاتدا ئەوان لەسەر ئەو سیاسەتەی خۆیان بەردەوم بوون,

لەڕاستیدا خەباتی سیاسی و دیبلۆماسی شەریف پاشا لەو قۆناغەدا زۆرقورس و گران بوو چونکەکەش و سیاسەت و بەرژەوەندی زلهێزەکانی ئەوسەردەم لەگەڵ خواستە نەتەوەییەکانی کورد پێك نەدەهاتەوە,بەلآم تارادەیەك بۆئەرمەن باشتربوو بۆدامەزاندنی دەوڵەتی ئەرمەنی چونکەتارادەیەك ولآتانی رۆژئاوا لەگەڵیان بوون,تەنانەت لەو سەردەمەشدا ئەرمەنەکان بەهاندان و سیاسەتی زلهێزەکان داوای دوڵەتی خۆیان دەکرد ئەوەش زیاتر ناوچە کوردیەکانی {ئەرزەرۆم و وان و خەرپوت و ئازەربایجان و دیاربەکر}ی دەگرتەوە بەلآم ئەم جۆرە سیاسەتەو ئەم شێوازە داواکارییە کورد و نوێنەرەکەی دڵگرانکردبوو, بۆیە هەوڵێکی زۆر درا ئەو داوایە لەمێشکی ئەرمەنەکان بسڕنەوە چونکە ئەوە لەبەرژەوەندی کورد و ئەرمەندا نیە ئەمە فیتی دوژمنی هەردوولایانە,

ئەوەش لەئەستۆی کەسێکی بەتوانای وەك شەریف پاشابوو تاهەوڵبدات ئەو پلانە گڵاوە دەسکردە لەمێشکی ئەرمەن دەرکات,هەربۆیە لەرۆژی ١٩١٩\١٢\٢٠ڕێکەتنێکی دووقۆڵی لەنێوان نوێنەری کورد شەریف پاشا و نوێنەری ئەرمەن بوغزنۆبارپاشا مۆرکرا و وەجێگری سەرۆك کۆماری ئەرمینیا {د.هـ.ئۆهانجانیان}وەك چاودێر لەو دانیشتنەدا بەشدار بوو,لەواقیعدا ئەمەیەکەم جار بوو کەلەنێوان هەردوو میللەتی کورد و ئەرمەن بەڵگەنامەیەکی هاوپەیمانی ئیمزاکرا,ئەوەشی گرنگ بوو لەم یاداشتەدا هەردوو شاندەکە بەسەرۆکی کۆنگرەیان ڕاگەیاندبوو کەلەنێوان کورد و ئەرمەندا هیچ جۆرە کێشەو گیروگرفت و ئاژێشەیەك لەئارادا نیەو ئەوەشی بمێنێتەوە سەبارەت بەدیاری کردنی سنورەکانی نێوان کوردستان و ئەرمینیا دواتر بۆخۆیان چارەسەری دەکەن

,لەمەوە دەگەینە ئەو ڕاستیەی کەهەردوولا هەستیان بەمەترسی ناحەزان و دوژمنانیان کردبوو کەدەست بخەنەکارەکانیان و ئاژاوەیەکیان بۆدروست کەن,

ئەم پەیمانەش بۆئەوە بوو کە کێشەلەنێوان کورد و ئەرمەن دروست نەبێت و شەریف پاشا لەگەڵ نوێنەری ئەرمەنەکان کۆبویەوە و پاش ئەم کۆبونەوەیەش نوێنەری ئەرمەنەکان لەدروستکردنی ئەو دەوڵەتە پەشیمان بویەوە و داواکاریەکی هاوبەشیان لەگەڵ کورد بەرز کردەوە بۆکۆنگرەی ئاشتی,لەڕاستیدا ئەوە بوارێکی گرنگی بۆ دۆستایەتی و هاوکاری نێوان کورد و ئەرمەن دروستکرد,ئەوەی گرنگەبوترێ ئەوەیە ئەو بەیانەی ئەو دوونوێنەرە هاوبەشە ئاراستەی کۆنگرەیان کرد دەنگو سەدایەکی باشی لەوناوەوەی کوردستان و ئەرمینیا و لەناو کۆنگرە و لەسەر کاربەدەستان و حکومەتی تورکیاش هەبوو وە دەسەلأتدارانی تورك پێی حەپەسان تێیدا هاتبوو(ئێمە بەیەکەوە بەڕێکەوتنێکی تەواوەوە داوا لەکۆنگرەی ئاشتی دەکەین بەپێی بنەماکانی نەتەوایەتی مافی سەربەخۆیی بەئەرمینیایی یەکگرتوو و کوردستانێکی سەربەخۆ بدەن),حەپەسانەکەی تورکیش بۆ ئەوەبوو چونکە لەمێژبوو زۆر بەخراپی و بەشێوەیەکی هەڵواسراو باس لەخراپی پەیوەندی ئەو دوونەتەوە هاوستەم لێکراوە کرا بوو, وە هەرگیز چاوەڕوان شتێکی لەو جۆرەنەبوون وابەئاسانی کورد و ئەرمەن پێك بێنەوە پێکەوە بەهاوبەشی داوای مافەڕەواکانی خۆیان بکەن,لەگەڵ ئەوەی شەریف پاشا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لەچارەسەرکردنی کێشەهەڵواسراوەکان و بوختانە نارەواکانی نێوان ئەو دوونەتەوەیە.

بەلأم دیسان نەهامەتی کورد دەستی پێکرد و ئەوانەی ئەم کۆنگرەیەیان بەڕێوە دەبرد دانیان نەنا بەوەی کەشەریف پاشا نوێنەری کوردەو وەئەو یاداشتانەی ئەو دەیگەیاندە کۆنگرە کاریگەریەکی وایان نەبوو,چونکە ئەمەش

بەهۆی سیاسەتی ئەوان لەلایەك و لەیەكی تریش پاڵپشتیەكی نێودەوڵەتی بەهێزی نەبوو ئەمانەو چەندان فاكتەری تر بویە هۆی ئەوەی شەریف پاشالەڕۆژی ١٩٢٠\٤\٢٧دەست لەكاری نوێنەری بكێشێتەوە,بەلأم شۆڕسواری كورد جارێكی تر ویژدانی قبوڵی نەكرد لەپێنا مافەڕەواكانی میللەتەكەی تێ نەكۆشێ و ئەوئەركە لەئەستۆ نەگرێ بۆیە دیسان لەڕۆژی ١٩٢٠\٥\١نوێنەری كورد جەنەراڵ شەریف پاشا سكالأنامەیەكی بەناوی كورد ئاراستەی كۆنگرەی ئاشتی كرد و هەمیشە لەخەمی نەتەوەكی بوو,بەلأم بارودۆخ بەوشێوەیە مایەوە تابەستنی پەیماننامەی سیڤەر.

ئەوەبوو لەو سەروەختەشدا هێزە سەركەوتەوەكانی شەڕ پەیماننامەی سیڤەریان ئیمزاكرد,ئەمەش لەڕۆژی ١٩٢٠\٨\١٠لەلایەن چواردە دەوڵەتەوە بەسترا ولە١٣ بەش و ٤٣٣ مادەشی لە خۆدەگرت, وەلەوێدا كێشەی كورد پانتاییەكی باشی وەرگرتبوو،ئەوەی گرنگە لەم پەیمانەشدا نوێنەرانی كورد و ئەرمەن بەشداریان كرد و تاڕدەیەك گوێ لەم نوێنەرانە گیرابوو,لەواقعیدا ئەم پەیمانە تەنیا مەرەكەبی سەركاغەزبوو,بەلأم تاڕادەیەك ڕێژەی بەرژەوەندی پێكهاتە ئەتنیكیەكان ڕەچاوكرابوو,چەند مادەیەكی سیڤەر بۆنەتەوەكانی كورد و ئەرمەن تەرخان كرابوو,بەلأم بەتەواوی خواست و ئاوات و بەرژەوەندی ئەو دوو نەتەوەیەی نەهێنابەدی,چونكە وەك دەڵێن{پەیماننامەی سیڤەر بە مردووی لەدایك بوو}بەلأم لەچوارچێوەی ئەم پەیمانە مردووەدا دوو دەوڵەتی نیمچە سەربەخۆی كورد و ئەرمەنی دیاری كرابوو,

ئەوەی تایبەت بوو بەكورد لەمادەكانی {٦٢,٦٣,٦٤}پێك هاتبوو, ئەوەشی تایبەت بوو بەنەتەوەی ئەرمەن لەمادەكانی {٨٨,٨٩,٩٠,٩١,٩٢,٩٣}پێك هاتبوو, ناكرێت لێرەدا بەوردی ناوەڕۆكی مادەكان بخرێتە ڕوو,بەلأم دەكرێت

بڵێم ئەم مادانە بەشێوەیەکی مردوو لەنێو پەیمانە مردوەکەدا ناوهێنرابوون و وەك لاشەیەکی مردوو خرابوونە ڕوو, لەوەشدا ئەتاتورك ڕۆڵێکی بەرچاو و دیاری هەبوو, چونکەئەوان دژی هەموو ئامانج و ئاواتێکی ئەم دوو نەتەوەیە بوون,بەمەش سیڤەر نەیتوانی ئومێدەکانی گەلانی ژێردەستی عوسمانیەکان بهێنێتەدی و لەزوڵم و ستەم ڕزگاریان بکات و ئاشنایان بکات بەدەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان.

بەو شێوەیە سیاسەت و هەڵی تورکیای فاشست بەردەوام بوو لەسیاسەتی خرپی خۆی بەرمبەر هەریەك لەکورد و ئەرمەن و هەوڵدان بۆسرینەوەی نەتەوەی و دژایەتی کردنی کەلتورو فەرهەنگ و زمان ومێژووی ئەم دوونەتەوەیە و درستکردنی کۆسپ و لەمپەر لەڕێگەی سەرنەگرتنی پەیمانی سیڤەر, بۆیە سەرئەنجام بەیەکجاری پەیمانی سیڤەریان خستە نێو ئەرشیفی مێژوو و خەون ئاواتەکانی ئەو دوونەتەوە ستەم لێکراوەیان لەگۆڕنا, وەدواتریش پەیمانی {لۆزان}یان لە٢٢\تەمموز١٩٢٣ بەدوو قۆناغ هێنایەجێگەی,ئەمەش بویە هۆی بەهێزبون و دارشتنی بناغەی دەوڵەتی تورکی کەمالی و دواترکۆتای هێنان بەخەلافەتی عوسمانی, بەم شێوەیە دەوڵەتی تورکی عەلمانی کردە ئەمری واقیع و ئەرمینیای ڕۆژئاوای لەسەر جوگرافیا سریەوە و لەلایەکی تر لەسەرجەستەی ماند و شەکەتی کورد پایەکانی خۆیان بەهێزکرد, تەنانەت کەمالیە نەتەوەپەرستەکان و شۆڤێنیەکان هەر لەسەرەتای گرتنە دەستی دەسەلاتی سیاسی و سەربازی خۆیان,یەکەم ئامانجیان هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی سیڤەر بوو وەلەمەشدا سەرکەوتووبون و پەیماننامەی سیڤەریان بەمردووی خستەنێوگۆڕی هەتاهەتای, سەرە ڕای ئەوەش تورکیای کەمالی هەرگیز ڕازی نەبوو دان بەبنەمای نەتەوایەتی ئەو دوو نەتەوەدابنێت,بەلأم خۆشبەختانە دوای

ئـەو کۆنگرەیـە خـەباتی سیاسـی و سـەربازی کـورد و ئەرمـەن بـەردەوام بـوو زۆرجاریش هاوکاری و هەماهەنگی لەنێوانیان دروست دەبوو.

لەسەروو ئەو سیاسەتە خراپانەی ئەتاتورك لەهەمبەر کورد وئەرمەن پەیڕەوی دەکـرد هێـشتا تروسـکای هاوسـۆزی و هاوکـاری کـورد و ئەرمـەن هەربـەردەوام بوو,تەنانەت لەسەردەمی کۆماری تورکیادا قۆنـاغێکی تـری پەیوەنـدی دۆسـتانە بەشـێوەیەکی ڕەسمـی تـرو تونـدوتۆڵتر هاتەکایـەوە, ئـەوەبوو کەشۆڕشـەکەی {شـێخ سـەعید} سـەری هەڵـدا دژی سیاسـەتی تـورك و کـەمالیزم و هەڵوێستەخراپەکەیان لەو شۆڕشەشدا ئەرمەنـەکان دیسانەوە هاوکـاری کـورد و شۆڕشـەکەیان کـردەوە بەمـەش دیـسان لاپەڕەیـەکی پڕشـانازیان بۆخۆیـان تۆمارکرد,بەڵام سەرئەنجام کەمالیـەکان ئـەو شۆڕشـەیان سـەرکوتکرد و کەوتنـە وێزەی کورد و ئەرمەن و ڕاوەدوونانیان,ئەوەی گرنگە لێرەدا بۆ دیـرۆك بـوترێ و جێگەی شانازیمان بێت ئەو هەوڵ و ماندوو بونەی کەسایەتی کورد شەریف پاشا بوو کەلەناو نازو نیعمەتی خۆیدا کوردی لەیاد نەکرد و بەتەنگ کێشەی کوردەوە بـوو لەپێناوەشـدا مانـدووبونی زۆری چەشـت,بۆیـە نابێـت ئێمـەی کـورد ئـەو کەسـایەتیە کـورد پـەروەرەمان لەیادبـچێت, ئـەوەی گرنـە لێـرەوە لـەم قۆناغـە بەدواوە سەردەمێکی تر لەهاوکاری و هاوکۆمەکی و هاوسۆزی لـەنێوان کـورد و ئەرمـەن دەسـت پێدەکاتـەوە, ئەمـەش لەسـەردەمی کۆمەڵـەی {خۆیبـون} کەدەچێتە چوارچێوەی پەیمانێکی دۆستایەتی و ستراتیژی.

## دوستایەتی و پەیوەندی ستراتیژی کورد و ئەرمەن لە کۆمەڵەی خۆیبوندا

ئەگەر پەیوەندیەکانی پێشووی نێوان کورد و ئەرمەن پەیوەندیەکی خۆرسك بووبن یاخود سەرئەنجامی دۆخێکی تایبەتی بوبێت ئەوا پەیوەندیەکانیان لەسەرەتای سەدەی بیستەم و لەگەڵ گەلاڵە بوونی بزووتنەوەی سیاسی کوردی و بزووتنەوەی سیاسی ئەرمەنی کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەوپێشچوونی بەخۆیەوە دەبینی بۆیە پەیوەندیەکی سیاسی بتەو و ستراتیژی لەنێوان پارت و ڕێخراوەکانی کورد وئەرمەنی،لەنێو ئەم پەیوەندیە دیارانەدا پەیوەندیە دۆستانەکەی نێوان پارتی تاشناقستیۆن و پارتی یەکێتی شۆڕشگێڕی ئەرمەنی و پارتی خۆیبونی کوردی بوو کەلەدوای شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران دروست بوبوو.

دوابەدوای سەرکوت کردنی شۆڕشی {شێخ سەعیدی پیران}لەساڵی ١٩٢٥و لەسێدارەدانیان لەڕۆژی ٣٠\حوزەیرانی ١٩٢٥, لەپایزی هەمان ساڵدا لەخارپێت {٤٠٠}نیشتیمان پەروەری کوردیان لەسێدارە داو دواتریش لەناوچەیەکی سەربەبینگولیش {١٠٠}هاولاتی دیکەی کوردیان لەسێدارە داو هەڵیان واسین, تەنانەت لەو ڕۆژگارەشدا ڕۆژنامەی {وەقت}ی تورکی دەنوسێت{چیتر پرسی کورد لەئارادا نەماوە},

جگەلەوەش تورکە کەمالیەکان بەشێوازێکی زۆر توند و تیژو و دڕندانە لەدژی تاکەکانی کورد وئەرمەن هەڵسوکەوتیان دەکرد هەر لەو سەرو بەندەدا شێخ سەعید پێشبینی ئەوەی دەکرد تورکەکان هەوڵی بلاوبوونەوەی نائارامی و پشێوی دەدەن بۆ ئەوەی ناکۆکی بکەوێتە نێوان کورد و ئەرمەنەکان بەلام خۆشبەختانە پێچەوانەی خواستی تورکەکان ئەرمەنەکان هاوکاری شێخیان دەکرد بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ,تەنانەت لەکاتی شۆڕشەکەی

شێخ دا باشی پەیوەندی کورد و ئەرمەن بوون بەشاهید بۆ ئەو ڕۆژگارە،ئەرمەنەکان لەو ڕاپەڕینەدا بەشداریان کرد،بۆیە هەر لەسەرەتاوە شێخ سەعید فەرمانی بۆ هەموو لایەك دەرکرد کەبەهیچ شێوەیەك دەست درێژی نەکەنە سەر ماڵ و مۆڵکی ئەرمەنەکان چونکە شێخ هەستی بەوەکردبوو کە تورکەکان نیازیانە درزێك بخەنە دۆستایەتی کورد و ئەرمەنەوە،بۆ ئەو مەبەسە ئاگاداری بەهەموو کوردێکداکە(هەرکەسێك دەست درێژی بکاتە سەر ئەرمەنەکان ڕووبەڕووی توندترین سزا دەبێتەوە)ئەم فەرمانەی شێخ دەنگ و سەدایەکی باشی دایەوە لەنێوەندە کوردیەکاندا،بەڵام تورکەکان کەتنە بلاوکردنەوە ئەو سیاسەتەی خۆیان بۆ شێواندنی ڕاستیەکان و دژایەتی کورد و ئەرمەن. وەبەهۆی ئەو سیاسەتەڕەگەزپەرستیەی تورکەوە ژمارەیەکی زۆر لەئەرمەن کۆچیان کرد و خاکی خۆیان بەجێ هێشت,تەنانەت ژمارەی ئەو ئەرمەنە کۆچکردوانەی تورکیا لەنێوان ساڵانی{١٩٢١_١٩٢٥}گەشتە{٥٥٠٠٠}هەزارکەس,بەهۆی ئەم سیاسەتە خراپەی تورکەکەمالیەکان هەریەك لەکورد وئەرمەن ناچاربوون ڕێگەی هەڵهاتن بگرنەبەر,ئەوەبوو بەشێك لەڕوناکبیران و پیاوانی سیاسی کورد لەتورکیا هەڵهاتن و ڕویان کردە ناوچەقەڵەمڕەویەکانی فەرەنسا{سوریا و لوبنان} و قەڵەمڕەوی ئینگلیز{عێراق}لەوێدا خۆیان گرتەوە,بەهەمان شێوەش ئەرمەنەکان لەترسی گیانی خۆیان هەڵهاتبوونە ئەو نێوچانە,لەوکاتەدا ئەرمەنەکۆچکردوەکان و کوردەکان لەسوریا تازە پێکەوە دەژیان لەچوارچێوەی پەیوەندیەکی گەرم و گوڕداوەنزیکبونەوەیەکی باشتر لەنێوانیان هاتەئاراوە, دەمەوێ بۆدیرۆك ئەوە بڵێم ئەو سیاسەتە خراپەی تورکی فاشیست لەبەرامبەر هەریەك لەکورد و ئەرمەن پیادەی دەکرد سەرلەنوێ پەیوەندی ئەودوو نەتەوەیەی نوێ دەکردەوە و گیانی برایەتی بەهێز دەکردن و وای لێکردن سەرلەنوێ بەدوای پەیوەندیەکی باشترو

بەهێزتردا بگەڕێن, لەڕاستیدا هەڵهاتنی هەریەك لەکورد و ئەرمەن بۆئەو ناوچانە بوارێکی باشتری بەو دوو نەتەوەیەدا تادەروازەیەکی نوێتر و باشتر لەپەیوەندی لەدەرەوەی خاك و نیشتیمانی خۆیان بکەنەوە,ئەوەبوو{ ئەسکەندەر بەگ}پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەرمەن پێشخست لەسوریا و لوبنان و سەرلەنوێ پەیوەندیەکی باشتری ڕێکخستەوە,لەوسەرو بەندەدا بەهۆی سیاسەتی مەغۆل ئاسای تورکەوە نیشتیمانپەروەرانی کورد خۆیان ئامادەکرد بۆبەستنی کۆنگرەیەکی بەهێز,بۆیە بەنهێنی و ئاشکرا کۆڕو کوبونەوەیان ڕێکدەخست و سەرئەنجام گەشتنە ئەو باوەڕەی کەهەنگاوی یەکەمیان بنیاتنانی پارتێکی سەرەکی سیاسی کوردستانی بێت,ئەوەیان بۆڕوون بویەوە ئەگەر بەدەست و برد شتێك نەکەن ئەوا تورکەفاشیەکان کوردیش بەدەردی ئەرمەنەکان دەبەن,لەم کارەشدا ڕۆشنبیرێکی وەك(مەمدوح سەلیم) ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێرا لەم نزیك بوونەوەیەدا چونکە دۆستایەتی و پەیوەندیەکی باش و فراوانی هەبوو لەگەڵ کەسایەتیەکانی ئەرمەندا پارتی داشناکی ئەرمەنی بەهەولۆماندبوو بوونی ئەم دەزانن و دەست خۆشی لێدەکەن و لێرەوە گفتوگۆ و دانیشتن دەستی پێکرد، دای کۆبوونەوەی سەرانی کۆمەڵە کوردیەکان بڕیاریاندا کۆنگرەیەکی گشتی ببەسترێ بەناوی (کۆنگرەی نەتەوایەتی کوردی) بەهۆی ئەم پەیوەندیەی نێوان مەمدوح سەلیم و پارتی داشناکەوە لەلوبنان توانرا کۆنگرەیەکی نەتەوایەتی کوردی لەماڵی (واهان پاپازیان) لەشاری بمحدون لەلوبنان لەساڵی ١٩٢٧ ببەسترێ دای گفتوگۆ و دانیشتن توانرا بڕیار لەسەر دامەزراندی کۆمەڵەی خۆیبوون بدەن، ئەوەبوو لەڕۆژی ٥\١٠\١٩٢٧کۆنگرەی دامەزراندن دەستی پێکرد لەهاوینەهەواری {بمحدون}لەلوبنان,لەم کۆنگرەیەدا ژمارەیەك لەئەفسەر و کەسایەتی ناودار و هەندێك سەرۆك خێڵ و عەشیرەت بەتایبەت ئاوارەبوەکان

لەکۆنگرەیــەدا بەشــداربوون,لــەوەش گــرنگتر ســەرانی چــوارکۆمەڵەی کــوردی ئامادەبوون هەمویان بڕیاردەدەن خۆیـان هەڵوەشـێننەوە و لەچوارچـێوەی یـەك ڕێکخراودا واتە {خۆیبون} یەك بگرنەوە.

سەرئەنجام کۆمەڵەی خۆیبون دامەزرا,وەخۆیبـون لەیەکـەم کـۆنگرەی خۆیـدا چەند بڕیارێکی گرنگـی دا کەتێیـدا ئاماژەبەگـەلی ئەرمـەن دەکـات ئـەو بڕیـارەش لەشەش مادەیێك هاتبوو وە لەمادەی چوارەمدا دان بەهەموومافـەکانی ئەرمەنـدا دەنێت دەڵێت {پەسەندکردنی هـەموو ئـەو شـتانەی کەپەیوەنـدیان بەئەرمەنـەوە هەیە لەڕووی ئازادی و بیروباوەڕ و پەسەندکردنی جیاوازی و تێپەرکردنی ناکۆکی تــایفی و پتــەو کردنــی دۆســتایەتیان} ئەمــەش خــاڵێکی گــرنگ و پڕبایەخــە بۆئەرمەنەکان,بەم جۆرە سەرلەبەری کونگرەکە گیـانی برایـەتی کـورد و ئەرمـەن لــەخۆدەگرێت,لەڕاســتیدا دامەزرانــدنی ئــەو کۆمەڵەیــە لــەو ســەردەمەدا بەوەرچەرخانێکی دیار لەمێژووی ڕێکخراوە سیاسیەکانی کورد ئەژمار دەکرێـت و بایەخێکی گرنگ و دیاری هـەبوو لەمێـژووی کـورددا,لـەو واقعیـەدا سـەرکردایەتی خۆیبــون هــەوڵی ئــەوەی دەدا پەیوەندیــەکانی کــورد وئەرمــەن بــەهێزبکات و پێشنیاری ئەوی کـرد کەهـەردوو گـەلی بـرای کـورد و ئەرمـەن ناخۆشـی و ڕوداوە تراژیدیەکانی ڕابردوولەیاد کەن و لاپەڕەیەکی تازە لـەهاوکاری و لەیـەك گەشـتن لەنێوانیان بکەنەوە.

ئەمــەش بویــەهۆی ئــەودوو نەتەوەیــە ناکۆکیــە هەڵواســراوەکانیان لەیادکەن و لەسەر بنەمای نوێ لاپەڕەیەکی پڕ شانازی و دۆستایەتی و هاوکـاری بکەنەوە,لەوسەرو بەنـدەدا پـارتی داشـناك هـەوڵی ئـەوەی دا لەگـەڵ کوردەکـان خەباتێکی ڕزگاری هاوبـەش دەسـت پێبکـات, لـەو سـەروبەندەدا پەیوەندیـەکی دیاروبەهێز لەنێوان پارتی تاشناکی ئەرمەنی کۆمەڵەی خۆیبـونی کـوردی دەنگـی

هەبوو کە دوای شۆڕشی شێخ سـەعید دروسـت بـوو ئـەم پەیوەندیـە دۆسـتانەش لەئەنجامی کۆمـەڵێك دانیشت و بەیـەك گەشـتنی نوێنـەری کـورد وئەرمـەن بـوو لەکوردستان و تاراوگە هاتەبوون.

لەبەر ئەوە لەدامەزراندنی خۆیبوندا دا ئـەو پـەڕی هاوکاری و هەماهـەنگیان نیشاندا, وە سەر ئەنجام خۆیبـون ئـارەزوو مەنـدی ئـەوە بـوو کەهاوپەیمانیـەك لەگەڵ پارتی داشناکی ئەرەمەنی ببەستێت,ئـەوەبوو لەسـاڵی ١٩٢٧واتـە هـەمان سـاڵ خۆیبـونی تیـا دامـەزرا هـەردوو پـارتی داشـناکی ئەرمـەنی و خۆیبـون پرۆتۆکۆڵێکی هاوکاریان مۆرکرد,ئەمەش بەئامادەبونی چەندین کەسایەتی کـورد وەك{عەلی ڕەزا و مستەفاشاهین بەگ و جەلادەت بەدرخان و حاجۆ ئاغا و ئەمین ئاغا وکەریم ڕۆستەم و مەمدوح سەلیم و شوکری سـەکبان} و وەئەرمەنـەکانیش بەئامادەبونی {واهـان پاپازیـان } بەشداریان کـرد, ئەمـەش نوێنـەرو بەرپرسـی پارتی داشناکی ئەرمـەنی بـوو,لـەم پەیمانـەدا ئامـاژە بەخواسـتە هاوبەشـەکان و سـەربەخۆی سیاسـی و خواسـتەنەتەوەییەکانبان کرابـوو,لـەپێناو دابینکردنـی بەرژەوەنیـەکانی هــەردوو گــەلی ئــاری و وەپێویستیــشە پەیوەنــدی برایانــە بێتـەئاراوە,ئـەم پەیمانـەی نێـوان ئـەو دوو نەتەوەیـە لـە١٩ مـادە پێکهـاتبوو, لەمادەکانیـشدا زیـاتر گوزارشـت لـەهاوکاری و سـەربەخۆی و یارمـەتی هاوبـەش دەکات و تەنانەت لەمادەی پێنجەمدا پارتی شۆڕشـگێڕی ئەرمـەنی بـەڵێن دەدات کەدامودەزگاکانی خۆی لەئەمریکاو ئەوروپابخاتە خزمەت ناساندنی دۆزی کورد و پوچەڵکردنەوەی پروپاگەندەی تورکی کەمالی دژی کورد,

وەلـەمادەی شەشـەمدا داشـناك بـەڵێن دەدات لـەڕووی دارای یـەوە یارمـەتی خۆیبـــون بـــدات و لـــەمادەی دەیەمـــدا پـــارتی نـــاوبراو بـــەڵێن دەدات لەچالاکیەســـەربازیەکاندا لـــەڕووی ئازوقـــەو جبەخانـــەوە هاوکـــاری خۆیبـــون

بکات,جگەلەوانەش لەمادەی پانزەیەمدا باس لەوە کراوە ئەگەر هەرناکۆکیەك لەنێوانیان هاتەئاراوە ئەوا دەبێت بەگفتوگۆچارەسەری بکەن و نابێت لەچوارچێوەی ئەو پەیمانە دەرچن,ئەمەش ناوەڕۆکی هەندێك لەمادەکانی پەیمانەکەبوو,لەڕاستیدا دەبێت بۆ مێژوو ئەوەبلێم پەیمانی نێوان داشناك و خۆیبون بەوەرچەرخانێکی نوێتر لەپەیوەندیەکانی کورد و ئەرمەن لەقەڵەم دەدرێت,پێشتر لەقۆناغی یەکەمدا پەیوەندی ڕەسمی یان خۆرسك دەستی پێکرد بەلأم لەقۆناغی دووەمدا بەهۆی ئەم پەیمانەوە پەیوەندی هەردوو نەتەوە بەئاراستەی پەیمانی ستراتیژیدا ڕۆشت سەرەڕای ئەوانەش هەرچەندە خۆیبون لەلایەن کوردەکانەوە پێك هاتبوو بەلأم یارمەتی دانی ئەرمەنەکانیش بۆ هاوکاری کردن لەگەڵ کوردەکان لەچالاکیەکانی خۆیبوندا ئەمەکارێکی زۆر گرنگ و پڕبایەخ بوو,وەڕۆڵێکی زۆرباشیان هەبوو بۆ ئەوەی خۆیبون بتوانێت پەیوەندی بەزۆر شوێنی جیهانەوە بکات,بەتایبەت لەگەڵ کوردە ئاوارەکانی ئەمریکاوفەرەنسادا,بەم شێوەیە کوردەکان توانیان لەڕێگەی ئەرمەنەکانەوە دەروازەیەکی دیبلۆماسی و گرنگ بەڕووی خۆیاندا بکەنەوە چ لەدەرەوە و چ لەناوەوە,ئەوەبوو {سورەیابەدرخان} لەگەڵ{گریگۆر ڤارتانیان}کەڕابەرێکی چالاکی ئەرمەنی بوو,چونە ولأتەیەکگرتوەکانی ئەمریکاو وەلەگەڵیدا چوەتە لەندەن و ڕۆما و ئەسینا و پاریس.

هەرلەو ڕێگەیەشەوە ئەرمەنەکانی ولأتەیەکگرتوەکان یارمەتی و پیتاکەکانی خۆیان دەگەیاندە خۆیبون ,سەیر لەوەدا بوو کوردەکان کەژمارەیان لە{١٠_١٥}هەزارکەس دەبوو سالأنە پەنجا تا شەست هەزار دۆلاریان کۆدەکردەوەو بەو پەڕی کورت بینیەوە دەیان دایە کەمال ئەتاتورك پێدەچێت ئەمەش بەهۆی نەبوونی وشیاری ە هەستی نەتەوەی بوبێت,

بەلآم خۆشبەختانە لەرێگەی سورەیا و ڤارتانیان بەهەولۆماندوبونی ئەوان ئەو کوردانەیان ڕازی و وشیارکردەوە کە ئەو برە پارەیە پێشکەش بەخۆیبون بکەن ئەوانیش بەمە ڕازی بوون,لێرەوە کورد توانی جارێکی دی هاوکاری و دۆستایەتی ئەرمەنی لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەشی هەردوو نەتەوە بەدەست بهێنێتەوە,ئەرمەنەکانیش لەناوەندی نێوان خۆیبون و ولآتاندا ڕۆلێکی دیاری هەبوو تەنانەت ڕۆژنامەگەری ئەرمەنی هەنگاوێکی گەورەی هاویشت لەولآتانی ئەمریکا و ئەورووپادا ئەوترسەیان خستە ڕوو کەلەتورکیا ڕووبەڕووی نەتەوەی کورد دەبێتەوە ئەمەش خاڵێکی جەوهەری و گرنگە کە ئەرمەنەکان سەرەڕای ئێش و ئازار و جەستەی بریندارى خۆیان کەچی لەو قۆناغەشدا ئێش و ئازاری کوردیان لەیاد نەکردبوو وەبەتەنگ خەمی کوردەوە بوون.

هەرلەو ڕوانگەیەشەوە زنار سلوپی دەڵێت{لەو ڕۆژانەدا کورد پێویستی زۆری بەهاوکاری و دۆستایەتی ئەرمەن هەبوو چونکە کورد وەك ئەرمەن ئەو توانایەی نەبوو دەنگی بێزاری خۆی و باسی شۆڕش و ئامانجەکانی بگەیەنێتە ولآتان}, لەلایەکی تر نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت پارتی داشناك کەپشتیوانی لەخیبون دەکرد لەبەر ئەوەبوو ئەوان لەتورکیادا نەیان دەتوانی بەتەنیا هیچ جۆرە جولآنەوەیەك بکەن و وەدەیان ویست سوود لەڕاپەڕینی کوردان وەرگرن دژی حکومەتی دیکتاتۆری تورکی کەمالی کەبەدوژمنی سەرسەختی هەردوولایان دەزانین,لەمەوە ئەوەمان بۆڕوون دەبێتەوە کەهەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن لەڕۆژە سەخت و دژوارەکانیشدا هەرپێویستیان بەیەك بوەو هاوکاری یەکتریان کردوە.

بەم شێوەیە ڕێبەرانی تازەی خۆیبون دێنە سەر ئەوەی کەهەموو بەدحاڵی و ساردوسڕیەکی نێوان ئەم دوونەتەوەیە بەیەکجارەکی حەل و فەسڵ کراوە و

شتێکی وا لەئارادا نەماوە شایەنی باسکردن بێت,بێگومان ئەم هاوکاری و پێکەوە ژیان و دۆستایەتیە لەنێوان ئەم دوو نەتەوەیە بەشێوەیەکی زیندو کاریگەر هەتا نسکۆی شۆڕش و تەنانەت دوای شۆڕشیش هەربەردەوام بوە,وە کاتێك شۆڕش دەستی پێکرد ئەرمەنەکان لەسەر هاوکاری و یارمەتی خۆیان بەردەوام بوون, بەتایبەتی ئەرمەنەکان لەتەورێز کارخانەیەکی بچوکی چەك و فیشەکی سەربازیان رێکخست و بە بەردەوامی فیشەك جبەخانەیان دەنارد بۆ فیداکارانی چیای ئاگری و هاوکۆمەکی شۆڕشگێڕانیان دەکرد ئەوە بۆ هەموو لایەك روون بویەوە بەهەڵگرسنانی شۆڕشی ئاگری ئەوە بویە خاڵێکی وەرچەرخان لەپەیوەندیەکانی کورد و ئەرمەن جگە لەوەش پارتی داشناکی ئەرمەنی لەشۆڕشی ئاگری بەشداریەکی تەواوی هەبوو تەنانەت (رۆبین پاشا) سەرکردەیەکی تاشناکی بوو لەهەوڵی بەدەست هێنانی پشتوانی بەریتانا و ئێران بوو بۆ کوردەکانی تورکیا لەهەوڵی پەیداکرنی چەك و تفاقی ئێرانی بوو بۆ کوردەکان, تەنانەت دوای شکستی شۆڕشی ئاگری لەساڵی ۱۹۳۰داشناك لەکۆنگرەی {سۆسیالیست ئینتەرناسیۆناڵ}دا بەشدار بوو کەلەرۆژی ۳۰\ئابی۱۹۳۰لەسویسرا بەڕێوە چوو,لەڕاستیدا بەپێی داواکاری داشناك لەو کۆنگرەیەدا مادەیەکی کۆنگرەکە باس لەکوشتاری کورد دەکات کە بەدەست تورکەکان کراوە,وە وتراوە تورکەکان دەیانەوێت ئەوەی بەسەر ئەرمەنیانداهێناوە بەهەمان شێوە بەسەرکوردیشدا بهێنن, ئەمەیە هەڵویستی جوامێرانی ئەرمەنی برای کورد کەلەدەرەوەش لەخەم و ئازاری کوردا بوون,لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا دوای شکستی شۆڕشەکە ئەرمەنەکان بەوەفابون وپابەندبوون بەوپەیمانەوە وپشتی کوردیان بەرنەداو درێژەیان بەهاوکاریەکانیان دەدا,هەرئەمەش وای لەکەسایەتیەکی وەك زنار سلوپی کردبلێت{بەڕاستی

ئەرمەنەکان پابەندبوون بەبەڵێنەکەیان و چی کەوتە ئەستۆیان دریغیان نەکرد,تەنانەت لەچاپکراوەکانیشیاندا بەرگریان لەپرسی کورد دەکرد}

سەرئەنجام پەیماننامەی نێوان ئەم دوو نەتەوەیە گرنگی و بایەخی مێژووی خۆی هەبوو,گرنگیەکەشی لەوەدا بوو کەتائەو سەردەمەش هەندێك ئەرمەنی توندڕەو هەبوون پڕوپاگەندەیان لەدژی کورد دەکرد,بەلأم دوابەدوای ئەم پەیمانە ئەرمەنەکان بەیەکجاری بڕیاردەدەن کەبەهەمووشێوەیەك واز لەوپڕوپاگەندەکانیان لەدژی کورد بێنن و وەبەدەم کێشەی کوردەوەبن ئەمەلەلایەك و لەلایەکی تریش ئەم پەیمانە لەئاستی دەرەوە ناوەوەش گرنگی مێژووی هەبوو,لەڕووی ناوەوە هەردوولا بەتەواوی کەوتنە هاوکاری یەك و لەپێناو دابین کردنی بەرژەوەندیەهاوبەشەکان تێکۆشان و بەتەواوی چارەسەری کێشەو ئاریشە هەڵواسراوەکانیان کرد و لاپەڕەیەکی پرشنگداری پڕشانازیان بۆ هەردوو نەتەوە تۆمارکررد و یەکێتی و دۆستایەتی و پەیمانی نێوانیان پاراست و دژی دوژمنی خۆیان و پڕوپاگەندە هەڵواسراوەکان بوون جگەلەوەش ئەرمەنەکان بەتەواوی وازیان لەخەونی دروستبونی دوڵەتی گەورەی ئەرمەنی هێنا لەسەرخاکی کوردستان, وەلەئاستی دەرەوەش ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو بەوەی کەلەڕێگەی ئەرمەنەکانەوە دەنگی کوردەکانیان گەیاندە دەرەوە و سەرنجی کوردان و ئەمەنی دەرەوەیان بۆ کۆمەڵەی خۆیبون ڕاکێشا,وەلەڕووی هاوکاری و هاوسۆزیەوە لەدەرەوە بەرگریان لەپرسی کوردەکان دەکرد و لەلایەکی تریش کوردیان بەبێتاوان ناو دەبرد و ئەوەشیان ڕاگەیاند کەتورکیای کەمالی دژی کورد و شۆڕشەکەیەتی بەمەش ئەم پەیمانە سەلماندی کورد و ئەرمەن دۆستی یەکن و وەپەیوەندیەکی ستراتیژی لەنێوان ئەوە دوو نەتەوەیەدا هێنایەبوون,ئەم پەیمانە هەتا دوای کۆمەڵەی خۆیبون بەردەوام بوو, وەهەتا ئەمڕۆش هیچ جۆرە کێشەو

گیروگرفتێك لەنێوان ئەو دوونەتەوەیەدا ڕووی نەداوە شایەنی باسکردن بێت و لاپەڕەکانی مێژوو شتی وای بۆ تۆمارنەکردوین و شایەتحاڵی ئەو ڕووداو و سەردەمەن سەرای ئەوەش ئەم پەیمانە ڕەنگدانەوەیەکی باشی لەسەر دوارۆژی پەیوەندیەکانی کورد و ئەرمەن هەبوو تەنانەت تائەم سەردەمەش بەشی کوردی لەڕادیۆکانی یەریڤانی ئەرمەنی دانراوە هەواڵ و گۆرانی کوردی لێدەدەن و گرنگی بەکەلتورو فەرهەنگی کوردی دەدرێت و پەیوەندەکان بەتەواوی ئاساین و هەردوولا گرنگی بەیەك دەدەن..لەکۆتایدا بەهیوای ئەوەی تونیبێتم سەرە داوێکی ڕاستیەکانم بۆ خوێنەرانی کورد ڕوون کردبێتەوە و ئاشنام کردبێتن بەڕاستیە مێژووییەکان.

وە دەکرێت بۆ مێژوو ئەوە بڵێین شۆڕشی ئاگری ڕەنگدانەوەی باش و بەرچاوی هەبوو لە پتەوکردنی پەیوەندیەکانی نێوان کورد و ئەرمەن کەبویە مایە ئیمزاکردنی پەیماننامە دوقۆڵیەکانی نێوانیان.

## ئەنجام

لەئەنجامی ئەم کورتە توێژینەوەیەدا گەشتینەوە ئەوەی کەبڵێین نەتەوەی کورد و ئەرمەن دوو نەتەوەی ئاری هیندۆ ئەوروپاین و دوو نەتەوەی دۆست و هاوکاری یەك بوون،لەزۆریەی کات و قۆناغەکانی مێژوودا ئەمانە دۆست و هاوکار و هاوخەمی یەکتربوون و پیوەندیەکی کۆمەڵایەتی باشیان هەبووە، بەهۆی نزیکیان لەیەکدیەوە لەزۆریەی زۆری ڕووداوەکانی مێژوویاندا هاوبەش و هاوئازاربوون ئەمەشە بوەتە هۆی ئەوەی هەردوولا بونەتە خاوەن یەك چارەنوس و یەك هەست،لەسەردەمی دەوڵەتی مادەوە بگرە تاسەردەمەکانی بەدرخان پاشا و شێخ عوبەیدولاّ و شێخ سەعیدی پیران و کۆمەڵەی خۆیبون ئەمان

هاوکاری یەك بوون و کوردەکان ئەرمەنەکانیان پاراستوە و لەمردن ڕزگاریان کردوون.

دەبێت ئەوەش بخرێتە ڕوو مەحاڵە لەمێژوودا دوونەتەوەی هاوسنور و دراوسێ هیچ کات ناخۆشی شەڕیان لەنێواندا نەبوبێت و لەیەکتریان نەکوشتبێت ئەمانیش بەهەمان شێوە دوچاری ئەوەبوون بەڵام ئەمانە هیچی بەخواستی خۆیان نەبوە بەهۆی فرت وفێڵ و هاندانی ناحەزانی هەردوو نەتەوەی کورد و ئەرمەن بووە،بەڵام خۆشبەختانە ئەمان بەهۆی کەسی سیاسی و شارەزایانی هەردوولا هەر زوو توانیان ئاشتی برایەتی لەنێوان خۆیان بچەسپێنن و پشت لەهەموو ئەو ناخۆشیانە بکەن کە بەفیتی دەوڵەتی عوسمانی توشیان هات, وەمێژوونوسانی هەردوولا شایەتی ئەم ڕاسیەن کە چۆن ئەم دوو نەتەوەیە ئاواتەخوازی ئاشتی و پێکەوە ژیانی دۆستانە بوون، وەکەسایەتی سیاسی هەردوولا وەك شەریف پاشا و بوغزنۆبارپاشا چۆن پێکەوە شان بەشانی یەکتر لەهەوڵی بەدەست هێنانی مافەکانی ئەم دوو نەتەوەیەبوون پێکەوە یادشتیان پێشکەش بەکۆنگرەی ئاشتی پاریس دەکرد.

لەڕاستیدا کۆمەڵ کوژی ئەرمەن هەروا کارێکی عەفەوی لەخۆوە نەبووە بەڵکو ئەمە پلانێکی بەرنامە بۆ دارێژراو بوو هەرلەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدەوە هەتا دوای جەنگی یەکەمی جیهانی هەموو دەسەڵاتداران وەك ئایدیاوشارێگەیەك لەسەری دەڕۆشتن،سەر ئەنجامیش مێژوونوسانی ئەرمەن ئەوەیان بۆ هەموو لایەك ڕوونکردوەتەوە کەوا کورد بێلایەن و بێبەریە لە کۆمەڵکوژی و کوشتاری ئەرمەن و ئەموو ئەوتاوانە قێزەونە دەخەنە ئەستۆی دەڵەتی عوسمانی سوڵتانەکانی و سەرانی ئیتحادوتەرەقی تورکی،سەرئەنجام ئەم دوو نەتەوەیە جارێك بەناوی ئاین و جارێك بەناوە کورد بوون یان ئەرمەنی بوون دووچاری

مـالّوێرانی بـوون جگەلـەوەش پەیوەنـدی وخاڵەهاوبەشـەکانیان زۆر لەخاڵــە ناکۆکیەکان زیاترە.

ئەمە ڕاستی ئەو بابەتەبوو کەلای من گەلاڵەبوو توانیم بەپشت بەستن بەڕای مێژوونوسانی بێلایەن و مێژوونوسانی خودی ئەرمەنەکان بیسەلمێنم کە کورد بێتاوانە لەکوشتاری ئەرمەنەکان.

## پاشکۆ





شەریف پاشا بوغزنۆبارپاشا
نوێنەری کورد و ئەرمەن لەکۆنگرەی ئاشتی

# ئارنۆڵد توێنبی...مێژوونووسی فەیلەسووف

## (١٨٨٩-١٩٦٧)

و. لە عەرەبیەوە: ئارام حەمید

### ١- پێشەکی:

### أ/ژیاننامەکەی و بەرهەمەکانی:

ئارنۆڵد جۆزێف توێنبی لە ١٤ی نیسانی ١٨٨٩ لە شاری لەندەن لەدایکبووە. زانکۆی ئۆکسفۆردی تەواوکردووە دواتر بووە ئەندامێك لە شاندی بەریتانی بۆ کۆنگرەی ئاشتی کە لە شاری پاریس ساڵی ١٩١٩ گرێدرا ، پاشان بۆ جاری دووەم بۆ کۆنگرەی ساڵی ١٩٤٦بەشدار بوو. ئەم بەشداریکردنە کردەییەی توێنبی لە کاروباری سیاسەت و کۆمەڵگادا، سەرباری پسپۆڕییە زانستی و ئەکادیمیە وردەکەی، بووە هۆی زیادکردنی زانیاری و ئاگاداریەکی قوڵ و فراوان بە گۆڕانکاریەکانی شارستانیەت و مێژوو. پێش ساڵی ١٩١٩، توێنبی پتر لە پانزە ساڵی لە لێکۆڵینەوەی زمانی لاتینی و ئادابەکانی بەسەربرد و پتر لە دە ساڵیش لە توێژینەوەی زمانی یۆنانی، ئەوەبوو لەلایەك زانیاری و ئاشنایەتیەکی فراوانی پەیداکرد و کە بووە هۆی ئەوەی دوورخستنەوەی هزر و بیری لە تەڵەکانی دەمارگیری کە زۆرێك لە مێژوونووسانی شارستانیەتەکان لە رۆژئاوا و هی دیکەش تێیکەوتن. لە نێوان ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٥ بووە مامۆستای زمان و ئادابەکان لە شارستانیەتەکانی بیزەنتی و یۆنانی لە زانکۆی لەندەن، بەر لەوەی بچێتە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا وەك راوێژکارێك تا کاتی خانەنشین بوونی لە ساڵی ١٩٥٥.

تۆینبی،ژمارەیەکی زۆر لە کتێب و توێژینەوە و وانەی زانکۆیی لـە بوارەکـانی مێـژوو و شارسـتانیەتەکان جێهێـشتووە، کـە دەریانخـست تـا چـەند خـودان بنکەیەکی زانیـاری مێـژوویی فـراوان و دەوڵەمەنـد بـووە کـە بـووە هـۆی ئـەوەی (تۆینبی) فەلسەفە و تێروانینی خۆی بـۆ مێـژوو و شارسـتانیەت بنیـات بنێـت و، دەریانخست تا چەند خاوەن پەیڕەو و ڕێبازێکی زانستی ورد بـووە کـە هەمیشە دامەزرا بوو لە سەر راستیەکان و بینین و سەردان و بەڵگـە و بەراوردکردنـەکان و لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە دوور لە گریمان و ڕا و بۆچوونەکان -ئەوەش زۆرە لە مێـژوودا- کـە لـە حـەز و ئـارەزوو یـان دەمارگیرییەکـەوە دەردەچێت و، هـیچ بەڵگەیـەکی زانـستی بـاوەڕپێکراو نییـە لەسـەر کـۆنیی و مێژووییەکـەی و یـان زانـستییەکەی. بەرهـەمی ئینـسکلۆپیدیاکەشی (توێژینــەوەی مێـژوو-دراسـة التـأريخ) وەك گـەورە و گـرنگترین بەرهەمـەکانی دادەنرێـت بـە هـۆی گـەورەیی قەبارەکەی و زۆری بەشەکانی، کە لە ٦٠٠٠ لاپەڕە تێپەڕی کردووە، کـە ژمـارەی وشەکانیشی بە پتر لە ٢٠٠٠٠٠٠ وشە ئەژمار دەکرێت، پێرستەکانیشی کە پـتر لـە ٣٠٠ لاپەڕەی گرتووە و ١٩٠٠٠ زاراوە و پێناسەی لەخۆگرتووە. دواجاریش بەهۆی دەرەنجـام و لێکۆڵینـەوە و راڤـەکردن و تیۆرەکانیـەوە بـە گـرنگترین سەرچـاوە ئەژماردەکرێت لە بواری فەلسەفەی مێژوودا.

ب/ پـەیڕەو و ڕێبـازی تـۆینبی: تـۆینبی لـە مێـژووی سـەدان کۆمـەڵگای کۆڵیوەتـەوە، گـەورە و بـچوکیان، دەیـان شارسـتانیەتەکان، کۆنیـان و نوێیـان، گەیشتە ئەو رایەی کـە تـرازان و ئینجـا لەناوچـوون -وەك دامـەزراوە و قـەوارە- چارەنووسی زۆربەی ئەو شارستانیەتانە بووە کە بینیونی، بۆیە دەبوایـە بگەینـە ئـەو دەرنجامـە کـە لـێکترازان ئینجـا لەناوچـوون، بـەو مانایـەی دیتمـان،

چارەنووسێکە دەرباز بوون لێی نییە بۆ هەر شارستانیەتێك. لە نێویشیاندا شارستانیەتی رۆژئاوایی، بۆیە دەبوایە پرسیاربکەین:

*نهێنی لەوەدا چییە؟

*هۆکار و فاکتەرەکان چین؟ بۆچی ئەوە روویدا؟

*ئەو یاسایانە چین بە شێوەیەکی گشتی هەڵکشان و مردنی شارستانیەتەکان راڤە دەکەن؟

بۆ ئەوەی لە بەشەکان تێبگەین پێویستە یەکەمجار سەرنجمان بخەینە سەر هەموو بەشەکان، هەموو گۆرەپان و بواری توێژینەوەی رەخساو و لەبار بۆ تێگەیشتن و حاڵیبوون. ئەوە ئەو پرەنسیپە بنەرەتیەیە لە پەیرەو و رێبازی تۆینبی بۆ مێژوو، و هەڵکشانی شارستانیەتەکان پاشان لێکترازانیان و لەناوچوونیان.

تۆینبی دەیان نموونە لە شارستانیەتە کۆن و دێرینەکان یان نوێیەکان پێشکەش دەکات، لە نێویشیاندا مێژووی شارە دێرینە سەربەخۆیەکانی یۆنان لە ماوەی هەر چوار سەدەی نێوان ٧٢٥ پ.ز–٣٢٥ پ.ز، وەکو نموونەیەك بۆ بیردۆزەکەی: ((ئەو کۆمەڵگەیەی کە ئەم شارە گەورانە ئەندام بوون تیایدا، دوای سەرەتای ئەو ماوەیە،رووبەرووی کێشە و گرفتی فشاری دانیشتوان بویەوە لەسەر هۆکارەکانی ژیان و گوزەران کە گەلان و میللەتانی هیللینی لەو سەردەمەدا دەستیان دەکەوێت، هەروەکو دەردەکەوێ لە یەك تاکە رێگا ئەویش چاندنی هەندێك بەرووبوومی دیاریکراو بەرهەمەکەی تەرخاندەکرێت بۆ بەکارهێنانی خۆجێی)).

دانیشتوانی شارگەلێکی وەك (کۆرنت) و (خالپیس) ئەم ئاستەنگەیان چارەسەرکرد بە رەوانەکردنی دانیشتوانە زیادەکەی لە رێی دەریاوە بۆ زەوی و

شوێنگەلێکی نوێ لە دوورگەی (سقلیە) و باشووری ئیتالیا وەی دیکە، ئەوەبوو تێیدا نیشتەجێبوون و چەندین جێنشینگەیان تێدا بنیاتنا. ناوچەی (ئەسپارتە)ش گرفتەکەیان چارەسەرکرد بە تێرکردنی برسێتی دانیشتوانەکەی بۆ داگیرکردنی زەوی و خاکی دراوسێکانیان بەهێزی سەربازی، بووەهۆی هەڵگیرسانی ئاگری شەڕ وجەنگ کە دەیان ساڵی خایاند. ئەوەش ناچاریکردن چەشن و شێوازی ژیانی خۆیان بە تەواوی بگۆڕن و ئاراستەکردنی بۆ خواست و ئارەزووی تەواوی سەربازی، بۆیە وردەوردەدەستی لەچەندین دەستکەوتی دیاریکراو هەڵگرت بۆ بەرژەوەندی رێکار و سیستمەکانی خۆپڕچەککردن وسەرباز کۆکردنەوە. شاری (ئەسینا)ش کێشەوگرفت وئاستانگەکەی بە شێوەیەکی جیاواز چارەسەرکرد. بەروبوومە کشتوکاڵییەکەی چەندینجار زیادیکرد و، هانی هەندێك پیشەسازی خۆجێیدا بۆ مەبەستەکانی هەناردەکردن و ئاڵوێرکردن. لە رووی سیاسی و کۆمەڵایەتیشەوە چوارچێوە و کایە سیاسیەکانی لە گۆڕەپاندا بوون بە فراوانکرد بە شێوەیەك رێگەیدا بە چین و توێژگەلێکی نوێ بە شداری لە دەسەڵاتدا بکات. ((بە واتایەکی دیکە سیاسەتمەدارەکانی ئەسینا خۆیان لە شۆڕشی کۆمەڵایەتی بەدوور گرت بەهۆی سەرکەوتنیان لە هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی ئابووری و سیاسی پێکەوە و، رێگا و دەروازەیەکی نوێیان کردەوە بۆ پێشوەچوون لەبەردەم تەواوی کۆمەڵگای هێللینیدا)).

بەمشێوەیە ئەگەر هەر یەکێك لەم شارانە بەجیا وەربگرین، سەربەخۆ لەوی دیکە، دەرك ناکەین بە شێوەیەکی ورد و راست بەو بزاڤ و جووڵە و گۆڕانکارییانەی کە ئەو ماوەیە و ماوەکانی دواتر بەخۆوەی دەبینی؛ لە نێویشیاندا مانا و واتای لەناوچوونی بەرهەم و زادەی شاری (ئەسپارتە) و مانەوە یان بەردەوامبوونی کار و دەستکەوتەکانی شارێکی دیکە (ئەسینا)، لە کاتێکدا

مێژوویان یەکبوو تا سەردەمی شەشەمی پ.ز. هەروەکو توێنبی جەختی لەسەر دەکاتەوە بە گوێرەی بەڵگەکانی وەرگیراو لە هەڵکۆڵینەکان وەی دیکە. کەواتە، جیاوازییە کە، خەسڵەت و سیفەتگەلێکی بۆ ماوەیی نەبوو ئەم شارەی لەوی دیکە جیاکردۆتەوە، بەڵکو لە ڕێگە و شێوازی پەیرەوکراو لە وەڵامدانەوەی ئەم ئاستەنگە واتە لە چارەسەرکردنی کێشەوگرفتی باسکراو، واتە ((ئەوانە سیما و رووخسارگەلێکی وەرگیراون و پرنسیپ و بنەماکەی ناتوانرێ پەی پێببرێت تەنها بە تێڕوانین و وردبوونەوە نەبێت لە تەواوی کۆمەڵگەی هیللینی)).

بە گوێری هەمان پەیڕە و ڕێبازەکە ناکرێ تێبگەین لە جیاوازی و ململانێی و پاشانیش یەکێتی لە نێوان شارەکانی باکووری ئیتاڵیا (ڤینیسیا و میلانۆ و جەنەوە) تەنها لەبەر رۆشنایی دژ بوون و ناکۆکی یان نزیکبوونەوی وەلامدانەوەکانی ئەم شارانەوە نەبێت بۆ ئەو گرفت و کۆسپانەی هاتوونەتە پێشیان.هەروەك ناکرێ لە شۆڕشی پیشەسازی لە ئینگلتەرا حاڵی بین و راڤەی بکەین بەبێ رەچاوکردنی پێگەی جوگرافی ئینگلتەرا لە نێوەگۆی باکووری گۆی زەویدا و شوێنە کەناراویە مامناوەندییەکەی تیایدا، نەك تەنها لە ئەورووپای رۆژئاوا، بەڵکو لە ئەفریقیای ناوەڕاست و ئەمریکا و رووسیا و هیند و رۆژهەلاتی دوور. ئەم پەیڕەورێبازە گشتگیریە لە بینینی راستی و رووداوەکانی مێژووی شارستانیەتەکان ئەوەیە کە (توێنبی) جێبەجێ دەکات لە تێگەیشتنی یانە هەڵوێستە فەلسەفییەکەی لەبارەی شارستانییەت.

### ٢- پرەنسیپ و بنەماکانی شارستانیەتەکان:

لە نێو کۆمەڵگە سەرەتایی و کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان (ئەمەی دواییان نزیکترە لە زاراوەی شارستانیەت بە گوێرەی توێنبی) چەندین جیاوازیمان

دەستدەکەوێت، بەڵام ئەو جیاوازیانە بەردەوام و بنەڕەتی نین. کۆمەڵگە سەرەتاییەکان ئەوانەن کەبوونە ڕێگە خۆشکەر بۆ سەرهەڵدانی کۆمەڵگەی پێشکەوتووتر، بەڵکو خودی ئادەمیزادیش بۆی نەبوو بگاتە ئەم ئاستەی ئێستای ئەگەر ئەو کۆمەڵگە سەرەتاییانە نەبوونایە کە لە ڕۆژگارێکی دووروودرێژدا، هیچ تۆمارێکمان لەبارەیەوە نییە، ژینگەی کۆمەڵایەتی پێشکەشکرد کە ڕێگەیدا بە پەرەسەندن و پێشکەوتنی ئادەمیزادی یەکەم. گۆڕان لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکان بۆ شارستانیەتەکان ((گۆڕانێکە لە سیستی و چەقبەستوویی بۆ هێزی پاڵنەرانە)). ئەم پرەنسیپە لای (تۆینبی) دەگۆڕێت بۆ یاسایەك لە بزاڤ و جووڵەی هەڵکشانی شارستانیەتەکان یان داکشان و پاشەکشەکردنیان، بەپێی سەرکەوتن و هەڵکشانی وزە و تواناکانی داهێنان و ئافراندنی شارستانیەتێك یان خامۆشبوونی و پاشەکشەکردنی، (تۆینبی) دەڵێت: ئەم یاسایە خۆی جێبەجێ دەبێت سەبارەت بە زیندووبوونەوەی شارستانیەتەکان بەهۆی جیابوونەوەی پرۆلیتاریای ناوخۆ لە کەمینەی باڵادەست و فەرمانڕەوا کە سەر بە شارستانیەتەکانی پێشووە کە وزە و تواناکانی داهێنان و ئەفراندنی خۆی لە دەستداوە.

ئەم کەمینەیی باڵادەستە بە چەقبەستوو لە قەڵەم دەدرێت. ئاماژەکردن بۆ لێکترازان و هەڵوەشانەوەی کەمینەی داهێنەر و ئافراندنکاری شارستانیەتێکی تازە گەشەکردوو، یان پوکانەوەی بۆ کەمینەیەك جڵەو بە دەستی شارستانیەتێك لە دۆخی هەڵوەشاندنەوەدا، ڕێگەیەکی دیکە بۆ ئاماژەکردن بۆ گواستنەوەی ئەو کۆمەڵگەیەی توێژینەوەی لەبارەوە دەکرێت لە جوڵە و بزاڤی پاڵنەرانە بۆ دۆخی سستی و چەقبەستوویی. بە پێچەوانەی ئەم دۆخە چەقبەستوویە، جیابوونەوەی پرۆلیتاریا بەکاردانەوەیەك دادەنرێت کە دەناسرێتەوە بە جوڵە و هێزی

پاڵنەرانــەوە. تــوینبی زێــتر دەڵێــت: لەبــەر رۆشــنایی ئــەم راســتیە –واتــە جیابوونەوەی پرۆلیتاریا لە کەمینەی باڵادەست و فـەرمانڕەوا– شارسـتانیەتێکی نـوێ دەردەکـەوێت بـەهۆی کاریگـەری گواسـتنەوەی کۆمەڵگەیـەک لـە دۆخـی چەقبەستن و سستی و لاوازی بـۆ جوڵـە و بزاڤـی پاڵنەرانـە، وەك نموونـەی ئـەو گۆڕانکارییـەی شارسـتانیەتێك لـە کۆمەڵگەیـەکی سـەرەتایی بەرهـەم دەهێنێـت. دەشێ دروستبوونی تەواوی شارسـتانیەتەکان دابنرێـت بـە گەڕانـەوەی رەگـەز و توخمی مرۆیی جارێکی دیکـە بـۆ بـزاڤ و جوڵـەکردن و چـالاکی. (تـوینبی) پـێش پێـشنیازکردنی تیۆرەکـەی خـۆی، دوو تیـۆر و بـیردۆز دەخاتــە بــەر بــاس و لێکۆڵینـەوە کـە هــەردەم و ئێـستاشی لەگەڵدا بێـت –لایـەنگری خۆیـان هەیـە– ئەوانیش بریتین لە:

أ/ رۆڵـی رەگـەز یـان تـوخم: ئایـا رەگـەز یـان تـوخم رۆڵـی لـە هەڵکشانی شارستانیەتێکدا هەیە؟ ئایا دەتـوانین دەسپێکی شارسـتانیەتەکان بدەینـە پـاڵ خەسڵەتەکانی رەگەزێك، یان چەند توخم و رەگەزێکی دیاریکراو؟

رەگـەز، تـوخم بـەکاردێت بـۆ گوزارشـتکردن لـە بـوونی هەنـدێ خەسـڵەت و سیفەتی جیاواز و بەجێماو لـە هەنـدێ کۆمەڵگـەی مرۆییـدا وە، ئـەو خەسـڵەت و سیفەتە گریمانەییانەی لێیان دەکۆلینەوە و بە دوایاندا دەگەڕێن ئەوانە یا ئەوەتا خەسڵەت و سیفەتی دەروونی و رۆحین یانیش خەسڵەت و سیفەتی مۆرفۆلـۆژی فیزیایین (وەك شێوەی کەللە سەر و رەنگ). وەلەبەر ئـەوەی هـی یەکـەمیان لـە رووی زانـستیەوە تـەنها شـتێکی کـەمی لەبارەیـەوە دەزانـین –بـە تایبـەتی کـە زانـستی دەروونناسـی کۆمەڵایـەتی هێـشتا لەسـەرەتادایە و سـاوایە– بۆیـە ئـەو شتەی زیاتر پشتی پێ دەبەسترێت لـە بنیاتنـانی تیـۆر و بـیردۆزی سـەرکەوتنی شارستانیەتی رەگەزێك لە رەگەزە مرۆییـەکان بێگومـان لەسـەر فاکتـەری رەنـگ

دامەزراوە (یان لەسەر شێوەی کەللەسەر) بە دیاریکراویش سەرکەوتنی رەگەز و تـوخمی سپی پێست- یان بەپێی دەربڕینـی تـوێنبی: ((بـەربلاوترین تیـۆر و بیردۆزەکانی شارستانیەتی رەگەزی ئەو بیردۆزەیە کە لەسەر سەکۆی بالادەستی و ڕێزلێنان وەچە و رەگەزی سپی پێست و قژ زەرد و چاوی سپیی مەیلـەو رەش و سـەروکەللەی درێـژ کـە هەنـدێك بـە ئـادەمیزادی نۆرنـدی نـاوی دەبـەن و فەیلەسووف نیچەی ناوداری ئـەڵمانیش بـە درندەی قـژ زەرد نـاوی دەبـات)). تـوێنبی، زۆر بـە توندی ئیدانـە و سـەرکۆنەی تیـۆر و بـیردۆز و تێڕوانینـە رەگەزپەرستیەکان دەکـات کـە سـەرهەڵدانی شارسـتانیەت یـان پەرەسـەندن و گەشەکردنی بە رەنگی پێست یان شێوەی کەللەسـەر دەبەستێتەوە و، بەڵگـە و بیانووەکانیـان بـەپێی خەسـڵەت و سـیفەتە مۆرفۆلۆژییـەکانیان (واتـە شـێوەی دەرەوەی جەستە) دابەشکرادوە بۆ: کەللەسـەری لاکێشەیی یـان خـڕ، پێستی سپی یان رەش هتد پاشان سپی پێستەکانیان لـە سێ رەگـەزدا کۆکردۆتـەوە: نۆرنـدی(بـاکور)، دەڤـەری چـیای ئـەلب و دەریـای ناوەڕاسـت، پاشـان ئـەو شارستانیەتانەی هەریەك لەوانە دروستیان کـردوون پۆلێنیـان دەکـەن: تـوێنبی، ئەم ڕاوبۆچوونانەی رەتکردۆتەوە بـەوەی کـە زانستیانە نـین و مێـژوویی نـین و، سەلماندی کە هیچ شارستانیەتێك نیـە زیـاتر لـە تـوخم و رەگـەزێك یـان رەنگێـك بەشداری نەکردبێت لە دروستکردنی یان هەرچی شارستانیەتەکانیشە، کـە ئـەم رەگەز و توخمانە بەشدارییان کردووە لە دروستکردنیاندا ئەوا بە گوێرەی زانایان بەمشێوەیەی خوارەوەیە:

* نۆردیەکان ٤یان٥ شارستانیەتیان دروستکردووە: هیندی، هیللینی، مەسـیحی، ئەرسەزۆکسی رۆژئاوایی.

* ئەلبییەکان بەشدارییان کردوە لە دروستکردنی ٧یان٩ شارستانیەت: سۆمەری، حیسی، هیللینی، رۆژئاوایی، مەسیحی، ئەرسەزۆکسی، ئێرانی لەوانەیە بەشدارییان کردبێت لە شارستانیەتی میسری و مینودی.
* رەگەزی سپی پێستی دەریای ناوەڕاست بەشداری کردوە لە ١٠ شارستانیەت: میسری، سۆمەری، مینەوی، سریانی، هیللینی، رۆژئاوایی، مەسیحی، ئەرسەزۆکسی، ئێرانی، عەرەبی، بابلی.
* رەگەزی تێکەڵ لە رەش و سپی (ئەسمەر) بەشداری کردووە لە دوو شارستانیەتدا: هیندۆسی و سندی.
* رەگەز و توخمی زەرد بەشداری کردووە لە دروستکردنی سێ شارستانیەتدا: چینی، چینی رۆژهەلاتی دوور، ژاپۆنی.
* رەگەزی سوور بەشداری کردووە لە بنیاتنانی شارستانیەتەکانی ئەمریکای باکوور و ناوەڕاست.
* هەرچی رەگەز و توخمی رەش پێستیشە بە شێوەیەکی دیار و پۆزەتیڤانە تەنها لە بنیاتنانی شارستانیەتی میسریدا بەشداری کردووە هەروەك زانایان وای بۆ دەچن.

بەمجۆرە تۆینبی دەگاتە ئەو بۆچوونەی کە: ((نیوەی شارستانیەتی رۆژئاوایی دامەزراوە لەسەر بەشداریکردنی پتر لە رەگەز و توخمێك)). بەم پێیە ناکرێ قسە لەسەر سەرکەوتوویی و باڵادەستی رەگەز و توخمێك بکەین لەسەر ئەوانی دیکە.

ب/ رۆڵی ژینگە: تۆینبی، دان بە رۆڵی ژینگە یان دەوروبەری سروشتی دەنێت، بەڵام نەك رۆڵی یەکلاکەرەوە یان دیاریکراو یان تاك و تەنیا، چەند بەڵگەش لەسەر ئەم رەتکردنەوەی خۆی دەخاتەڕوو، لەوانەش:

١- دەشـتەکانی ئاسـیا و دەشـتەکانی ئاسـیا و ئـەفریقایی کـە کۆمەڵگـەکانی خێوەتنشینیان هێناوەتـە بەرهـەم. تەتـەر و عـەرەبی دەوارنـشین، هاوشـێوەیان دۆزرایـەوە لـە دەشـتەکانی ئـەمریکای بـاکوور و باشـوور و ئوسـترالیا، لەگـەڵ ئەوەشـــدا ژیـــانێکی مـــەڕداری خیوەتنـــشین یـــان کۆمەڵگەیـــەکی دەوار و رەشماڵنشینی نەهێناوەتە بەرهەم.

٢- بارودۆخی سروشتی کە لە دۆڵی نیل و دەلتا یان لە رێژگەی رووبـاری فـورات و دیجلەدا هەبوون، لە شوێنی دیکـە لەسـەر گـۆی زەوی هاوشـێوەیان پەیـدابوو لەگەڵ ئەوەشدا سوری شارستانیی تەنها لەم دوو شوێنەدا دەستی پێکرد، بۆچی لە دۆڵی ئەردەن شارستانیەتێکی هاوشێوەی ئەوەی لە دۆڵی نیلدا سـەری هەڵـدا دروست نەبوو؟ بۆچی لە دۆڵەکانی مسیسپی و کۆلـۆرادۆ لـە ئـەمریکای بـاکووردا شارستانیەتگەلێکی هاوشێوەی ئەوەی لە نزیك رێژگەی دیجلـە و فوراتـدا روویـدا دروست نەبوو؟ ژینگە کەوتە -واتە مەرجە سروشتیەکان- تەنها دیاریکەری تاکو تەنها و دوایی نیە بۆ دروستبوونی شارستانیەتێك.

٣- هەنـدێجار دەربـارەی شارسـتانیەتی چـین دەڵـێن زادە و بەرهـەمی رووبـاری زەردە، بـەڵام حـەوزی رووبـاری دانـۆپ زۆر لـە حـەوزی رووبـاری زەرد دەچـێت لەبارەی کەش و ئاووهـەوا و خـاك و دەشـت و چیا لەگـەڵ ئەوەشـدا هـی دووەم سەرنەکەوت لە بەرهەمهێنان و دروستکردنی شارستانیەتێکی هاوشێوەی ئـەوەی لە دۆڵی رووباری زەرد هاتەکایەوە.

٤- شارستانیەتی مایا لە نێـو بـاران و دارسـتانە خولگەییەکانـدا هاتەکایـەوە لـە گواتیمالا و هیندۆراس. بەڵام ئەم جۆرە شارستانیەتانە لەگەڵ هـەمان بـارودۆخی سـەخت و دژواری ئـەمازۆن و کۆنگـۆدا دەرنەکـەوتن. لـەم نموونانـەوە، تـوێنبی دەگاتە ئەو بۆچوونەی: ((دەتوانین زیاتر لەم بابەتەوە بدوێین، بەڵام رەنگە ئێمە

نموونەی پێویستمان باسکردبێت بۆ ئەوەی خوێنەر رازی بکەین کە نە ڕەگەز و توخم و نە ژینگە و دەوروبەر -ئەگەر هەریەکێکیان بەجیا وەربگرێت- فاکتەر و هۆکاری پۆزەتیڤ پێکناهێنێت کە توخم و ڕەگەزی مرۆیی بە ئاگاهێنا لە ماوەی شەش هەزار ساڵەی رابردوودا و دەریهێنا لە دۆخی چەقبەستن لە ئاستی کۆمەڵگەیەکی سەرەتایی و هاندان و پاڵپێوەنانی بۆ رێگایەکی دەورەدراو بە مەترسی و کێشەوگرفت بۆ گەڕان بە دوای شارستانیەتدا)). ئەگەر بێتو گۆڕانکارییە گەورەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، واتە شارستانیەتەکان، نە بەرەگەز و توخم و نە بە ژینگە راڤە ناکرێت، ئەی کەواتە ئەو هۆکارە چاوەڕوانکراوانەی دیکە چین کە لە دواوەی دەسپێکردنی شارستانیەتەکان و پەرەسەندن و گەشەکردنیان دەوەستن؟ تۆینبی، وەڵامەکەی خۆی لەسەر ئەو پرسیارانە، یان فەلسەفەکەی بۆ هەڵکشانی شارستانیەتەکان و داکشانیان پێشکەش دەکات، ئەوەش بە پشتبەستن بە گریمانی، بەرەنگاربوونەوە و وەڵامدانەوە، کە بۆتە ناونیشانێك بۆ تەواوی فەلسەفەیەك.

### ٢-بیردۆزی بەرەنگاربوونەوە و وەڵامدانەوە:

تۆینبی، لە دەقێکی ورد و لەهەمانکاتدا پارێزکاردا دەڵێت: ((روون و ئاشکرایە دەسپێکردنی شارستانیەتەکان لە ئەنجامی هۆکارە بایەلۆژیەکان یان ژینگەی جوگرافی نەبووە، هەریەکەیان بەجیا. گومانی تێدا نییە ئەوە ئەنجامی جۆرێك لە کارلێکردنی نێوانیان بووە هەموویان پێکەوە. بە دەستەواژەیەکی دیکە ئەو هۆکارەی هەوڵدەدەین پێی ئاشنابین و بیناسین شتێکی تاك و تەنیا نیە بەڵام جۆراوجۆرە. ئەو یەکەیەك نییە بەڵام پەیوەندیە)). بەڵام سەرکەوتن لە دەسپێکردنی شارستانیەت تەنها کۆکردنەوەی هەردوو هۆکاری: رەگەز و

ژینگە نییە، هەروەك رەنگە لە دەقی پێشوو وای بۆ دەچین. لە چەند شوێن و کاتێکدا رەگەز و توخم لەگەڵ ژینگەدا هاتووە لەگەڵ ئەوەشدا بۆیان نەرەخساوە هەمیشە و هەردەم ئەم گۆڕانکارییە لە سەرەتایی و دواکەوتووییەوە بۆ شارستانیەت بەرهەم بهێنین. ((هەمان رەگەز و توخم یان ژینگە لەوانەیە لە دۆخێکدا بەرهەمهێن و کاریگەر بن و لە دۆخ و بارێکی دیکەدا بێ سوود و نەزۆك بن)). تۆینبی پێی وایە هۆکارێکی سێیەم، رەنگە یەکلاکەرەوە بێت، پێویستە هەردەم هەبێت ئەویش خواست و ویست و سووربوونە. تۆینبی لە زانایەکی کلاسیکی شارەزا لەبارەی رەگوریشە و بنەچەکانی ئادەمیزاد و شارستانیەت ئەویش (T.L.MYRES) ( ئەم دەقەی خوارەوە دەگوازێتەوە: ((پرۆسەی هەڵکشان و بەرزبوونەوە دژایەتێکی تێدایە ناوەڕۆکەکەی ئەوەیە ئەگەر پێداویستی سەرچاوەی (دایك) داهێنان و ئەفراندن بێت ئەوا عیناد و کەللەرەقی باوکیەتی. واتە سووربێت لەسەر ژیانێکی بەردەوام لە ژێر سێبەری بارودۆخگەلێکی پێچەوانە و بە پەسندی بزانێت لەسەر پاشەکشێکردن و رووکردنە شوێنێك کە رێگاکانی ژیان و گوزەران ئاسانتر و خۆشتربن. شتێکی لەناکاو و بە رێکەوت نەبووە شارستانیەت هەروەکو دەیزانین و دەیناسین دەست پێبکات لە نێوجەرگەی ئەم هەموو داکشان و هەڵکشانە. ئەو ئاو و هەوا و رووەك و ئاژەڵ کە سەردەمی چوارەمی بەستەڵەك پێی جیادەکرێتەوە ئەو خەڵکانەی لەسەر زەوی وەستان کاتێك دار و درەختێك نەمابوو بۆ دانیشتن لەسەریان، گۆشتیان خواردوە لەکاتی پێنەگەیشتنی میوە و جلوبەرگیان دروستکردووە لە جیاتی پشتبەستن بە تیشکی خۆر و، کولانەکانی خۆیان توندوقایمکرد و، منداڵەکانیان راهێنان و مەشقیان پێدەکردن و، سەلماندیان کە دونیا لۆژیکێکی هەیە لە کاتێکدا پێشتر وادەردەکەوت کە هیچ لۆژیکێکی نیە، ئەوانە سەرکەوتن و

بوونـە پیاوگـەلێکی ئـازا و دلێـر)). کەواتـە فاکتـەر و هۆکـاری سەرسـەختی و سووربوون و ئیرادە هەیە، فاکتەرێکی دەروونی هەیە، زۆری لەبارەیەوە نازانین و نـاکرێ بـە وردی پـەی پێببرێـت و پێـشبینی بکرێـت، بـەڵام بـوونی هەیـە و سەرکەوتنمان یان شکستمان بەوەوە بەندە. بۆیە تـوێنبی دەگاتـە گریمانەکـەی خۆی: ((بیرۆکەی بەرەنگاربوونەوە و وەڵامدانەوە دەرفـەت و چانـسی زیـاترە لـە بیردۆزی رەگەز (توخم) و ژینگە لە گونجان و سازان لەگەڵ ئەو فاکتەر و هۆکاری بەدوایـدا دەگـەڕێن و لێـی دەکۆڵێتـەوە)). تـوێنبی قۆنـاغی دەسـپێکردنی شارستانیەت لە ولاتی سۆمەر و میسری کۆن و پێش زیاتر لە شەش هـەزار سـاڵ وەك نموونەیـەك پێشکەش دەکـات بـۆ پاڵپـشتی کردنـی بیردۆزەکـەی خـۆی لـە بەرەنگاربوونەوە و وەڵامدانەوە.

لەگەڵ وەرگەڕانی کەش و ئاووهەواکـە پـێش چـەند هـەزار سـاڵێك روویـداوە و لەگـەڵ پاشەکـشێکردنی پـشتێنەی بـەفرینی لـە بـاکوور بـەرەو جەمـسەر، ئـەو کەشوهەوایە خۆش و مامناوەندییە کە لـە باشـووری دەریـای ناوەڕاسـتدا بـاوبوو گۆڕانی بەسەرداهات پلـەی گـەرما بـەرزبۆوە و هـەورەکانی بـاران بـەرەو بـاکوور چوون و کشانەوە کانیاو و سەرچاوەکان حەوزەکانی ئاو وشکیان کرد و دەشت و لەوەڕگەکان قات و قڕیـان تێکـەوت و وشکەسـاڵی لـە دارسـتانەکان روویـدا و دار و درەختە بەردارەکان وشکبوون و لەناوچـوون و، دۆڵـی نیـل وەکـو خـۆی مایـەوە بەهۆی هاتنی رێژەیەکی زۆر لـە ئـاو بـۆ نـاو رێژگەکـەی کـە سەرچـاوەکەی بـانی ئەفریقیایـە. چـۆن کۆمەڵگـە نـشینگەکانی ناوچـەکە لەوکاتـەدا وەڵامـی ئـەم وەرگەڕانەی کەشوهەوا و ئاووهەوایان دایەوە؟

تـوێنبی دەڵێـت: ((ئەمـە بەدڵنیاییـەوە، رووداوێـك و تاقیکردنەوەیـەك تـا رادەیەکی زۆر توند و سەخت بوو بۆ بەهرەی داهێنان و ئەفراندن لای دانیشتوانی

ناوچـەکە کـە پێـشتر لـەوەرگا و پـاوانی تێـدا دەڕوا)). دانیـشتوانە راوچـیەکانی ناوچەکە، کـە خـۆراکی ڕۆژانـەی خۆیـان هەڵدەگرتـەوە یـەکێك لـەم سـێ رێگـا و چارەسەرکردنەیان لەبەردەمدا بوو:

أ/ جوڵـەکردن بــەرەو بــاکوور یــان باشــوور بــەدوای دۆزینــەوەی بــارودۆخ و کەشوهەوایەکی گونجاو.

ب/ مانــەوە لــە شــوێنی خۆیــان هــەروەکو چــۆن لــە پێــشتر ژیــاون لەســەر هەڵگرتنەوەی میوە و بەروبوون و راوکردن.

ج/ مانەوە لە شوێنی خۆیان بەڵام لەگەڵ گۆڕینی هۆکـار و شـێوازەکانی ژیانیـان کۆنترۆڵکردنی بارودۆخی ژینگەکەیان لە ڕێیماڵیکردن و بـەخێوکردنی ئـاژەڵان و کێڵانی زەوی.

کۆمەڵـەی دووەم کــە نیــشتمانی رەســەن و بنــەڕەتی خــۆی جێنەهێــشت و رێگاوشــێواز و هۆکارەکــانی ژیــانێکی خــۆش و کامــەرانی نــوێی بــۆ نەڕەخــسا ((چارەنووس و ئاکامەکەی لەناوچوون بوو بـەهۆی سـەرنەکەوتن و شکـستهێنانی لە وەڵامدانەوەی بەرەنگاربوونەوەی وشکەساڵی)). ئەوانەشی وەرزانە بـەدواوەی بارودۆخەکانی کەش و ئاووهـەوا چـونکە جێگـەی دیکـە لـە راوچـییەوە بـوون بـە شــوانکارە و وردەوردە بوونــە کۆچــەری دەشــت و چــۆلەوانیەکانی (کۆمەڵــەی یەکەم) و لەناوچەکانی باشوور بـە دیـاریکراو. ئەوانەشـی روویـانکردە بـاکوور یـا ئەوەتا لە ناوچوون لە بارودۆخەکانی ئاووهەوا نوێیەکە یانیش کەمێکیان توانیـان وەڵامدانەوەیەکی خولقینەرانەیان هەبێت بۆ مەرج و ئاستەنگ و بەرەنگاربوونەوە نوێیـەکان.(( هەرچـی ئـەو کۆمەڵانـەش کـە وەڵامدانـەوەیان هـەبوو بـۆ گرفـت و ئاستەنگی وشکەسـاڵی بـە گـۆڕینی نیشتمانەکەی و رێگـە و شـێوازی ژیانەکـەی پێکەوە (کۆمەڵەی سێیەم)، ئەم کاردانەوە توند و چەندبارەیەیان ئـەو کارکردنـە

بوو کە هەردوو شارستانیەتی میسری و سۆمەری دروستکرد لە نێوجەرگەی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان کە لە پاوان و لەوەرگاکانی دەژیان کە ئەو لەوەرگانەش بەرەو لەناوچوون دەچوون. گۆڕان لە رێگە و شێوازی ژیان و گوزەرانی ئەو کۆمەڵگە ئەفراندکار و داهێنەرانە لە گۆڕانیان لە کۆمەڵە کەسانێك خواردن و بژێوی خۆیان کۆدەکردەوە بۆ کەسانێکی جووتیار و وەرزێر...ئەو کەسە پێشەنگ و قارەمانانە بە رۆڵی دلێری و چاونەترسییان یان بێئومێدی توانیان لە زۆنگاوەکان و دارستانە چڕ و پڕەکانی ناوەڕاستی دۆڵەکە بپەڕنەوە کە پێشتر هیچ مرۆڤێك پێیدا تێپەڕ نەببوو، کاروچالاکیەکانی ئەوان کردی بە خاکی میسری و خاکی سۆمەر)).

توێنبی، قسەکانی بەمشێوەیە تەواو دەکات: (( سەرکێشیەکە سەری گرت و سەرکەوت، هەروەك دواتر دەرکەوت، کار و کردەوەکانی ئادەمیزاد توانی سروشت بخاتە ژێر ویستی خۆی و زۆنگاوەکان نەمان و لە جێگەیاندا کۆمەڵێك جۆگە و کێڵگە و رەزوباخ دروست بوون بەمجۆرە خاکەکەی میسر و سۆمەر لەباربوون بۆ کشتوکاڵ و وەرزێری و، هەردوو کۆمەڵگەی میسری و سۆمەریش دەستیان بەسەر کێشە گەورەکەی خۆیان کرد)). ئەو ئاستەنگ و بەرەنگاربوونەوانەی توێنبی باسیان لێوە دەکات بە گشتی لە دوو خاڵدا کۆیاندەکاتەوە:

أ/ بەرەنگاربوونەوەی کاتەکانی تەنگانە و باشەکانی.

لەم بەشەدا توێنبی بەردەوام دەبێت لە رەتکردنەوەی گریمانی ئەوەی شارستانیەتەکان ئەوکاتە دەردەکەون کاتێك ژینگە سروشتیەکان بارودۆخگەلێکی گونجاو و لەباریان بۆ ئامادەدەکەن. پەند و وانە لە گونجانی ژینگە یان نەگونجانیدا نییە، بەڵکو لە سروشتی وەڵامدانەوەی ئادەمیزاد و

کۆمەڵگە مرۆییەکانە بۆ ئەو ئاستەنگ و کۆسپ و ئەگەرانەی ژینگە ئاشکرایان دەکات. وەڵامدانەوەی خوڵقێنەر و سەرکەوتوو کە شارستانیەتە هەبووەکانی ئامادەیان بۆ دەکەن راستەوانە یان رەها نییە. کۆمەڵە و گروپ هەن دلێری و ئازایەتی یان ئەفراندنی پێویستیان نیشان نەداوە وردە وردە لەناوچوون یان چوونە نێو پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی دیکە. هەندێ کۆمەڵە هەن ماوەیەك سەرکەوتن لە گونجاندنی سروشت و سەپاندنی ویست و خواستی خۆیان بەسەریاندا. بەڵام ئەم هێزە زیندووە دوای ماوەیەك هەڵوەشایەوە و جارێکی دیکە سروشت سەر لەنوێ ئەم دەسکەوتانەی وردەوردە قوتدا، ئەو نموونانەش کە توێنبی لەسەر راستگۆیی ئەم گریمانەیەی خۆی زۆرن لەوانەش:

– کەلاوە و پاشماوەکانی شارستانیەتی (مایا) لە کشوەری ئەمریکای ناوەڕاست کە پەردەهەڵدەماڵی لەسەر شار و شارستانیەتگەلێکی گەورە پاشان فەوتان و لەناوچوون و بێشەلانی چڕوپڕ کۆشك و پەرستگە و ناڵ و خانووەکانیان بزرکرد، ئەم کارەش ئاماژە دەکات بە توندی و سەختی ململانێی لە نێوان ویستی ئادەمیزاد و بەرەنگاربوونەوەی سروشت و دڵڕەقیەکەی.

– بەترا و تەدمور لە بەشی باکووری بیابانی رۆژئاوا دوو نموونەی دیکەن بۆ چۆنیەتی سەرکەوتنی ویستی ئادەمیزاد و سووربوونی بەسەر بەرد و چۆڵ و بیاباندا. لەم دوو نموونەدا و،لە زۆر نموونەی دیکەی هاوشێوەدا، توێنبی دەگاتە ئەو ئەنجامەی توندی و تیژی نەك نەرمونیانی ویست و ئیرادە و سووربوون لای ئادەمیزاد دروست دەکات و پاڵنەری سەرکەوتنی پێشکەش دەکات. بە گوێرەی هەمان لۆژیك دەشتی هەژاری فینیقییەکان بووە پاڵنەر بۆ هاندانی فینیقییەکان بۆ پەڕینەوەی دەریا و دروستکردنی کەشتیگەلی مەزن و بوونە گەورەترین دەریاوانی سەردەمی خۆیان و، مامۆستایانی نووسین و خوێندنەوە بۆ ئەو

شارسـتانیەتیانەی هاوسـەردەمی خۆیـان بـوون یـان دوای ئـەوان هـاتن. لـە نموونەیەکی دیکەدا توێنبی پێیوایە، هەڵبژاردنی (هانیباڵ بۆ گەرمی و پشوودانی ماوەی زستانێکی تـەواو لـە دەشـتە گەرمەکـەی (کـابوا)، لـە کاتێکـدا لەبـەردەم دەروازەکانی شاری رۆما بوو، دوای ئەو ئازایەتی و قارەمانیەتی لـە گەشـتەکەیدا لە (قەرتاج)ەوە نیشانیدا ئەو هۆکارە بوو کە رێگەی بـە رۆمـادا هەناسـەی خـۆی وەربگرێـت و ئامادەسـازی بکـات پاشـان شکـستی پێبهێنێـت. لەهـەموو ئـەوەدا توێنبی دەگاتە بیردۆزێك یـان هاوکێـشەیەك پێکهاتەکەشـی ئەمەیـە: ((ئاسـانی و سادە و ساکاری دوژمنی شارستانیەتە)) و پاڵنەر و هانـدەر بـەرەو شارسـتانیەت زیـاتر دەبێـت هـەر کاتێـك ژینگەکەزەحمـەت و سـەخت و دژوار بێت. ئەمـە ئـەو نهێنیەیە کە لە چـەند رێگەیەکـدا بـەرگری لێـدەکات و، بـە ((بەرەنگاربوونـەوەی ژینگە)) ناوی دەبات.

## ب/ رووبەرربوونەوەی تەنگانەکان.

توێنبی جـەخت لەسـەر گریمانەکـەی خـۆی دەکاتـەوە دەربـارەی پەیوەنـدی پتـەوی سـەخت و زەحمـەت و دژواری و پاڵنـەر و هانـدەر بـەرەو بنیاتنـانی شارسـتانیەتێك، لـە رێـی زنجـیرەك دیـتن و سـەیرکردنی ئـەو شـوێنانەی شارستانیەتگەلێکیان بەرهەمهێناوە کـە چاودێر ئەمرۆکـە چاوی پێیاندەکـەوێت تەنها ئەوەندەی پێدەکرێت بڵێ: چۆن ئەم خەڵکە توانیویانە ئـەم شـتانە بکـەن؟ پەیوەندی پێکەوەیی بەهێزی راستەوانە لە نێـوان تونـدی زەحمـەت و سـەخت و دژواری و پاڵنـەر و هانـدەر بـەرەو بنیاتنـانی شارسـتانی ئـەو نهێنیـە سەرسـورهێنەرەیە لـەم نموونانـەوە بەراوردکاریانـەدا. تـوێنبی، بەرەنگاربوونەوەکانی ژینگە لە پێنج شتدا کۆدەکاتەوە:

١- وڵات و خاکی سەخت و دژوار.

٢- زەوی و خاکی نوێ یان کۆچکردن بۆ زەوی و خاکی نوێ.

٣- لێدان و زەبرەکان.

٤- فشارەکان.

٥- نەهامەتی و کارەساتە شوومەکان.

وێڕای گرنگی ئەم پێنج بەرەنگاربوونەوانە، ئێمە جەخت لەسەر دووانیان دەکەینەوە، یەکەم و دووەم، لەبەر بایەخ و گرنگیە تایبەتیەکەیان و ئەو کۆدەنگیەی هاتۆتەئارا لەسەر ئەو رۆڵەی گێڕاویانە.

## بەرەنگاربوونەوەی یەکەم - وڵات و خاکی سەخت و دژوار:

تۆینبی نموونەی زۆر ناوچە و شوێنی خودان بارودۆخێکی ژینگەیی سەخت و دژوار دەهێنێتەوە، وێڕایی ئەوەش، بەڵکو بەهۆی ئەوەوە، بوون بە پێگە و جێگەی سەرهەڵدانی شارستانی، کەچی زۆر ژینگەی سادە و ئاسانی دیکە نەیانتوانی ئەم رۆڵە بگێڕن. ئەمەش هەندێ نموونەیە پێشکەشتانی دەکەین:

أ/ رووباری زەرد و رووباری یانگتسی: شارستانیەتی چین لە دۆڵی رووباری زەرد دروست بوو، کە لە زۆربەی وەرزەکانی ساڵدا گونجاو نەبوو بۆ دەریاوانی بەهۆی توانەوەی بەفر کە تیایدا پشێوی و بێسەر و بەریەکی ئاویی و لافاوی کاولکار روودەدات و، لە دۆڵی رووباری یانگتسی رووینەدا، کە گونجاو و لەبار بوو بۆ کەشتیوانی و کاری دەریاوانی لە تەواوی وەرزەکانی ساڵدا لافاوەکانیشی کەمتر دووبارە دەبێتەوە و توند و دژواریش نین هەروەک دۆڵەکەی خۆش و گونجاوە بۆ نیشتەجێبوون. وێڕای هەموو ئەوەش ((شارستانیەتی چین لەسەر رووباری زەرد سەریهەڵدا نەك لەسەر رووباری یانگتسی)).

ب/ ئەسینایيەکان و وڵاتی هەژارەکەیان: شارستانیەت و فەرهەنگ و کولتووری ئەسینا لە ناوچەی بەردەڵانی خاك هەژاری یۆنان دروست بووە، ناوچەی (ئەتیکا)لە دەشتی (بویسیا)ی بە پیت و خاکی دەوڵەمەند سەریهەڵنەدا. ئەسینیایەکان چییان بە وڵاتە هەژارەکەی خۆیان کرد؟ توێنبی وەڵام دەداتەوە: (( کە لەوەرگاکانی ئەتیکا و کێڵگەکانی تێکچوون، گەلەکەی لە بەخێوکردنی مەڕومالاّت و چاندنی دانەوێڵە — لەو کاتەدا دوو پیشەی سەرەکی بوون لە یۆنان — چوونە سەر چاندنی زەیتون و سوود وەرگرتن لە ناخی زەوی)). وە لەبەر ئەوەی تەنها بە رۆن مرۆڤ ناتوانێ بژیت بۆیە دەبوایە بە گەنمی ئەسقوزی ئالۆیری پێبکرێت، خستنەرووی رۆنی ئەسقوزی و نمایشکردنی لە بازاڕی ئەسقوزی وایکرد لە گۆزە دابنرێت لە رێی دەریاوە باربکرێت و بگوازێتەوە، ئەوە بوو گۆزە و گڵکاری ئەتیکا دەرکەوت و بازرگانیە دەریاییەکەی چالاك و گەشەکردنی بەخۆوە دیت. وە لەبەر ئەوەی بازرگانی پێویستی بە پارە و پوول هەبوو بۆیە کانەکانی زیو سوودیان لێوەرگیرا. بەمجۆرە بنەما و بناغەی توند و تۆڵی ئابووری فەرهەنگ و کولتووری هیللینی دروست بوو کە دواتر لە رووی فیکری و هونەری و سیاسی دەرەوشایەوە. پێویست بەوە ناکات نموونەی زیاتر لە شارستانیەتە کۆن و نوێیەکان باس بکەین بۆ پالپشتی کردنی گریمانەکەی توێنبی کە زەحمەت و سەخت و دژواری یان بەرەنگاربوونەوە و پاڵنەر و هاندەرە بەرەوە بنیاتنان یان دەستکەوتی شارستانی. بەلاّم ئێمە لەلای نموونەی سێیەمی بەرەنگاربوونەوەکان دەوەستین ئەویش بەرەنگاربوونەوەی کۆچکردنە لە رێی دەریاوە.

**بەرەنگاربوونەوەی دووەم – کۆچکردن لە رێی دەریاوە:**

تایبەتمەندی کۆچکردن لە رێی دەریاوە بەندە لەسەر پێویستی هەڵگرتنی سیستمە کۆمەڵایەتیەکانی کۆچکەرەکان و کەلوپەل و دەزگاکانیان لەسەر پشتی کەشتی پێش جێهێشتنی کەنارەکانی وڵاتی کۆن، پاشان سەر لەنوێ داگرتن و هێنانەخوارەوەیان لە کۆتایی گەشتەکەدا. ئەم یاسایە هەموو جۆرەکانی ئامێر و کەل و دامودەزگا و سیستمەکان لە کەسەکان و کەلوپەل و شێواز و رێگە هونەریەکان و هزر و بیر و ئایدیۆلۆژیا دەگرێتەخۆ. وە ئەو شتەی کە بەرگەی گەشتی دەریا ناگرێت –هەمووشیان کەلوپەل و شتی ماددی نین– کە کۆچبەرەکان لەگەڵ خۆیاندا دەیانبەن دەبێ پارچەپارچە هەڵبوەشێنرێتەوە, رەنگە جارێکی دیکە وەکو شێوەی راستەقینە و ئەسڵی خۆیان دروست نەکرێنەوە. کاتێکیش لە بەرگەکانیان دەریان دەهێنن رەنگە ببینن گۆڕانیان بەسەرداهاتووە بەهۆی کاریگەریێ دەریا و بوونەتە شتێکی نامۆ و سەیر. ئەم بەرەنگاربوونەوە و ئاستەنگە، وێرای مۆرکە ماددیە، سەخت و دژوارەکەی، درزێك یان رەتکردنەوەیەك لە سیستم و هزر و بیر و دابونەریتەکان پەیدادەکات. بەڵام ئەم بەرەنگاربوونەوەیەیی کۆچکردن لە رێی دەریاوە گۆڕانێکی دیکەشی تێدانیە: ((ئەم گۆڕانە لە تێروانین –دوای گەشت لە رێی دەریا– بووە هۆی دەرکەوتنی بیرۆکەیەکی نوێ دەربارەی خوداوەند و مرۆڤەکان. لە جێگەی خوداوەندە خۆجییەکانی کە دەسەڵاتیان لە سنووری هەرێمی پەرستنیان تێپەڕناکات دەستەیەکی یەکگرتوو لە خوداوەندەکان کۆنترۆڵی جیهان دەکەن. لەگەڵ ئەم گۆڕانەدا ئەفسانەی نوێ و دابونەریتی نوێ دروست دەبن جیاواز لەوەی پێشتر بەر لە کۆچکردنیان هەیانبوو. سەرباری هەمەرەنگی و فراوانخوازی کە تووشی خەیاڵ و ئەندێشە و هەست و سۆز و هزر و بیرکردنەوەیان دێت. بەمجۆرە چەندین جۆر و هونەر و شێوە و ژانەی ئەدەبی و فەرهەنگی و

کولتووری دروست دەبن کە پێشتر بوونیـان نـەبووە (داسـتانەکان وەك نموونـە). هەروەها سیستمگەلێکی کۆمەلأیەتی و سیاسی و بـەهاداری و ئـەخلاقی دروسـت دەبن کـە پـشت بـە پێوەرگـەلێکی نـوێ دەبەسـتن دەکەونـە سـەرووی سـستمی دابونەریتـە و خزمایـەتی کـە پێـشتر سیـستمێکی بـاو بـوو. سیـستمێکی نـوێ دێتەئاراوە لە پەیوەندییە کۆمەلأیەتیەکان هەتا ئەگەر کۆچبەرەکان حەزیان کـرد بمێننــەوە و نیـشتەجێبن دوای گەیـشتنیان بـە پێـی رەگوریـشە و رەچـەڵەکی خێزانیـی و خێڵەکییەکـەیان. بـە کـورتی،(( شارسـتانیەتەکان لەدایکـدەبن لــەو ژینگانەی دەناسرێت و جیادەکرێنەوە بـە سـەختی و دژواری نائاسـایی کـە ژیـان تیایانـدا ئاسـان و خـۆش نییـە)). ئـەم بەدواداچـوون و سـۆراخکردنە مێژووییـە توێنبی دەبات بۆ نموونەیـەکی قـانوونی کۆمەلأیـەتی دەکـرێ لـەم هاوکێـشەیەدا گوزارشتی لێوەبکرێت: ((هەرچـەندە ئاسـتەنگ و بەرەنگاربوونـەوە گـەورە بێـت پاڵنەر و هاندەریش توندتر دەبێـت)). لەسـەر راسـتگۆیی ئـەم قانوونـە نموونـەی شارستانی زۆرە، کەچی تـوێنبی دواتـر دەڵێـت: ((ئەگـەر بێتـو پاڵنـەر و هانـدەر توندیەکەی زیاد بکەین بۆ هەتاهەتایە؟یان ئایا دەگەینە خاڵێك دوای ئـەو تونـدی زیـاتر دەبێتـە هـۆی کاریگەرییـەکی کـەمبوو؟ بـۆ وەلأمدانـەوەی ئـەو پرسـیارە تـوێنبی دەگاتـە ئـەو ئەنجامـەی کـە ئـەو توندییـەی دەبێتـە هـۆی هێنانەکایـەی وەلأمدانەوەیەکی سەرکەوتوانە، ئاست و سنوورێکی هەیە. ئەگەر توندییەکە ئـەم سنوورانەی تێپەڕ کرد، یـان بـووە ڕەهـای بێـسنوور، ئـەو کاتـە رێگـە نـادات بـە وەلأمدانەوەیەکی سەرکەوتووانە، لەم حاڵەتەدا توێنبی دەگاتە نیمچە قـانوونێکی دیکە و ناوەڕۆکەکەشی ((گەورەترین ئاسـتەنگ و بەرەنگاربوونـەوەکان لـە رووی پاڵنـان و هاندانـەوە دەکەوێتـە نێـوان زێـدە ڕۆیکـردن و زێـدەڕۆیی (الافـراط و التفـريط) لـە تونديـدا. ئەمــە ئـەو نێوەنـدە زێرینەیـە، بـە گـوێرەی تـوێنبی، گەڕاندنەوەی ناوەندی زێڕینی ئەرستۆییە کە خورەوشت و بەهای بەرز(الفضيلة)

دەکەوێتــە رادەی ناوەڕاســت: ئازایــەتی ناوەڕاســتە لــە نێــوان ترســنۆکی و سەرکێشی، بەخشندەیی و سەخاوەتیش ناوەڕاستە لە نێوان رەزیلی (رژدی) و زێــدەرۆیی (اســراف) ئــەوەش بەڵگەیــەکی زیــاترە لەســەر (مەرجەعیــەت)ی بەردەوامی توێنبی بۆ پەیڕەو و ڕێبازی فەلسەفەیی گشتگیر.

## دارمانی شارستانیەکان:

راســتە دارمــان و رووخــانی شارســتانیەت، هەنــدێکات، ئــەوەك بــەردەوام، هاوکــات دەبێــت لەگــەڵ دواکــەوتنێکی تەکنــەلۆژی و داکــشانێکی جــوگرافی و، داتەپینێکی ئابووری، بەڵام ئەوە هاوکات دەبێت لەگەڵ هۆکارە راستەقینەکە نەك خۆی هۆکار و فاکتەرە راستەقینەکە بێت.هۆکارە راستەقینەکە چییە لە دواوەی دارمان و رووخانی شارستانیەتەکان؟ توێنبی ، لە پوختەی خوێندنەوەی خــۆی بــۆ راســتیەکانی هەڵکشان و سەرکەوتنی شارســتانیەتەکان و رووخــان و دارمانیان پێیوایە، لەدەستدانی وزەی کاریگــەر و گــرنگ لــە شارســتانیەتێکدا و، وەســتانی داهێنــان و ئافرانــدن تیایــدا و، بــێ تواناییەکــەی لــە بــەردەوامبوون لــە چارەســەرکردنی کێــشە و گرفتــەکانی و وەڵامدانــەوەی ســەرکەوتوانە بــۆ ئــەو ئاستەنگ و کۆسپانەی دێنە بەردەمی، ئەوانە تێکڕای ئەو هۆکارە راستەقینانەیە کە دەبنە بنەما بۆ دارمانی شارستانیەتێك. ماوەی دارمان و رووخانەکەش کــورت و خێــرا دەبێــت (هــەروەك روویــدا لــە شارســتانیەتی یەکیــەتی سۆڤیــەتی) یــان ماوەیەکی دووورودرێژ دەبێت (هەروەك روویدا لە کۆتــایی شارســتانیەتی میــسری کــۆن، یــان کۆتــایی شارســتانیەتی عەباســیەکان یــان کۆتــایی ئیمپراتۆریــەتی عوسمانیــەکان). کەواتــە، تــوێنبی، هۆکــارە نامادددییــەکان بایــەخێکی تایبــەتیان پێــدەدات لــە رووخــانی شارســتانیەتدا، واتــە هۆکارەکــانی رۆحــی و فەرهــەنگی بــەدیاریکراوی: ((ئــەو ئاســتەنگ و بەرەنگاربوونــەوەی دووچــاری کۆمەڵگــەی

هاوچـەرخمان دەبێتـەوە ئاسـتەنگ و بەرەنگاربوونەوەیـەکی زیـاتر مەعنـەوی (رۆحی)یە لەوەی ماددی بێت. پاشـان دەڵێـت: ((زنجیرەیـەکی هەسـتپێکراو لـە وەڵامدانەوەکانی سەرکەوتوو بـۆ کۆسـپ و ئاسـتەنگەکانی یـەك لـەدوای یـەك، وا راڤە دەکرێت کە رووخسارێکن بۆ هەڵکشان و سەرکەوتن، بەمـەرجێك کـردەوە — هەر چەند زنجیرەکە بەدوایەکداهات— رووبکاتـە وەرگـەڕان لـە بـوار و گۆڕەپـانی ژینگەی دەرەکی —ماددی بێت یان مرۆیـی— بـۆ گۆڕەپـانی نـاوخۆیی کەسـایەتی گەشەکردوو مەبەستشمان شارستانیەتە)). ئەوەی یەکەمجار و دواجـار (تـوێنبی) پشتی پێدەبەستێ وزەی پاڵنـەر یـان داهێنـان و ئەفراندنـە کـە رێگـە دەدات بـە وەڵامدانـەوەی سـەرکەوتوو بـۆ ئاسـتەنگ و بەرەنگاربوونـەوەی مـاددی هـەبوو، دووەمیش رێگە دەدات بە گۆڕینی سەرکەوتن لە گۆڕەپانی ماددی بۆ گۆڕەپـانی مەعنەوی (رۆحی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی) ئەوەش شارستانیەتە لە رووەکـەی دیکەیدا. بەڵام ئایا نیشانە و بەڵگە هەن بۆ دارمانی شارستانیەتێك؟

وەڵام: توێنبی، پێیوایە دارمانی شارستانیەتێك لە پەرەسـەندنی دوو خولیـا و ئارەزوودا دەردەکەوێت، لەسـەرەتادا وەك دووهۆکـاری زینـدەیی و هێـز دێنەبـەر چاو، کەچی لە واقیعدا دوو ئامـاژەن بـە ئاراسـتەی رووخـان و دارمـان، ئـەم دوو خولیا و ئارەزووانەش بریتین لە:

١— فراوانبوونی جوگرافی.

٢— خولیا و ئارەزووی شەڕ و جەنگ.

تـوێنبی، لـەبارەی خـاڵی یەکـەم دەڵێـت: زۆرجـاران فراوانبـوونی جـوگرافی رۆچـوون و دارمـانی کۆمەڵگـەی لەگـەڵ دەبێـت ئـەوەش سـاز و گونجـاو دەبێـت لەگەڵ روودانـی سـەردەمی شـڵەژان و پـشێوی و یـان دروسـتبوونی (دەوڵـەتێکی جیهـانی) و هـەردووکیان بـە دوو قۆنـاغی هەڵوەشـاندنەوە و دارمـان لـە قەڵـەم دەدرێن)). (توێنبی) لە رێگـەی پـتر لـە بەڵگەیـەك هەوڵدەدات بیسەلمێنێت کـە

فراوانبـوونی جـوگرافی و دارمـان داتـەپینی شارسـتانی شـان بـە شـانی یـەکتری دەڕۆن.

هەرچـی خولیـا و ئـارەزووی دووەمیـشە، کـە خولیـای شـەڕ و جەنگـە لـەو بارەیـەوە دەڵێـت: ((خولیـای جـەنگ و کـاری شـەڕانگێزی مانـای لادانـی رۆحـی مرۆییە بۆ رێرەوەکانی کاولکاری و لەناوبردنی یەکتری، یاسا و بنەماکەش ئەوەیە مـەزنترین و سـەرکەوتوترین کـەس لـە رووی شـەڕ و کـاری سـەربازییەوە ببێتـە دامەزرێنەری دەوڵەتێکی عیلمانی)). زیـاتر دەڵێـت: ((بـەردەوام حـەز و خولیـای شـەڕکردن و کـاری سـەربازی دیـارترین و بـەربلاوترین هۆکارەکـانی دارمـانی شارسـتانیەتەکانە لـە مـاوەی چـوار یـان پێـنج هـەزار ساڵەی هەڵوەشـاندنەوەی بیست شارستانیەتی بە خۆیەوە بینیوە. حەز و خولیای جەنگ و شەڕ و ئاشـوب دەبێتـە هـۆی تێکـدانی شارسـتانیەت ئـەویش بـە هانـدانی وڵاتـانی خـۆجێی کـە پێکەوە گرێدراون رووبکەنە شەڕ و پێکدادان لەگەڵ یەکتری لە میانەی ململانـێ و کوشتارگەلێکی وێرانکارانە تیایاندا برا، براکـەی دەکوژێـت. لـە ئـەنجامی ئـەوەدا هەرچی لە شارستانیەتدا هەیە دەبێتە سـووتەمەنی بـۆ درنـدەی شـەڕ و جـەنگ، خود لەناو دەبات لەو کاتەیدا کە ئەویدیکە لەناو دەبـات و راوی دەکـات. کەواتـە توند و تیژی هەروەکو شەڕ و جـەنگ نابێتـە رێگـر لەبـەردەم دارمـان و رووخـانی شارسـتانیەت، رەنگـە ماوەیـەك دوای بخـات بـەڵام نایسڕێتەوە و لـەناوی نابـات بـەڵکو ئـەو، کـەوتن رووخانەکـەی کاریگـەرتر و ترسـناکتر دەکـات. کاتێـك ئـەو کەمینـەی، کـە پێـشتر داهێنـەر بـووە، چەقبەسـتوو دەبێـت و جێگـە و شـوێنێك داگیردەکات کە چیتر شیاوی ئەو نییە، پەنا دەباتە بەر توندوتیـژی. لـەو کاتـەدا لـە دەسـتە بـژێرێکی داهێنـەر کـە خـەڵکی دیکـەی لاسـایی دەکەنـەوە، دەبێتـە کەمینەیەکی بالادەستی ملهوڕی خۆسەپێن ((ئەرك و فرمانە رێبەرایەتیکردنەکەی پەکی دەکەوێت و دەگۆڕێت بۆ دیکتاتۆرێکی خۆسـەپێن، پرۆلیتاریـاش (زۆرینـە)

وەڵامی ئەو بەرەنگاربوونەوە و ئاستەنگە دەداتەوە لە ڕێی جیابوونەوە لێی، پاشان بنەما و بناغەگەلێك بۆ شارستانیەتێکی نوێ دادەنێت)). نموونەش بۆ شارستانیەتانەی رووخان و دارمان دوای لەدەستدانی وزە و توانا داهێنانیەکەی و، رووکردنە بواری دیکە وەك هەڵگیرساندنی شەڕ و ئاشووب و داگیرکاری سەربازی وەك لە شارستانیەتی ئاشوور و، سپارتە و، رۆما و تەتەرەکان وهی دیکە، بەخێرایی رووخان و لەناوچوون.

پوختە و رەخنە: دەکرێ ((بنەما و پرنسیپەکانی)) بیرکردنەوەی توێنبی لەبارەی فەلسەفەی شارستانیەتدا بەمشێوەیەی خوارەوە کورتبکرێتەوە:

١- هیچ نەتەوەیەك لە جیهاندا نیە مێژوویەکی سەربەخۆی هەبێت لە مێژووەکانی تەواوی جیهان. بۆیە کارێکی ئەستەمە لە مێژووی نەتەوەیەك لە نەتەوەکانی سەر زەوی بکۆڵینەوە دوور لە مێژووی نەتەوەکانی دیکە. بۆیە ئەو هۆکارانەی کاریگەرن لە مێژووی نەتەوەیەك، یان شارستانیەتێك، تەنها ئەو هۆکارانە نین کە دەکەونە چوارچێوەی سنووری نەتەوەییەکەی بەڵکو هەروەها ئەو هۆکارانەش دەگرێتەوە کە دەکەونە دەرەوەشی، ئەوە بنەما فەلسەفیەکەی پەیرە و تیۆری (توێنبی)یە.

٢- توێنبی وای دەبینێت کۆمەڵگا یان کۆمەڵ و دەستە و گرووپی واقیعی تیایدا مەیدان و گۆرەپان و کایەی راستەقینەی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە بۆ سەرکەوتن و هەڵکشانی شارستانیەتەکان و هەڵوەشانەوەیان، لە کاتێکدا نەتەوە و دەوڵەت دوو شێوەن لە چوارچێوەی کۆمەڵگە دروست دەبن و پێکدێت.

٣- توێنبی لەو باوەڕە دایە کۆمەڵگە لە میانەی سووڕی ژیانی خۆیدا رووبەرووی چەندین کێشە و گرفتی یەك لە دوای یەکدا دەبێتەوە دەبێ چارەسەربکرێت، واتە دەبێ هەر ئەندامێك یان هەر کۆمەڵ و دەستەیەك یان پێکهاتەیەك لەناو کۆمەڵگە ئەو بەشەی تایبەت بە خۆیەتی چارەسەر بکات.

٤- کۆمەڵگـەکان، نـەك نەتـەوەکان، بناغـەی لێکۆڵینـەوەی مێـژوویی روون و ئاشـکرایە. بۆیـە تـوێنبی کۆمەڵگـەکانی دابەشـکردووە بـۆ (٢١) کۆمەڵگـە یـان شارستانیەت تەنها (٥) یان لێماوەتەوە:

أ/ مەسیحی رۆژئاوایی.

ب/ مەسیحی رۆژهەلاتی (بیزەنتی).

ج/ هیندی.

د/ رۆژهەلاتی دوور.

ه/ ئیسلامی.

ئەگەر هەندێ کۆمەڵگەی گەورە و فراوان بووبنە چەندین شارسـتانیەت، ئـەوە مانای ئەوە ناگەیەنێ هەر کۆمەڵگەیـەك شارسـتانیەتێکە. بـە گـوێرەی (تـوێنبی) جیاوازیـەك هەیـە لـە کـارتێکردن لـە نێـوان کۆمەڵگـەی بـچووکی دابـراو و دوورە دەست و لە نێوان کۆمەڵگەی گەورە و فراوان بوونەتە شارستانیەت. ئـەو پـتر لـە (٦٠٠) کۆمەڵگـەی بـچووك دەژمێرێـت لـە رووی جوگرافیـەوە کۆکراونەتـەوە لـە شوێنگەلێکی تەسك لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی دانیشتوان، کاریگـەرییان سـنووردار بـوو، نەبوونـە شارسـتانیەتێك. لـە بەرامبـەردا هەنـدێ کۆمەڵگـە -شارسـتانیەت هەیە- بینیمان، توێنبی دەیانکات بە (٢١ کۆمەڵگەی شارستانی) ئەمرۆکە تـەنها (٥) شارستانیەتیان لێماوەتەوە.

٥- توێنبی بیرۆکەی شارستانیەتی تاکوتەنیا و رەها (شارسـتانیەتی رۆژئـاوا بـۆ نموونـە) کـە خـاوەنی بیرۆکەکـە دەڵێـت هـەر پەرەسـەندن و پێشکەوتنێك یـان رووخسارێکی شارستانی لە مێژوودا لەوەوە هاتۆتە بوون یاخود لە ژێر کاریگەری تـوخم و رەگـەزە و پێکهاتـەکانی و پرشـنگدانەوەکانی ئـەو شارسـتانیەتەیە، (توێنبی )ش بەو هەنگاوەی وەڵامی ئەو توندڕەویـە دەداتـەوە کـە ببـوە مـۆرکی

ڕاوبۆچوونی هەندێ لە زانایانی شارستانیەتی میسری کۆن کە دەڵێت لە میسرەوە وەرگیراوە. هەروەها لە هەر توندرەوییەکی دیکەی هاوشێوەدا.

٦- لە بەرامبەر ئەوەدا و، لەگەڵ پاراستنی گرنگی تیشکدانەوەی شارستانیەتێك و بڵاوبوونەوەی توێنبی بۆ ئەوە دەچێت کە لە هەر شارستانیەتێکدا توخم و ڕەگەزێکی داهێنەرانە هەیە ئەویش بەرهەم و زادی پەرەسەندن و پێشکەوتنی ئەو شارستانیەتەیە. و پرسیارگەلێك هەن سەبارەت بە پرس و گرفتگەلێکی تەنها لەو شارستانیەتەدا دەیدۆزینەوە کە پەیوەندی بەوەوە هەیە هەروەها ئەفراندن و داهێنانگەلێك تەنها لە دوو توێ و ڕێڕەوی پەرەسەندنی شارستانیەتێك و ئەو کێشە و گرفت و ئاستەنگانەی کە لە ئەنجامی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی ئەو شارستانیەتە هاتە بوون. توێنبی نموونەیەکی دیکە دەخاتەڕوو وەکو داهێنانی چاپکردن کە لە وڵاتانی چین و ئەورووپا بە شێوەیەکی جیا دەرکەوت و لە ئەنجامی ئەو پێویستی و ئاستەنگانەی لەهەر دوو شوێنەکەدا دەرکەوتن کە دەبوایە وەڵامبدرایەوە.

٧- ڕەگەز یاخود توخم (Race) بەتەنها شارستانیەت دروست ناکات هیچ شارستانیەتێك نییە لەسەر توخمی ڕەگەز (عرق) دانەمەزراوە، بەڵکو لەگەڵ هەندێ هۆکار و توخم و ڕەگەزی دیکە بە روونی باسیان لێوەکراوە. هەروەها، هیچ شارستانیەتێك نییە، بە شارستانیەتی ئەورووپی و ڕۆژئاوایی بە شێوەیەکی گشتی، زیاتر لە توخم و ڕەگەزێك بەشداری نەکرد بێت لە دامەزراندن و پەرەسەندنی.

٨- هاوشێوەی ڕەگەز، توخم، ژینگەی سروشتی و ماددیش هەرچەندە بارودۆخەکەی لەباروگونجاو بێت یاخود نا، ناتوانێت بە تەنها شارستانیەتێك دروست بکات، یان ڕێگەی لێبگرێت. ئەگەر ژینگە سرووشتیەکان بەشدارییان کرد بێت لە دروستبوونە هەردوو رووباری دیجلە و فورات و رووباری نیل و، حەوزی

رووبـاری زەرد، لـە دروسـتبوونی چـەندین رووخـساری شارسـتانی، ئـەوا هەنـدێ ژینگەی دیکەی هاوشێوە، توێنبی دەڵێت، لـە دۆڵـی ئـەردەن و، دۆڵـی دانـوپ و، دۆڵـی ریۆگرانـدی و هـی دیکـە، رووخـسارگەلێکی شارسـتانیەتی هاوشـێوەیان دروست نەکردووە و ئەو شوێنانە سەدان ساڵ چاوەڕوانیان کـرد تـاوەکو تـوخم و رەگەزەکانی شارستانیەتیان پێگەیشت.

٩- لە جیـاتی ئـەوە (تـوێنبی) تێـڕوانین و تیـۆری خـۆی لـە بەرەنگاربوونـەوە و وەلآمدانـــەوەدا پەرەپێـــدەدات بـــۆ راڤـــەکردنی چـــۆنیەتی دروســـتبوونی شارستانیەتەکان لە ڕێی داهێنان و ئەفراندن یـان وەلآمدانـەوەکانی سـەرکەوتوو، یان مردنیان و لەناوچوونیان کاتێك داهێنـان و ئەفرانـدن تیایانـدا سڕ دەبێـت و دەوەستێت و بێ توانا دەبێت لە نوێکردنەوە و وەلآمدانەوەی سـەرکەوتووانە بـۆ کێشە و ئاستەنگە نوێیەکان.

کۆتایی: فرمان و ئەرکی فەلسەفە دۆزینەوەی پرسیارەکان و جیاکردنـەوەیان و پۆلێنکردنیـــان وهەوڵـــدانی دارشـــتنەوەیانە بـــە شـــێوەیەکی روون و ئاشـــکرا یارمەتیدەرمان بێت بۆ زیاتر تیشکخستنە سەر بواری ئەم پرسیارانە و، یارمـەتی زانستە پیسپۆر و تایبەتمەندەکان دەدات بـۆ زیـاتر نزیکبوونـەوە لـەو خواسـت و مەبەستانەی هەوڵیان بۆ دەدات و لەلای خۆیانەوە هەوڵدەدەن بـۆ وەلآمدانـەوەی هەنـدێ لـەو پرسـیارانە پاشـان چـەندینجار دەیانخەنـە ژێـر شـیکردنەوە و رەخنـەلێگرتن لەبـەر رۆشـنایی ئـەو زانیـاری و پێـدراوە نوێییانـەی دەسـتیان دەکەوێت. فەلسەفەی شارسـتانیەت، کـەوابێ، هەوڵدانێکـە لـە میتـۆد و پـەیڕە و پرۆگرام پتر لەوەی زێدەکردنە بۆ سـەر راسـتیە ناسـراوەکانی شارسـتانیەتەکان. گەڕانە بـە دوای ڕێگـە و شـێوازێك هاوسـەنگ و گشتگیر و قـووڵتر لـە روانـین لـە شارستانیەتە جیاجیا یان یەك لە دوایەکی ئادەمیزاد بێ بانگەشـەکردنی زانیـاری و مەعریفـەی ڕاسـت و دروسـتی هۆکـارە بەرپرسـەکان لـە سـەرکەوتنی ئـەم

شارستانیەتانە پاشان لەناوچوون و هەڵوەشانەوەیان. هەوڵدانیش لە خۆیدا دەوڵەمەندکردنێکە بۆ فەلسەفە هەروەك چۆن لەو بابەتانەی باس لە شارستانیەتەکان دەکەن. هۆکارەکان یان ئەنجامەکان، هەر چۆنێك بن کە دەستمان دەکەون یان پێیاندەگەین توێژەر یان نووسەر لە بواری شارستانیەت و فەرهەنگ و کولتوور بە شێوەیەکی رێکوپێك هەوڵدەدات هەندێ وشە یان چەمك و زاراوە بەکارنەهێنێت کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ ئاماژە بۆ ئەوە بکات تاکە هۆکارێك لە توانایدا هەیە هۆیەکانی سەرکەوتنی شارستانیەتێك دروست بکات، یان شارستانیەتێك یان کولتوور و فەرهەنگێك گەورەتر و بەنرخترە لە شارستانیەت یان فەرهەنگێکی دیکە، لە راستیدا شارستانیەتێك یان فەرهەنگ و کولتوورێك تەنها بە خۆی و کات و رۆژگار و سەردەم وساتە مێژووییەکەی پێوانە دەکرێت، هەرچەندە یەکتربڕ دەبێت لەگەڵ فەرهەنگ و شارستانیەتی پشتخۆی و دوای خۆی. فەلسەفەی شارستانیەت و فەرهەنگ و کولتووری هاوچەرخ بە شێوەیەکی گشتی، شتێك لەوانە بەکارناهێنێت چونکە ئەم کارە حوکم و بریاردانی بەهادار (بەرزتر یان نزمتر)ی تێیدایە هەندێجاریش حوکم و بڕیاردانێکی خۆبەزلزانانە و بە کەم سەیرکردنی شارستانیەتەکانی دیکەی تێدایە، هەموو ئەوانەش هیچ پەیوەندییەکی بە زانست و توێژینەوەی زانستی نییە، بەڵکو حوکم و بڕیاردانێکی خۆپەرستانەیە، یان لە باشترین دۆخدا بڵێ حوکم و بڕیارگەلێکی وردبینیانە نییە. بابەتیانە نیی، هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەریان، لەمبارەیەوە (فلیکس گینگ) مامۆستای زانستی فەرهەنگ و شارستانیەتەکان لە زانکۆی ستامفۆرد لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، دەڵێت: ((هەندێ لە دابونەریتەکانی شارستانیەت بە دەمارگیری بۆ —من— ی رەگەزپەرستانەی ناوەندی، گەر بە شێوەیەکی کەمیش بێت، بە واتای ئەوەی گەلێك یان میللەتگەلێکی دیاریکراو لە ناوچەیەکدا بانگەشەی حەق و ماف و

باڵادەستی و هێز و شکۆمەندیان کرد. ئەم خولیا و حەز و ئارەزووە فەرهەنگ و کولتووری -من(الأنا)- بەرز و بەهادار دەکات. ئەمەش وا لە هەندێ کەس دەکات وا سەیری خۆیان بکەن کە بەرزتر و بەهادار و بەنرختزن لە خەڵکانی دیکە یان ئەوان گەل و میللەتێکی هەڵبژێرراون)). لە سەردەم و رۆژگارێکدا لەلای هەندێ کەس واباو بوو بە چاوێکی نزم بڕواننە خەڵکانی دیکە و وەکو درندە و گێرەشێوێن سەیریان بکەن بەهۆی جلوبەرگیان یان رووخسار و جەستە و لاشەیان یاخود دابونەریت و هەڵسوکەوتی تایبەت بە خۆیان، توێنبی و هی دیکەش، سەرکۆنەی ئەمجۆرە دید و چەمکە رەگەزپەرستانەیان کردووە، بەو پێیەی دید و تێڕوانینێکی زانستانە نییە و پەیوەندیشی بە راستیەکانەوە نییە. نزیك لە بۆچوون و سەرنجەکانی (توێنبی و کیسنگ، ڕاوبۆچوونەکانی ویل دیۆرانت و رۆجێە گارودی)ە. دیۆرانت دەڵێت: ((دەمارگیری...کە لە نووسین و تۆمارکردنمان بۆ مێژوو باو بوو کە باس لەوە دەکات مێژوو لە یۆنانەوە دەست پێدەکات و بەشان و باڵیدا هەردەدەین و کیشوەری ئاسیاش بە یەك دێر پێناسە وباس دەکەین، تەنها وەك هەڵەیەکی زانستی تەماشا ناکرێت بەڵکو لەوانەیە سەرنەکەوتن و شکستێکی گەورە و تاڵیش بێت لە وێناکردنی راستی و رووداوەکان و کەم و کورتیەکی ئابڕوبەرانەیە لە زیرەکی و تێگەیشتنماندا)). (الحضارة ، المجلد الاول).

**سەرچاوە:** الفلسفة و الحضارات،المركز التربوي للبحوث و الانماء، ل٦٧-٣٠ -٣١٩.

# بـامەرنێ و کەڤرێ میرحاجی

کاززان محمد حسێن بامەرنی
ماجستێر / زانکویا دهوك

هەبونا ناڤێ مـیر حـاجی ل بامـەڕنێ بـێ گومـان بێزانینـەکا دیروکیـا نـی ددەتە کەڤناتیا بامەرنێ، تانوکە گەڤرەکێ مەزن وبلند هەیە دنـاف سـنورێ روبەرێ ئەردێ بامەرنێ، گەڤر دکەڤیتە هنداڤی تاخێ کەلی دهێتە نیاسـین بگـەڤرێ مـیر حـاجی، بـێ کومـان ئەڤـەژی باشـترین بەلکـە وکروڤـە ددەتـە بەرپـەرێن کەڤناتیا بامەرنێ کو کەسەك هەبویە بناڤێ میر حاج، وژناڤێ میر دیارە دبیتن حاجی کەسانەکە کو خودان دەستهەلات بویە. جونکە ناسناڤێ میر ددیروکێ دا تنێ لسەر وی کەسیێە ئـەوێ دەسـتهەلاداریێ ل دەڤـەرەك یان مێرنشینەکێ دکـەت، هەروەسـان دمێـژوییێ دا تنـێ مێرنـشینێن کـوردی ناسـناڤێ مـیر بکارئینایـە کـو بەرپرسـێ هـەمی مێرنـشینێ دکـوتنێ مـیر، ودکەڤندابامەرنێ سەر مێرنشینا بەهدینان بو، وسەنتەرێ مێرنـشینا نـاڤبری ل کەلها ئامێدیێ بو، بەلێ نەژادێ میرحاجی نزانین کیی یە ئایا هـەر خـەلکێ بامــەرنێ خوبویــە، ودبــیتن ژی مــیر حــاج هــاولاتیی یــەك بویــە وچــو

دەستهەلاداری ژی نەکربیتن. کو دورنابیتن دەمێ ئەزوپسمامێ خو عەلی نوری مە سەرەدانا سەرێ گەڤری کر، وژ نێزیک مە بەرێ خودایێ ولهەمی رەخ ورویێن کەڤری ژی گەریایێن.

١ـ رێکەك دچیتە سەرێ کەڤری، رێکەگا فرهەیە پترە ژ دوو مترا تانوکەژی ئەو رێك دیاردکەتن یا راستە وبەحنە، و رەخێ راستێ یێ رێکێ شویرهەکا نزما خورستیە، بدیتنامە بومە وەسا دیاربو کو لسەرێ کەڤری جهێ ٣ تا ٤ ژورانە ، هەروەسان مە چەندین شینوار وپاشماوە دیتن، وەکی گەرێن ژورێن خانیا، وبەرمایکێن جوکێن سولینێن ئاڤێ، دبیتن میری ئاف ژ گانیێن گیزێن جوندیا ئینابیتە ئاڤاهیێ خو جونکە گانیێن ناڤبری دکەڤیتە هنداڤی ئاڤاهیێ میری ونێزیکترین کانییە ژ هەمی کانیێن دی بو ئاڤاهیێ خو ، وشویرهێن ئاڤاهیێ میری دیاردکەن ئەوژی سێ دیوارێن درێژ وبلند وژێك جودا نێزیك ئێکن دکەڤنە رەخێ روژئاڤایێ ئاڤاهیێ میری،بێ کومان ئەڤە بە رمایکێن شویرهەکا مەزنە ل ئاڤاهیێ یان قەسرا میرحاجی، ژ لایەکێ دیڤەوە سادیارە میرێ ناڤبری تنێ جەپە ر وشویرهە ئاڤاکرینە رەخێ روژهەلاتی، وەسا دیارە ئەو رەخ تنێ توشی هاتنا هێرشێن دوژمنان بویە دژی میر حاجی و لەشکە رێ وی ل بامەرنێ.

## میر حاج کی یە؟

نەژاد وبنەرەتیا میر حاج تانوکە نەهاتیە دیارکرن، کا ژکیش بنەمالا بامەرنیا بویە؟ وشیایە بهەمی هێزو شیانێن خو حوکمی ل سنورێ بامەرنێ بکەتن. یانژی میر حاج هەر ژ ناڤێ وی دیارە ئێکە ژ مێرێن بنەمالا مێرنشینا بهدینان بویە ل ئامێدیی حوکمی ل بامەرنێ بکەتن جونکە یا زانایە دەمێ هەبونا مێرنشینا بەهدینان ل ئامێدیێ بامەرنێ وەك پارجەك بویە دسنورێ مێرنشینا ناڤبری، یان ژی دبیتن میر حاج ژ نەژادو بنەرەتیا خوڤە کەسەك بویە ژ بنەمالەکا خەلکێ بامەرنێ بخوبویە وچێدبیتن کوبیتکا کەڤری ئەوا دبێژنێ میر حاج نە هاتیە بکارئینان وەك بنکەهێ دەستە لادارییێ، بەلکو جهێ سەیران وکەشت وکوزارییێ میری بویە دکەل خەلکێ بامەرنێ وچەند شەڤ وروژان مابوینە وێرێ، وپاشی ببورینا دەم وسالێن ئەو گەڤرهاتیە نیاسین ب گەڤری میر حاجی جونکە دبیتن ژهزرو بیروبوچونێن میرێ ناڤبری بویە ئەو گەڤرێ بلند هەلژارتبیتن وەك جهێ کێرانا سەیرانان جونکە جوکرافیا گڤری یێ بلندە وکونترولێ لهەمی سنورێ بامەرنێ؟ ئەڤە وچەند پسیار وبوچونێن دی دێ هێنە کرن کا کەسایەتیا میری کییە ولدوماهیێ ئەز نەشێم چ ئەنجاما دیاربکەم کا نەژادو بنەرەتیا میرحاج کی یە؟ جونکە چ بەلکە وکروڤە بدەست من

نەکەفتیە وچو ژێدەرێن دیروکی دیارنەکریە وتا ئاماژەکا کورت وڤەبر ژی نەدایە میرێ ناڤبر

١ـ سەرەدانەکا مەیدانی (کارزان محمدحسێن بامەرنی وبلند عبداللە و علی نوری و ئیسماعیل جمیل ئیسماعیل )بوگەڤرێ میر حاجی.

٢ـ ئیسماعیل جمیل ئیسماعیل ئەف بێزانینە ژ رەحمەتی بابێ خو وەرکرتینە ئەویژی بومن هەر ئەو بێزانین بومن کوتن، کەلەك سوپاس ژ بەرێز ئیسماعیل جمیل ئیسماعیل هاریکاریا وی دکەل من ژبو ئامادەکرنا ئەڤی بابەتی.